سرشناسه: ماکیاڤیلی، نیکۆلۆ، ۱٤٦۹ - ۱۵۲۷ م.
Machiavelli, Niccolo
عنوان و نام پدیدآور: شالیار / نیکۆلۆ ماکیاڤیلی: وەرگێڕان لە ئیتاڵییەوە: جەماڵ زەندی.
مشخصات نشر: سنندج: انتشارات مادیار، ۱٤۰۰.
مشخصات ظاهری: ۱۹۲ ص.
شابک: ۹۷۸-٦۲۲-٦۵۲۵-۲٤-٤
وضعیت فهرست‌نویسی: فیپا
یادداشت: کردی.
یادداشت: عنوان اصلی: Il Principe.
موضوع: علوم سیاسی - متون قدیمی تا ۱۸۰۰ م.
موضوع: Political science - Early works to 1800
موضوع: اخلاق و سیاست
موضوع: Political ethics
شناسه افزوده: زندی، جمال، ۱۳۵٤ -، مترجم
رده‌بندی کنگره: JC۱٤۳
رده‌بندی دیویی: ۳۲۰/۱
شماره کتابشناسی ملی: ۵۸۵۷۳۳۵

نیکۆلۆ ماکیاڤیلی

# شالیار

وەرگێڕان لە ئیتالییەوە:

جەمال زەندی

**ئەم وەرگێڕانە پێشکەشە بە دایکم، ڕابێ حوسەینی،**

**کە ٢٣ ساڵ دووریی من و کاکە جەلیل بڕستی لێ بڕیوە،**

**ئەو ژنەی بە بێدەنگی فێری کۆڵنەدان و سەرکەشیی کردم.**

*بێگانە بــە تەرجەمەی زوبانی*

*ئەسراری کتێبــی خەڵقی زانی*

حاجی قادری کۆیی

## پێڕست

بـۆ ئەم وەرگێڕانەم، ئەم دوو چاپەم لە کتێبی شـالیاری ماکیاڤێلـی بە بنەما گرتووە؛ یەکەم: *شـالیار*، *Il Principe*، چاپی ئیناودی، Einaudi، کە کوڕادو ڤیڤانتی، Corado Vivanti، ئامـادەی کردووە و پەراوێزی بۆ نووسـیوە و لە دووتوێی کۆی بەرهەمەکانی ماکیاڤێلی، بەرگی یەکەمدایە؛ دووهەم: *شـالیار*، *Il Principe*، لە ئامادەکردنی جۆرجۆ ئینگلێسی، Giogio Inglese، چاپی ئیناودی، Einaudi.

کـوڕادو ڤیڤانتی، چالاکی سیاسـیی چەپ، پرۆفیسـۆری مێژوو و توێـژەر، کە بۆ ماوەیەکی زۆریش لەگەڵ دەزگای چاپی ئیناودی کاری کردووە، بە پشوودرێژیی تایبەتی ئەڤیندارانی مێژوو و لێکۆڵەرانی وردبینەوە ساڵانێکی زۆری بۆ توێژنەوە و ئامادەکردنی سەرجەم بەرهەمەکانی ماکیاڤێلی تەرخان کردووە: ئەو پەراوێز و ڕوونکردنەوانەی ڤێڤانتی، هەر کام بۆخۆیان، جگە لەوە کاری ئێگجار بەپێز و بەنرخن، بۆ تێگەشتن لە نووسینەکانی ماکیاڤێلی هەر تەواو پێویستن، چونکە ماکیاڤێلی سەرجەم بەرهەمەکانی خۆی بە زمانی زێدی خۆی، یانی فیورێنتینی[1] نووسیوە و تەنانەت خوێنەری ئیتالی زوانیش بەبێ ڕێنوێنی و شرۆڤە ناتوانێ بە باشـی لێیان تێ بگا. جگە لەوەش، بە هۆی ئەوەی کە ئەو کتێبانە کە ماکیاڤێلی خوێندوونیەوە و وەک سـەرچاوە سوودی لێ وەرگرتوون، زۆربەیان بە زمانی

---

١. فیورێنتینی، زمان و خەڵکی فیرێنزێ، ناوی شاری فیرێنزێ، بە فلۆرەنس و فلورانس هاتۆتە نێو زمانی کوردی، من لەم وەرگێڕانەدا هەر بەو شێوازەی لە زمانی ئیتالیاییدا دێتە زمان، ئەم ناوانەم نووسیوە.

لاتین بووگن، نووسینەکانی زۆر دەربڕین، ڕستە و وشەی لاتینییان تێدایە و زۆر جاریش ئاماژەی بە سەرچاوەکان نەکردووە؛ کوڕادو ڤیڤانتی بە وردبینییەکی تایبەتی توێژەری کەماڵخوازەوە هەموو ئەوانەی ساخکردۆتەوە و لە هەرکوێ وشەی تەواو تۆسکانی بووبێ، کە ئەمڕۆ لە زمانی ئیتالیدا لە برەو کەوتووە، مانای کردۆتەوە و ڕستە ئاڵۆزەکانی شی کردۆتەوە. لە پاراگرافبەندیی ئەم وەرگێڕانەدا شێوازی کوڕادو ڤیڤانتی پەیڕەو کراوە.

من ناخوازم هەموو ئەوانە سەبارەت بە جۆرجۆی ئینگلێسی دووپاتە بکەمەوە، لێرەدا هەر ئەوەندە بەسە بێژم: ئینگلێسی زیاتر لە ٢٨ ساڵ لە بەرهەمەکانی سکێرتری فیورێنتینی، وەک ئیتالیگەل ئەیژن، واتە ماکیاڤێلی کۆڵیوەتەوە. جۆرجۆ ئینگلێسی پرۆفیسۆری ئەدەبیاتی سەدەکانی نێوەڕاست و ڕێنێسانسی ئیتالیایە.

من لە هەرکوێ بە پێویستم زانیبێ و لام وا بووبێ بۆ باشتر تێگەیشتنی خوێنەری کورد لە شالیار پێویستە، پەراوێزەکانی هەر دوو ئامادەکارم وەرگێڕاوە و بەم جۆرە دیاریم کردوون: ئەوانەی جۆرجۆ بە ئـ.ئی.ئی؛ ئەوانەی کوڕادو بە: ئـ.ئێ.ڤ. ئەو پەراوێزانەیش کە هیچ نیشانەیەکیان بۆ دانەنراوە وەرگێڕ خۆی دایناون؛ هەروەتر ئەو پەیڤانەی خراونەتە نێو کەوانی چوارگۆشەوە، وەرگێڕ بۆ ڕوونکردنەوەی مەبەست زیادی کردوون.

لە پەیڤی وەرگێڕ و بەستێنی مێژوویی ژیانی سیاسیی نیکۆلۆ ماکیاڤێلی و نووسینی شالیاردا، هەندێ ناو و شوێن لە پەراوێزدا بە پیتی لاتین نەنووسراونەتەوە، ئەویش بۆ ئەوەی کە هەموویان لە دووتوێی نامیلکەکەدا هەن و دووپات کردنەوەی دەبوو بە شتێکی زیادی.

جەماڵ زەندی

# پەیڤی وەرگێڕ

وەرگێڕانی *شـالیاری* ماکیاڤێلی، پاش پێنج سـەدە لە مەرگی نووسەرەکەی، بێجگە لە ئێسـتایی بوونی بیر و هزری ئەم نووسـەرە، نابێ هیچ مەبەستێ دیکەی بووبێ؛ بیر و هزرێک کە تاهەتایە زانستی سیاسی و دەوڵەتداریی تووشی گۆڕانی بنەڕەتی کرد. دیارە وەکوو ئانتۆنیو گرامشـی دەبێژێ، ماکیاڤێلی زانسـتی سیاسـی فێری ئەوانە ئەکا کە ئەم زانستە نازانن. گرامشی لە بەرسـڤی ئەم پرسە کە: باشە ئەوانە کێن کە ئەم زانستە نازانن؟ دەبێژێ: توێژی شۆڕشگێڕی سەردەم، گەل، نەتەوەی ئیتالیا.[1] ئەو توێژەی کە لە فیرێنزێی سـەردەمی ماکیاڤێلیدا پشتی سـەرۆکی خۆی، واتە سـاڤونارۆلا بەر دەدا، ئەو توێژەی کۆمارەکەی دەڕووخێنرێ، کەچی نە دەتوانێ سەرۆکی لە خنکان و سووتاندا ڕزگار بکا، نە دەتوانێ بەرگری لە کۆمارەکەی بکا و بیپارێزێ.

کەوایە، خاڵێ گرینگ کە من لە سـەردەمی ماکیاڤێلی هەر زۆر نزیک دەکاتەوە، دەردی کۆیلەتیـی گـەل و نەتەوەیەکە کە مـن -بێ ئەوەی بۆخۆم ویسـتبێتم وەکوو ئەندامێـک لەم نەتەوەیـە هەژمار دەکرێم و لەگـەڵ ئازار و ڕەنجەکانی ئـەووەوە ڕەنج دەکێشم و ئازار و ناسۆرەکانی لەم تەنیاییەی تاراڤگەدا بۆ یەک چرکەش بێ بیر و خەیاڵم چۆڵ ناکەن؛ دەردی گەلێک کە بە ئاسانی پشتی سەرکردەکانی چۆڵ دەکا، گەلێک کە گرتن و کوشتنی ڕێبەرانی و هەزاران ڕۆڵەی تێکۆشەری، لە لایەن دەوڵەتانی داگیرکەری نیشتمانەکەیەوە هیچکات نەبووە بە هەوێنی بەرئەنگارییەکی یەکگرتووانە و تێکوشان و نەسرەوتن تا ڕزگاریی یەکجاری.

---

١. بڕوانە ئانتۆنیۆ گرامشی، دەفتەرەکانی زیندان، بەرگی سێهەم ل. ١٦٠٠، ئامادەکار ڤالێنتینۆ جێڕاتانا، چاپەمەنیی ئیناودی، تورینۆ ١٩٧٥، (بە زمانی ئیتالیایی).

من باســی مێژوویەکی زۆر دوور ناکەم، مەبەستیشــم میری ڕەواندز و قازی مەهاباد و... نییە، نەخێر. من باس دەمیرتاش و هەڤالانی دەکەم، کاتێک لە مەیدانی شاری ئامەد، پایتەختی باکووری کوردســتان دەهاتە ئاخافتن و باسی دەرد و ناسۆرەکانی ژێردەستە و کۆیلەکانــی دەوڵەتی تورکیان دەکرد، بە ملیۆنــان خەڵک چەپڵەیان بۆ لێ ئەدا، کەچی ئــەو پتر لە ســاڵێکە لە کونە ڕەشــەکانی دەوڵەتی تورکدا کۆت و بەنــد کراوە، گەلیش دەستەوەســتانە! دەردی گەلێک کە دوودڵی و دڕدۆنگی ســەبارەت بە خاوەنداریێتی لە نیشتمانێکی ئازاد و ســەربەخۆ، هەردەم باوەڕی بە چەمکی سەربەخۆیی لەق و لەرزان کردووە. لە ڕاستیدا، ئێستا کە من ئەم پەیڤانە دەنووسم، باسی گشتپرسی بۆ سەربەخۆیی باشووری کوردستان لە ئارادایە، سوورڕمانی سەر لەوەدایە کە ڕۆژانە لە سەر تۆڕ و لاپەڕە ئینتێرنێتییەکاندا کۆمێنت و نووسراوەی دەیان کــورد دەبینی کە کەم تا زۆر، ناوئاخنیان ئەمەیــە: «کورد و دەوڵەتیــان نەوتووە». -دیارە ئەمەش وەکوو زۆر باوەڕی نادروســت لە لایەن دوژمنانەوە لە بیر و زەینیانــدا چێنراوە و بەداخەوە، تا ڕادەیەکی زۆریش بنجی قایم کــردووە. بەڵێ ڕێک ئەم دەردەیە کە من دەباتەوە ئیتالیای ســەردەمی ماکیاڤێلی؛ داگیرکراویی نیشــتمان و لەتوپەت بوونی گەل و نەبوونــی ئیرادەیەکی یەکگرتووانە بۆ چوون بە گــژ دوژمندا و ڕزگاریی یەکجاری و هەڵزنان بە هــەورازی ئاوەدانکردنەوە و خەملاندنی نیشتمانی ئازاد و پێگەیاندنی مرۆڤێک لە هەمبەر نەهات و نەهامەتییەکانی بەرگری لە سەروەریی نیشتمان و کۆمار و ئازادیی خۆی بکا.

بە دڵنیاییەوە بزوێنەری ســەرەکیی ئــەز بۆ وەرگێڕانی *شــالیاری* نیکۆلۆ، بێجگە لە هاندان بە خەملاندن و خاراندنی بیری ڕزگاری، هیچی تر نەبووە و نییە؛ چونکە ئەمنیش وەکوو ماوریزۆ ڤێرۆلی، لەو بڕوایەدام کە: «کاکڵە و مەبەســتی دەقی *شالیار* سەبارەت بە دامەزرێنەرانی دەوڵەتان و ڕزگاریبەخشانی سیاسییە».[1]

جەماڵ زەندی

---

١. ماوریزیۆ ڤیرۆلی، بزەکەی نیکولۆ، سەربرد ماکیاڤێلی، چاپەمەنی لاتێرزا، ٢٠١٣، ل. xv، (بە ئیتالیایی).

## بەستێنی مێژوویی ژیانی سیاسیی نیکۆلۆ ماکیاڤێلی و نووسینی شالیار

نیکۆلۆ ماکیاڤێلـی لە ٣ی مانگی مەی ١٤٦٩ لـە بنەماڵەیەکی کەڤناری فیرێنزێ لە دایک بووە. مێسێر بێرناردۆ، باوکی نیکۆلۆ، دوکتۆرای یاسای هەبووە، بەڵام بە پێچەوانەی زۆربـەی پارێزەر و دادوەران داهاتێکی کەمی لە کارەکە دەسـت کەوتووە. ماکیاڤێلیی باوک، ئەڤینێکی ڕاسـتەقینەی بۆ کتێب و خوێندنەوە هەبووە؛ ئـەم بە لەخۆبردوویی و مایەدانـان لە خۆی کتێبخانەیەکی بچووکی پێکەوە نابوو کە کتێبی فیلۆسـۆفانی یۆنان و ڕۆما، بە تایبەتی ئەرەسـتوو و چیچڕۆنێ (سـیسرۆنی) و پەڕاوی مامۆسـتا مەزنەکانی پاراوێژی و ڕەوانـنووسـی و مێژووی ئیتالیای لە خۆ دەگرت. مێسێر بێرناردۆ، هەندێک جار کتێبەکانی بە قەرز وەرگرتووە و وردە وردە بە کاری خۆی پارەکەیانی داوە. بۆ ئەوەی کە بتوانێ ئەو کتێبە دەست بخات کە زۆری بە لایەوە گران و ئازیز بوو، واتە مێژووی ڕۆما لە نووسینی تیتو لیڤیۆ، قەبووڵی دەکا پێرستێ لە ناوی ئەو شوێنانەی لە کتێبەکەدا ئاماژەیان پێ کراوە، بۆ دەزگای چاپێکی فلۆڕانسی ئامادە بکا: کارێکی تاقەت پڕووکێن کە دەبێ نۆ مانگی ڕەبەق کاتی خۆی بۆ تەرخان بکا؛ وەک پاداشی ئەم کارە تاقە یەک کتێب لەم کتێبە وەرگرێ. لە بەرەکەتی کاری بەتاقەتی باوکییەوە، نیکۆلۆ ماکیاڤێلی بە وردی کتێبی مێژووی نووسـەری ڕۆمی دەخوێنێتەوە، کە باسی ئەوە دەکا چۆن کاروباری سیاسی و سەربازیی ڕۆمییان بووە بە هۆی ئەوەی کە شارێکی بچووک وەک ڕۆما ببێتە کۆمارێکی ئازاد و بەهێز. لە ساڵانی پێگەیشتوویيدا، نیکۆلۆ کەڵک لەم کتێبە وەردەگرێ بۆ ئەوەی گرینگترین کتێبی خۆی، یا وەک سـکێننەر دەبێژێ: *ڕەسـەنترین کتێبی فەلسـەفەی*

*سیاسـی*،[١] واتە *دیسکۆرسەکان لەسەر دە کتێبی یەکەمی تیتو لیڤیۆ*[٢] بنووسێ، و ئەمەش کۆی بیر و هزری سیاسیی ئەو لە خۆ دەگرێ، بە تایبەت ڕامان و بیرکردنەوەی ماکیاڤێلی لە سەر ئەوەی کە چۆن کۆمارێکی مەزن و ئازاد دادەمەزرێ و بەڕێوە دەبرێ. ماکیاڤێلیی باوک ئیمکانـی ئەوەی نەبووە منالەکانی بنێرێتە لای مامۆسـتایانی مەزنی سـەردەمی خۆی، واتە مامۆستایانی سەردەمی ئومانیزم و ڕێنسانس [یان وەک ئیتالیاییەکان دەڵێن، ڕیناشـیمنتو]، بەڵام بۆخۆی زۆر بە باشـی نیکۆلۆ و تۆتۆی برای فێری لاتین، ڕێزمان و بیرکاری دەکا.

نیکۆلۆ هەر لە تەمەنی لاوێتیدا خوو دەگرێ بە خوێندنەوە و بەردەوام دەبێ لە گەشەدان بە سەرمایەی زانستی و ڕامیاریی خۆی؛ پێش لە هەمووان دەپەرژێتە سەر خوێندنەوەی شاعیرانی لاتین و لە سەرووی هەموانیشەوە، ڤیرجیلۆ[٣] و دواتر ئەوانەی کە خۆی وەک *نزمترەکان* ناویان دەهێنێ؛ واتە ئەوانەی هەڵبەسـتڤانی غەزەڵ و قەسـیدەی ئەڤیندارانە بووگن، لەوانە تیبولۆ و ئوڤیدیۆ[٤]. بێجگە لە لاتین، ماکیاڤێلی لە ڕووی دەقی مامۆستایانی ڕۆمی هونەری پاراوویژی و ڕەواننووسی دەخوێنێتەوە. دیارە لە فیرێنزێی ڕۆژگاری ئەودا نەدەکرا وا نەبێ؛ لە ژیانی سیاسی و ئایینیی فیورێنتینی سەردەمی ماکیاڤێلیدا، هێزی وشە و پەیڤ باڵادەست بوو. ڕێبەرانی سیاسی و ئایینی، بە پێشکەشکردنی وتاری جەماوەری خەڵکیان پەروەردە دەکرد؛ سیاسـییەکان باسی خۆشەویستیی کۆمار و ڕێبەرانی ئایینی باسی دینداری و خۆشەویستیی عیسایان بۆ خەڵک دەکرد. بەپێی نووسراوەی ماوریزیۆ ڤیرۆڵی، نووسەر و پرۆفیسۆری ڕاگەیاندنی سیاسی:

> ڕێبەرانـی ئایینی و سیاسـی دەیانزانی لـە ڕێگەی پەیڤەوە دەکرێ خۆشەویسـتی و ئەڤیـن بە ئازادی و دادپەروەری فێری جەماوەر بکـرێ؛ باوەڕ و ئیمانی خەڵک پتەو

---

١. کوێنتین سکینەر، Quentin Skinner، ماکیاڤێلی.

٢. دیسکۆرسەکان لەسەر دە کتێبی یەکەمی تیتو لیڤیۆ، بە ئیتالیایی: Discorsi sopra la prima deca di Tito Livio.

٣. بڕوانە پەراوێزی بەشی ١٧.

٤. تیبولۆ، Tibullo، ئوڤیدیۆ، Ovidio، دوو شاعیری لاتین.

بکرێ و هەست بە وەزیفە لەواندا پاراو بکرێ؛ بە تایبەتی لە نێو دڵی مرۆڤەکاندا شەقڵی خۆشەویستی بۆ هەڤیازی و ڕەوشتبەرزی و نەفرەت لە تەمبەڵی و گەندەڵی لێ بدرێ. لەو باسانەی دەبوونە بابەتی ڕاڤە و شرۆڤەکردن، لەو وتارانەی ئاوڕیان لێ دەدرایەوە، ئەو کەسانەی وەکوو سەرچاوە ناویان دەبرا، پاراوێژیی مەدەنی و مەزهەبی زۆر جار شانیان لە شانی یەکتر دەدا و تێکڕا کاریگەرییان کردبوو کە لە شاری فیرێنزێدا ڕوانبێژی بوو بە گوڵی سەر تۆپی هەموو هونەرێ.[1]

نیکۆلۆ فیلۆسۆفانی کەڤنار دەخوێنێتەوە، بەتایبەتیتر مێژوونووسان، لەوانە: توسیدیدێس[2] کە باسی شەڕەکانی سپارت و ئاتێن دەگێڕێتەوە، ئەو شەڕانەی ببوونە ناسۆر بە سەر جەستەی یۆنانەوە؛ پلوتارک[3] کە ژیانی سیاسەتڤانانی مەزن دەگێڕێتەوە و باسی سەرداران و یاسادانەرە مەزنەکانی یۆنان و ڕۆما دەکا؛ تاچیتۆ[4] کە باسی گەندەڵی و لاساری و پەیمانشکێنییەکانی تیبریۆ و کالیگۆلا و نێرۆنێ[5] دەکا؛ بەتایبەتیتر تیتو لیڤیۆ دەخوێنێتەوە، کە بە وردی مێژووی ڕۆمیانی نووسیوەتەوە. هەر لەم خوێندنەوانەدایە خۆشەویستیی نیکۆلۆ بۆ کەڤناران و ئەڤینی ئەو بۆ خوێندنەوەی مێژوو دەخەملێ و گەشە دەکا و وەک ڤیرۆڵی دەبێژێ:

> لە نێو قارەمانانی یۆنانی کەڤنار و ڕۆمای کۆندا نموونەی هێژایی و هەڤیازی، زانایی و ژیهاتوویی بەدی دەکا کە ئاوێنەی باڵانوێنی گەورەیی کەم وێنەی ئەوان بوون. ئەو بە خوێندنەوەی ئەو شتانەی لە ڕابردوودا ڕوویان دابوو لەوانەی لە ئێستادا ڕوویان دەدا تێدەگەیشت، چونکە ئەیوت: *لە هەموو شاراندا و لە لای هەموو گەلان هەمان هەست و*

---

١. ماوریزیۆ ڤیرۆلی، بزەکەی نیکۆلۆ، سەربردی ماکیاڤێلی، چاپەمەنی لاتێرزا، ٢٠١٣، ل. ١٠-١١، بە ئیتالیایی.

2. Tucidides

3. Plutarco

4. Tacito

٥. تیبریۆ و کالیگۆلا و نێرۆنێ، ناوی سێ لە ئیمپراتۆرەکانی ڕۆما.

*سۆز و هەمان تامەزرۆیی و ئارەزوو بوونیان هەیە.*[١]

لە نــاو مۆدێرنەکاندا، ســەرباری هەمــووان، دانتێ و پێــترارکا و بۆکاچۆ[٢]ی خۆش ویستووە و بە وردی خوێندوونیەوە، بە جۆرێک کە لە نووسراوەکانیدا ئەزبەر بەیتەکانی دانتێ دەگوازێتەوە، هەر لەم بوارەوە ڤێرۆڵی دەنووســێ:*لە شــێوازی نووسین و ژیریدا دانتێ مامۆستای بووە: کاتێک شیعری دەنووسی هەوڵی دەدا لاسایی ئەم بکاتەوە.*[٣]

فیرێنزێ لە کۆتایی سەدەی چواردەی زاییندا هەم شکۆدار بووە هەم هەژار. جوانیی کلیساکان و بینا گشتی و تایبەتیەکانی، شەقام و مەیدانەکانی؛ بلیمەتی و پیشەیی بوونی هاووڵاتییانی، ســەرزیندوویی ژیار و ژیانی هونەری و ڕۆشنبیری، ئەم شارەیان کردبوو بە شــارێکی تاقانەی ســەردەمی خۆی و تەنیا ڤێنێزیا دەیتوانی شان لە شانی بدا. شێرکۆ بێکەس، کە نزیک بە پێنج سەدە دواتر، واتە لە ١٩٨٦دا سەردانی فیرێنزێی کردووە، ئاوا باسی ئەکا:

> فلۆرەنســا، شــارێکە لە گوڵ و پەیکەر، لــە هونەر و لە نەختینەی مــێژووی دوور و نزیک، لە مۆســیقا و گۆرانی و جوانیی[...]، فلۆرەنســا خۆی بۆخۆی مۆزەخانەیەکی گەورەیە: شــەقام و دیوار و تارمە و باخــچە و گۆڕەپان و کۆڵان و هەر هەمووی بە یەکجار توحفەیە و گەنجینەیەکی لە بن نەهاتووی دنیای هونەرە. [...]. ئــەگەر شیعر پاتەختێکی هەبووایە هەر ئــێرەی هەڵئــەبژارد. هەر ئــێرەی ئـــەکرد بە کەژاوەی خەیاڵەکانی و هەر ئــێرەشی ئــەکرد بە جــێی ئــیلهام و وەحی خۆی.[٤]

دیارە ئەو جوانی و دڵڕفێنییەی بێکەس باسی دەکا، بەشێ هەرە زۆری هی سەردەمی

---

١. ڤێرۆلی، س.پ.ل.١١.

٢. دانتێ، Dante Alighieri، شاعیر و نووسەری سەدەی دوازەی زاییــنی ئیتالیا؛ پێترارکا، Freancesco Petrarca، شاعیر و هۆزانڤانی هاوچەرخ و پاش دانتێ، و بۆکاچو، Giovani Boccaccio، چیرۆکنووســی ســەدەی سێزدەی زاییــنی ئیتالیا، یەکەم نووسەرە کە بە زمانی ئاپۆرە نۆڤێل و چیرۆکی نووسیوە؛ وەک داهێنەری ڕۆمان ناسراوە.

٣. ڤیرۆلی، س.پ.ل.١١.

٤. نووسین بە ئاوی خۆڵەمێش، ژیاننامە و بیرەوەری، ناوەندی غەزەڵنووس ٢٠١٣، سلێمانی، بەرگی دووهەم، ل.٣٣-٣٤.

سەرلەنوێ زاینەوەیە. بەڵام سەرەڕای هەموو ئەمانە، وەک ڤیرۆڵی، دەبێژێ:

ئەو جوانی و شەنگییە، بە هۆی لاوازیی دامەزراوە سیاسییەکانییەوە، تەنیا بۆ کورتماوە دەیتوانی ئاشتی و ئارامیی شار دەستەبەر بکا و دادپەروەری و ئاسایش پێشکەش بە هاوولاتییانی بکا. لە ژێر ئاسمانی ساماڵ و بێگەردیدا، لە هەوای پاک و بێخەوش و سازگاریدا، هەست و تامەزرۆیی مرۆڤەکان دەخاران و توکمەی تایبەتیان پەیدا دەکرد و، گەلێ جار مەیدان و شەقامەکانی شار دەبوونە شانۆی تێکهەڵچوونی دڕندانە و بێبەزەییانەی نێوان لایەنە جیاوازەکان کە تامەزرۆی فەرمانڕاوییکردن بە سەر شاردا بوون. شەقامەکانی فیرێنزێ بە بۆنەی ئەو ململانێ و زۆرانبازییانەوە لە خوێندا سوور دەبوون، کە پێیان ئەوترا ئەو خوێنەکە. لە کاتێکدا لە نێو کۆشکەکاندا دەوڵەمەندی و زەرق و بەرقی بنەماڵە مەزنەکان خۆنوێنییان دەکرد، هاوکات لە خۆبایی بوون و گەندەڵیی داب و دەستوور و ڕەوشتیان نمایش ئەکرد. سەروەری و سەربەستیی فیرێنزێ هەردەم لە مەترسیدا بوو و، فیرێنزێ بۆ بەرگری لە خۆی و، پاراستنی دەسەڵاتی بە سەر شارانی تری تۆسکانا، دەبوو پەنا بەرێتە بەر سپای بەکرێگیراو؛ ئەمانەش بۆ پارە شەڕیان ئەکرد و گەر دەرفەتیان بۆ ڕەخسابایە پارەی زیاتر دەربێنن، بەبێ هیچ دڕدۆنگییەک بەرەیان دەگۆڕی و دەڕۆیشتنە بەرەی دوژمنەوە.[١]

بۆ تێگەیشتن لە بارودۆخی سیاسیی فیرێنزێی کۆتایی سەدەی چواردە، ڕەنگە باشووری کوردستان لە ئەمڕۆدا، واتە سەرەتای سەدەی بیست و یەک، نموونەیەکی خراپ نەبێ. ئەگەر ئەمڕۆ، لا لایەکەوە گەندەڵیی سیاسی و ئابووری سەر تا پای ئەو حکوومەتە نیمچە سەربەخۆیەی گرتۆتەوە و، میر و مەزنان و حیزب و لایەنەکان، بێ گوێدانە ویست و نیازەکانی گەل، سیاسەتێ پەیڕەو دەکەن کە بێجگە لە خۆیان و دەستە و تاقمەکانیان کەس دیانی خێریان پێدا نانێ؛ ئەگەر ئەمڕۆ و هەر لەمێژە، باشووری

---

١. ڤیرۆلی، س. پ. ل ١٣.

کوردســتان، بەردەوام قوربانیی نێوان دوو زلهێزی هاوســێ، واتە تورک و عەجەم بووە و، هــەرکام بەپێی بەرژەوەندیی ڕۆژی خۆیان پشــتیوانی دەکــەن و، هەرەکات کاریان پێی نەبێ پشــتی تێ دەکەن و، بە چارەنووس و هات و نەهاتی دەســپێرن؛ یان هەرکات بیانەوێ دەست لە کاروباری نێوخۆی وەردەدەن و هاوسەنگیی تێک دەدەن و، لە هەمان کاتــدا هەر دووکیان زۆر بە وریاییەوە چاودێریی دەکەن بۆ ئەوەی نەبێتە خاوەن ســپا و هێزێکی وەها کە بتوانێ لە هەمبەریان بوەســتێتەوە، یان ئەوەی بەرەو سەربەخۆیی بڕوا، ئەوە ڕێک بارودۆخی فیرێنزێی سەدەی چواردەیە، کە لە نێوان خونکاری فەڕانسە و پاپا و لایەنگرانیدا، وەکوو خونکاری ئیسپانیا و وردە دەسەڵاتەکانی ئیتالیادا گیری خواردبوو. پادشای فەڕانسە، بۆ ئەوەی پێش بە فرەخوازی و پەرەسەندنی دەسەڵاتی پادشای ئیسپانیا لە ئیتالیا بگرێ، پشتیوانیی فیورێنتینییەکانی دەکرد، بەڵام کاتێک بە قازانجی نەبووایە یان نەیتوانیبایە یارمەتییان بدا، بەرەڵای ئەکردن و بە چارەنووسی دەسپاردن.

فیورێنتینیی ماکیاڤێلی دەوڵەمەند بوو. بە هۆی دەوڵەمەندی و لێهاتوویی لە چالاکی دیپلۆماســیدا، توانیبووی دەسەڵاتی خۆی بە سەر شــارە گرینگەکانی تۆسکانا، وەکوو پیســا، لیڤۆڕنۆ، ئارێزۆ، پیســتۆیا-دا بسەپێنێ. ئەوان سەبارەت بەو شــار و دەڤەرانە کە لە ژێــر فەرمانڕاوییاندا بوون، بەر لە هەموو شــتێ چاویان بڕیبووە دەســکەوت و قازانجی خۆیان، کە لە هەڵسەنگاندن لەگەڵ دەوڵەتانی تری سەرزەویی ئیتالیا، هەم سەرانە و باجی زۆریان لەســەر دادەنان، هەم ئەمە هێمایەک بوو بۆ مەزنیی دەســەڵاتیان. بەڵام ڕاگرتنی ئەم شارانە لە ژێر دەسەڵاتی خۆیاندا کەم دەردیسەر و کەم خەرج نەبوو. ژێردەستەکانی فیرێنزێ، بەردەوام دژی ئەوانەی تەوقی ژێر دەســتەیان ئاڵاندبووە گەردنیان ڕادەپەڕین. دەســەڵاتدارنی فیورێنتینیش بۆ دامرکاندنــەوەی ئەو ڕاپەڕینانە دەبوو ســپای بێگانە بە کرێ بگرن، بۆ ئــەم کارەش پارەی زۆریان خەرج دەکرد. بنەماڵە مەزنەکانی فیرێنزێ لە ئاستێکی بەریندا لەم شەڕانەدا دەور و نەخشیان دەگێڕا. ئەمانە چ بە چاک و چ بە خراپ کاریگەریی مەزنیان لە سەر سیاســەتی فیرێنزێ هەبوو. لە ناو ئەمانەدا، پتر لە هەمووان،

بنەماڵەی مێدیچی، شـەقڵێکی زەقیان لە سەر ژیار و مێژووی فیرێنزێ بە جێ هێشتووە. کاریگەری و نفووزی ئەم بنەماڵەیە، بە هۆی پارەوە، لە سـەر دانیشتووانی شار بەردەوام لە پەرەسـەندندا بوو؛ لە ئاکامدا لە سـاڵی ١٤٣٤-ی زایینی بە سـەرکردایەتیی کۆسیمۆ مێدیچی، بە تەواوی دەستیان بە سەر هەرێمەکە و دەوڵەتدا گرتووە و دەسەڵاتی خۆیان دامەزراندووە. پاش سـەقامگیریی دەسـەڵاتی مێدیچییەکان، ناکۆکی و ئاڵۆزیی نێوان بنەماڵەی دەسەڵاتدار و دژبەرەکانیان لە فیرێنزێ، بە تایبەت بنەماڵەی پازیی، دەست پێ دەکا. لە ئاپریلی ساڵی ١٤٧٨، لە کاتێکدا دوو لە کەسە دیارە مێدیچییەکان، واتە جوولیانو و لۆرێنزۆ، لە کلیسا خەریکی بەڕێوەبردنی ڕێوڕەسمی ئایینی دەبن، نەیارەکانیان بە چەقۆ پەلاماریان دەدەن. ئەم ڕووداوە بە کودتای پازیی ناسراوە. جوولیانو دەکوژرێ و لۆرێنزۆ دەرباز ئەبێ. پاشان کودتاچییان، هەوڵ دەدەن بە ناوی بەرگری لە ئازادی و بە گژداچوونی ملهوڕیی مێدیچییەکان، خەڵک بانگهێشتی ڕاپەڕین بکەن و بیانکەنە پشتیوانی خۆیان؛ کەس وەڵامی بانگەوازیان ناداتەوە و تەنیا دەمێننەوە و ڕێگەی هەڵاتن دەگرنە بەر، بەڵام دەستگیر دەکرێن و لە سێدارە دەدرێن. ماکیاڤێلی کە ئێستا تەمەنی نۆ ساڵە، وەک ڤیرۆلی دەبێژی:

> ئەگەر بە چاوی خۆی کاردیناڵ سالڤیاتی نەدیبێ کە لە پەنجەرەی کۆشکی کۆنەوە هەڵواسرابوو و کەلاکی پازییە شکسـتخواردووەکانی نەدیبێ کە بەسـەر شـەقامەکاندا ڕاکێـش دەکران، بـە دڵنیاییەوە بۆ ماوەیەکـی درێژ گوێی لە گێڕانـەوەی چیرۆکی ئەو بەسەرهاتە بووە، تا ڕادەیەک کە گاریکەریی قووڵیان لە سەری داناوە.[1]

دوای سـەرکوتکردنی پیلانگێڕان و ماوەیەک لە ئاشـتی و ئارامیـی هەرێمی ژێر دەسـەڵاتی مێدیچییەکان، گەندەڵی و تەخشان و پەخشانی ئەوان بۆنی بەرز دەبێتەوە و بەرە بەرە هەموو کەس هەسـتی پێ دەکا. لە سـاڵی ١٤٩٤دا کارلۆ-ی هەشتەم، پادشای

١. ڤیرۆلی س. پ. ل. ١٧.

فەڕانسە، سنوورەکانی ئیتالیا دەبەزێنێ و بێ هیچ بەرەنگارییەک لە لایەن ئیتالیاییەکانەوە، سپای خۆی دادەمەزرێنێ. مێژوونووس و دیپلۆماتی ئیتالیایی، فرانچیسکۆ گویچاردینی، هاتنی کارلوی هەشتەم بۆ ئیتالیا وەک *ئاگر و ئافەت* ناو دەبا. چونکە دەبێتە هۆی تێکچوونی هاوسەنگیی نێوان دەوڵەت و میرنشینەکانی سەرزەویی ئیتالیا و، شێوازی فەرمانڕەواییکردنیان. لە ناو دەوڵەتان و شالیارانی ئیتالیادا کەس بیر لە دروستکردنی هاوپەیمانی بۆ بەرەنگاری ناکاتەوە، بەڵکوو هەموان لە بیری ئەوەدان دەست بە کڵاوی خۆیانەوە بگرن و دەوڵەت و دەسەڵاتیان ڕزگار بکەن.

لۆرێنزۆ سەرۆکی مێدیچی، کە بە هۆی هۆگری بۆ شیعر و ئەدەب و لێهاتووییەوە، نازناوی شکۆداری پێ درابوو، لە ساڵی ١٤٩٢ ئەمرێ؛ جێگرەکەی، پیێرۆ مێدیچی، بە هۆی چوونە پێشوازی کارلوی هەشتەم، شای فەڕانسە، و ڕێکەوتن لەگەڵی، لەبەر چاوی خەڵکی فیرێنزێ سووک و چرووک دەبێ. نەیارانی کە ئەم هەڵوێستەی پیێرۆیان پێ خوێڕییانە و بەزیوانە دەبێ، دەست دەکەن بە دژایەتیکردنی و هاووڵاتییانی بە دژ هەڵدەخرێنن. یەکێک لەوانەی کە دەبێتە *زمانی ئاگرینی* ئەم نارەزایەتییانە، ڕەبەن ساڤۆنارۆلا-یە کە بە نموونە وەرگرتن لە ژیانی عیسای مەسیح بە وتارە تیژ و بە گڕ و تینەکانی، خەڵک بانگهێشتی ژیانێکی خاکەسارانە دەکا. زۆر بە توندی دژی گەندەڵانی شار، بە تایبەت دەسەڵاتدارانی فیرێنزێ وتار دەدا و سەر شەقامەکان دەکاتە شوێنی شرۆڤەکردنی ژیان بە پێی داب و نەریتی عیسا. پیێرۆی مێدیچی لە نوڤامبری ساڵی ١٤٩٤دا، هەڵدێ و پەنا دەباتە شاری بولۆنیا؛ بەم جۆرە کۆتایی بە هەفتا ساڵ دەسەڵاتدارێتیی مێدیچییەکان لە فیرێنزێ دێ و کۆماری گەلی دادەمەزرێ؛ *باوکی ڕۆحانی و سیاسیی ئەم کۆمارە ڕەبەن ساڤۆنارۆلا-یە*.[1] ساڤۆنارۆلا دژبەرێکی سەرسەختی گەندەڵی و ژیانی پڕ لە عەیش و نۆشی ئەم دنیایە و دژبەری توندئاژۆی کلیسای ڕۆما دەبێ: پێداگری لە سەر چاکسازی و ڕیفۆرم لە ناو کلیسا دەکا. وەک نووسەری فەڕانسەیی کاڤالیێر دەبێژێ:

١. فیرۆلی، س. پ. ل. ٢٩.

ڕەبــەن ببــووە خاوەن فیرێنــزێ (وەک چۆن دواتــر کالڤین لە ژێنێڤ دەســەڵاتی ڕەهای هەبوو) لە فیرێنزێ دێموکراسییەکی لە سەر بنەڕەتی خوداپەرستی دامەزراندبوو. بانگەشــەی ژیانی خاکەســارانەی دەکرد و ئەوەی لە ئامۆژگارییەکانی لای بدایە ســزا دەدرا: دەســتە و تاقمی لاوان بە کووچە و کۆڵانەکاندا ئەگەڕان و ســیخوڕییان بە ســەر خەڵکــەوە دەکرد و زمانیان لــە تاوانباران دەدا. گیانی ڕیفۆرم و چاکســازیی وشــیاری مەسیحی هەژاندبوو، قەشەکان داوای گۆڕانکاری و چاکسازییان لە کلیسا و لە دەسەڵاتی پاپا ئەکرد. ســاڤۆنارۆڵا، کە لێوانلێو بوو لە نەفرەت و ڕق دژی تەخشــان و پەخشــان و ژینی پڕ عەیش و نۆش، بە هەموو هێزیەوە بیری چاکســازیی باوەشــێن دەکرد. ئەم کە دژی خۆشــگوزەرانی و خۆش ڕابواردن و ژیانــی پڕ لە ڕەنگاڵەی پاپا بوو، *فەتوای* دژی دەرکردبوو. کڵاوی کاردینالی ڕەد کردبۆوە، دژی پاپا ئەلێکساندری شەشەم وەستابۆوە و ئاڵای دژایەتیکردنی گەنیوی و ڕزیویی دەسەڵاتی کلیسای هەڵکردبوو.[١]

لە مانگی مەی ســاڵی ١٤٩٨دا ڕەبەن ســاڤۆنارۆڵا، قۆڵبەســت دەکــرێ و دەخرێتە ژێر ئەشــکەنجە و ئازار؛ دوای حەوت ڕۆژ لە ئەشکەنجەدان، لە ٢٣ی مەیدا، حوکمی ئیعدامی بۆ دەردەچێ. ڕۆژێک دواتر لە گۆڕەپانی شــاری فیرێنزێ لە ســێدارە دەدرێ، لاشــەکەی دەســووتێنن و ئەیدەن بە دەم ڕووباری ئارنۆ-وە کە بە نێوەڕاســتی شــاری فیرێنزێدا بە ئارامی دەخوشێ. ماکیاڤێلی لە *شالیار*ەکەیدا، وەکوو پێغەمبەری بێ چەک و سپا باسی ساڤۆنارۆڵا دەکا.

ماوەیەک پاش مەرگی ڕەبەن ساڤۆنارۆڵا، لە ساڵی ١٤٩٨، ماکیاڤێلیی ٢٩ ساڵە تێکەڵاو بە کاروباری گشــتی و دەوڵەتی دەبێ. وەک سەرۆکی کۆنسەی دووهەم دیاری دەکرێ و هاوکات دەبێتە سکرتێری دیەچی بۆ ئازادی و ئاشتی؛ ئەم کۆمیسیۆنە کە نیکۆلۆ ببوو بە سکرتێری، کاری ڕاگەیشتن بە کاروباری سەربازی و سیاسەتی دەرەوەی کۆمار بوو.

---

١. یان-ژاکویس کاڤالیێر، کتێبە مەزنەکانی ئەندێشەی سیاسی، چاپەمەنی موولینۆ، بۆلۆنیا ١٩٩٨، ل ٢٠، بە ئیتالیایی.

ماکیاڤێلی لەم ماوەیەدا بە کردەوە دەبێتە یەک لە باڵوێزانی کۆماری فیرێنزێ بۆ سیاسەتی دەرەوە. بۆ چارەسەری هەر گێرە و کێشەیەک، یان ڕێککەوتن و هاوپەیمانی لەگەڵ شالیاران و میر و مەزنانی ئیتالیا و پادشایانی ئوروپا و دەسەڵاتی پاپا لە ڕۆما، ئەوە نیکۆلۆ ماکیاڤێلی-یە ئاوزەنگی ئەسپ لێ دەدا و ڕوو دەکاتە بارەگای دەسەڵاتداران. هەروەک لە شالیاریشدا بە باشی دەردەکەوێ، لە ماوەی کاری خۆیدا وەکوو سکرتێری دەوڵەتی فیرێنزێ بۆ کاروباری دەرەوە، لە نزیکەوە لویجی دوانزەهەم، خونکاری فەڕانسە، ماسیمیلیانۆ، ئیمپراتۆری ئاڵمان، و زۆر کەسی تر لە مەزنانی ئوروپا لە نزیکەوە دەناسێ. بینینی ڕێکوپێکیی شارەکانی ئاڵمان و هێزی چەکداری سویس، نیکۆلۆ سەرسام دەکات و لە گەڕانەوەیدا بۆ فیرێنزێ هەوڵ ئەدا هاوکارانی ڕازی بکا کە ئەوانیش بەو چەشنە سپای خۆیان ساز بکەن. کار و چالاکیی ماکیاڤێلی وەک سکرتێری فیورێنتینی، پازدە ساڵ درێژەی دەبێ و لەم ماوەیەدا سەردانی بارەگا و دەرباری زۆرێک لە دەسەڵاتدارانی ئوروپا دەکا؛ بە قووڵی لە هونەری سیاسەت و کاروباری دەوڵەتی ڕادەمێنێ و نیگای تیژ و بیری وردی لە دەمامکی هەموو سیاسەتڤان و خونکارێکەوە تێپەڕ دەبێ و دیوی شاراوەی بیر و هزری ئەوان بە چاکی دەخوێنێتەوە. لە کاتێکدا نیکۆلۆ بە هەموو هێز و بڕشتی خۆیەوە کار بۆ پاراستن و بەهێزکردنی کۆماری فیرێنزێ دەکا و بەردەوام لە ڕێگەی دەربار و بارەگای پاپا و پادشایانەوەیە، لە ساڵی ١٥١٢دا، دەسەڵاتی سیاسی لە فیرێنزێ دەگۆڕدرێت. کۆماری فیرێنزێ دەبێتە قوربانیی ناکۆکی و ئاڵۆزییەکانی نێوان پاپا جوولیوی دووهەم و لویجی دوانزەیەم خونکاری فەڕانسە. لە کاتێکدا سپای ئیسپانیا -هاوپەیمانی پاپا جوولیوی دووهەم-هەردەم ئەڵقەی گەمارۆی دەوری فیرێنزێ تەنگ دەکاتەوە، حکومەتی کۆماری لە بڕیاردان لە سەر ڕێکەوتن لەگەڵ سەرداری هێزی ئیسپانیا و پارەپێدان یان بەرەنگاری دڕدۆنگە؛ لە ئاکامدا، سەرۆک کومار پییرۆ سۆدێرینی، لە ترسی ئەوەی کە وەک سازشکار ناوی بێنن، بەرەنگاری هەڵدەبژێرێ. سیاسەتێک کە دواتر ماکیاڤێلی بە توندی ڕەخنەی لێ دەگرێ: چونکە پێی وا بووە کە

سـپای فیرێنزێ چاری دوژمن ناکات و شکان حەتمییە. هەرواش دەرچوو. هێزی کەم ئەزموونی فیرێنزێ -کە خودی ماکیاڤێلی یەک لە ڕێکخەران و دامەزرێنەرانی ببوو- لە بەر پەلاماری سپای ئیسپانیا خۆی پێ ڕانەگیرا و تەفر و توونا بوو. لەم کاتەدا کە کۆماری فیرێنزێ بووە قوربانیی هاوپەیمانیی نەیارانی، لایەنگرانی مێدیچی، ئەو ئالۆزی و بشێوییە دەقۆزنەوە بۆ دامەزرانەوە و سەقامگیرکردنەوەی دەسەلاتی خۆیان و سەرلەنوێ دەبنەوە دەسـەلاتداری تۆسکانا. بەم شـێوەیە کۆماری فیرێنزێ دەمرێ. لەگەڵ مەرگی کۆمار، چالاکبوونی ماکیاڤێلی وەکوو سـکرتێری کۆمار بۆ کاروبـاری دەرەوە کۆتایی پێ دێ و لە کاروباری گشـتی و دەوڵەتی دوور دەخرێتەوە. پاشـان بە تۆمەتی بەشـداریکردن لە کەینوبەینێکدا بۆ ڕووخانی مێدیچی دەسـتگیر دەکرێ و دەخرێتە بەندیخانە؛ پاش ماوەیەک ئەشکەنجە و ئازار ئازادی دەکەن، بەڵام ناچاری دەکەن شاری فیرێنزێ بە جێ بهێڵێ و لە تاراوگە بژی.

## نووسینی شالیار

دوای تاراندن لە شار، نیکۆلۆ ماکاڤێلی ڕوو دەکاتە گوندی سانتا ئاندێرا لە پێرکوسینا.[1] لەوێ، لەو ماڵەی باوکی بە میرات بۆی جێهێشـتووە، نیشـتەجێ دەبێ. ئەمڕۆ بە گشتی ئەو ماڵە بۆ ئەو خوێنەرانە کە ئاشنای مێژوو و بەسەرهاتی نیکۆلۆ هەن وەک ئالبێرگاچۆ[2] دەنـاسرێ و ئەم ماڵە وەبیرهێنـەرەوەی ژیانی تاراوگەنشـینیی ماکیاڤێلییە. ماکیاڤێلی لە نامەیەکدا، لە ڕێکەوتی ١٠ی دێسامبری ١٥١٣ بۆ یەک لە دۆستانی بە ناوی فرانچسکۆ ڤێتۆری، ئاوا باسی ژیانی خۆی لە لادێ و نووسینی *شالیار* دەکا:

[...]. لە ڤیلا[3] دەژیم. دوای ڕووداوەکانی فیرێنزێ شـارم بەجێهێشت و ئێستا لێرەم.

---

1. Sant'Andrea in Percussina

2. Albergaccio

٣. ڤیلا، Villa، ئەم پەیڤە لە سـەردەمی مۆدێرندا بۆ کۆشـک و تەلار بەکار دەبرێ، بەڵام لە سەدەکانی ناڤین و سەردەمی لەدایکبوونەوەشدا هێما بۆ ئاوایی و گوندی بچووک بە کار براوە.

لێره به دهستی خۆم داو دروست دهکهم و بهیانیان به کۆڵێک قهفهس و کهلوپهلی ڕاوهوه لــه ماڵ دهرئهکهوم.[...] ههندێک ڕۆژ دوو جوره، ئهوپهڕی شــهش دانه دهگرم. ههموو مانگی سێپتهمبرم ئاوا تێپهڕ کرد. ئهم چهشنه کات ڕابواردنهم زۆر به لاوه سهیره، بهڵام ئهو کاته که تێپهڕ دهبێ، پێم ناخۆشه و بۆی بهداخهوهم.

با قســهی ژیانی خۆمت بۆ بکهم. بهیانی لهگهڵ ههڵاتنی خۆر ههڵدهســتم و ئهڕۆم بۆ ناو ئهو دارســتانه که داومه دارهکانی ببڕن، لهوێ دوو کاتژمێر دهڕوانمه ئهو کارانه که ڕۆژی ڕابردوو ئهنجامیان داوه و کاتم لهگهڵ داربڕهکان تێپهڕ دهکهم، که ههردهم کۆڵێک گرفت و کێشــهیان له نێوان خۆیان و لهگهڵ هاوســاکان ههیه.[...]. دوای بهجێهێشتنی لێــڕهوار، دهڕۆمه ســهر کانی و لــهوێ داو دادهخهم بۆ جوره گرتــن و بۆخۆم خهریکی خوێندنهوه دهبم؛ یان دانتێ دهخوێنمهوه یان پێترارکا یان شاعیرانی نزمتر وهکوو تیبوولۆ، ئوڤیدیۆ و کهســانێکی تر: هۆنراوهی پڕ له ههست و سۆز و ئهڤیندارانهیان ئهخوێنمهوه و بیــر و خهیاڵم باڵ دهگرێ بۆ لای ئهڤینهکانی خــۆم و ماوهیهک بهم هزر و خهیاڵانهوه ڕادهبوێرم و چێژیان لێ وهردهگرم. دواتر ئهڕۆم بۆ سهر جادهی لای قاوهخانهکه و لهگهڵ ئهوانه که لهوێوه ڕادهبوورن دهکهومه گفتوگۆوه و دهنگوباسی نوێی گوند و دێهاتهکانیان دهپرســم. لهم ڕێگهیهوه له زۆر شت تێدهگهم و ههســت به فرهچهشنیی چێژ و خولیا و خهیاڵی مرۆڤهکان ئهکهم. پاشان کاتی خواردنی نانی نیوهڕۆ، دهگهڕێمهوه ماڵ و لهگهڵ دهستهکهم [ژن و منداڵ]، لهوهی که لهم گونده ههژارانهدا دهست ئهکهوێ و دارایییهکهم ڕێــگام پێ ئهدا، شــتێک دهخــۆم. دوای نان خــواردن ئهگهڕێمهوه قاوهخانــه. لێره به بهردهوامی قهســابێک، ئاشهوانێک و خاوهن کوورهکه ئامادهن. لهگهڵ ئهمانه خهریکی قسهی قۆڕ دهبین و یاریی وهرق و تاوڵه دهکهین. به دهم یارییهوه ههموو جۆره دهمهتهقه و مشتومڕێک دێته ئاراوه، له سهر قرۆشێک هات و هاوار بهرز دهبێتهوه، زۆر جار پێش هاتووه که له سان کاشینۆ-وه دهنگیان داوین. بهم شێوه ڕابواردنه لهگهڵ ئهم سپێخۆڕانه، ناهێڵم مێشکم کهڕهکیفه بینێ و نههامهتی و وهیشوومهی چارهی خۆم بهم شێوازه بهتاڵ

دەکەمەوە؛ خۆشـحاڵ کە چارەم کەمەندکێشـی ئەم ڕێگەیەم دەکا، حـەز دەکەم بزانم کەنگێ شەرم دایدەگرێ.

لەگەڵ داهاتنی شەو، دەگەڕێمەوە بۆ ماڵ و ئەڕۆمە ژووری نووسین و خوێندنەوەم: لـە بـەر دەرگاکەدا جلی قـوڕاوی و بۆگەنی ڕۆژانەم دادەکەنم و لیباسـی ڕاسـتەقینە و ڕێزدارانەم لەبەر دەکەم. دوای لەبەرکردنی جلوبەرگی شـیاو، دەڕۆمە نێو کۆشکە کەڤنار و لەمێژینەیـەکان، بۆ لای پیاوانی کەڤنار، ئەمان زۆر بە ڕێز و خۆشەویسـتییەوە دێن بە پیرمەوە. ئینجا دەسـت دەکەم بە خواردن لەو بژیوانەی بە تەبعی منن و ئەمن بۆ ئەوان لە دایک بووگم. لەوێ لە ئاخاوتن لەگەڵ ئەوان و پرسـیارکردن سـەبارەت بە هۆی کار و چالاکییان، شـەرم ناکەم؛ ئەوان زۆر مرۆڤانە بەرسڤی من ئەدەنەوە. من بۆ چوار سەعات هەسـت بە هیچ بێتاقەتی و دڵتەنگییەک ناکەم؛ هەر چەشنە دەرد و ڕەنجێک فەرامۆش دەکەم، باکم لە هەژاری نییە و مەرگ نامترسێنێ: بە تەواوی لەگەڵ ئەوان دەبم بە یەکێک. وەکچـۆن دانتێ دەبێژێ: تاکوو بە تەواوی شـتەکان لە بەر نەکەی، فێری زانسـت نابی. دوای وشـیاری و ئاگاداربوون لەو سـەرمایەیە کە بە وتوویژ لەگەڵ ئەوان کۆم کردبۆوە، نامیلکەیەکم سەبارەت بە کاروباری پادشایی نووسیوە کە بەپێی هەلومەرجی خۆم وەکوو ژێردەسـتەیەک، باسی ئەوە دەکەم: پادشـایی چییە، چەند شێوەی هەیە، ئەمانە چۆن بە دەست دەهێنرێن، چۆن ڕادەگیردرێن و بۆچی لە دەست دەچن.[1]

بەم شێوە وەک فیرۆلێ دەبێژێ: *شالیار*، یان سەبارەت بە پادشاییەکان، وەکوو چۆن خـودی ماکیاڤێلی بە نامیلکە ناوی دەبـات، لە تەنیایی ژیانی ئالبێرگاچـۆدا نووسراوە. *نیکولۆ بەرهەمی هەموو خوێندنەوەکانی لە سـەر مێژووی کەڤنار و گشت ئەو شتانەی لەو سـاڵانەدا کە وەکوو سـکرتێر کاری دەکرد و لە نزیکەوە دەیڕوانییە سیاست کردۆتە ناوئاخنی نامیلکەکەی.*[2] لە ڕاستیدا خودی ماکیاڤێلی لە هەمان نامەدا بۆ فرانچسکۆ ڤێتۆرێ

---

١. ماکیاڤێلی، کۆی بەرهەم، نامەکان ل. ١١٥٩-١١٦٠، بە ئیتالیایی.

٢. فیرۆلێ، س. پ. ل. ١٥٣.

دەنووســێ: *کاتێک بخوێنرێتەوە دەزانرێ ئەم پانزە ساڵەی من خەریکی خوێندنەوەی هونەری دەوڵەتداری بووم، نە خەوتووم نە خەریکی یاریکردن بووم.*[1]

بەم جۆرە دەکرێ بێژین ژیانی تاراڤگە و دوورخســتنەوەی لە کاروباری گشــتی وا دەکەن ماکیاڤێلی بە قووڵی ڕامێنێتە ســەر سروشتی سیاسەت و کاروباری دەوڵەتداری: ڕامانێک کە بۆ هەتاهەتایە زانســتی سیاســیی تووشــی گۆڕان کرد و بوارگەلی نوێی بۆ دیــاری کرد. بوارێک، کە بە پێچەوانەی زۆر کەس کە بڕوایان وایە ماکیاڤێلی داهێنەری ئەو بیرەیە کە دەڵێ: ئامانج ئامراز پاساو دەکا، پرۆفیسۆر ڤیرۆلی، یەکێک لە گرینگترین پسپۆڕانی ماکیاڤێلی، دەبێژێ:

ماکیاڤێلی هەرگیز وانەی ئەوەی نەوتۆتەوە کە ئامانج ئامراز پاســاو دەکا یان ئەوەی کە سیاسەتڤانان بۆیان هەیە دەست بدەنە ئەو کارانە کە بۆ ئەوانی تر قەدەغەیە؛ وانەیەک کە ئەو وتوویەتیەوە ئەوەیە کە ئەو کەسە کە خۆی بۆ وەدیهێنانی ئەمانجێ مەزن تەرخان دەکا، وەکــوو ڕزگاریــی گەلێک، دامەزراندنی دەوڵەتێک، چەســپاندنی دەســتوور و بەدیهێنانی ئاشــتی و ئارامی لەو شــوێنە کە ئاژاوە فەرمانڕەوایــە، نەجاتدانی کۆمارێک کــە گەندەڵی دایڕزاندووە، نابێ ترســی لەوە ببێ کە پێی بگوترێ دڕنــدە و دەڵڕق، یان سووک و نەوی، بەڵکوو دەبێ بزانێت کە پێویستە بە شێوەیەک کارەکە ئەنجام بدا کە بە سەرئەنجامی بگەیەنێ.[2]

جەماڵ زەندی ٦.٦.٢٠١٧
کتێبخانەی زانکۆی سویسڕا ئیتالیانا
لوگانۆ – سویس

---

١. ماکیاڤێلی، س. پ. ل-١١٦٠.
٢. ڤیرۆلی، س. پ. ل. ١٥٩.

## سەرچاوەکان:

Burckhardt, Jacob, La civiltà del Rinascimento in Italia, Newton e Compton, Roma, 2000.

[جاکوب بورکاردت، *شارستانیەتی سەرلەنوێ زاینەوە* لە ئیتالیا، چاپەمەنی نیوتۆن و کومپاتۆن، ڕۆما، ٢٠٠]

Chevallier, Jean-Jacques, le grandi opere del pensiero politico, il Mulino, 1998, Bologna.

[ییان-ژاکوێ کاڤالییر، *کتێبە مەزنەکانی ئەندێشەی سیاسی*، چاپەمەنی مولینۆ، بۆلۆنیا، ١٩٩٨]

Gramsci, Antonio, quaderni del carcere, III, a cura di Valentino Gerratana, Einaudi, Torino, 1975.

[ئانتۆنیۆ گرامشــی، *دەفتەرەکانی زیندان، بەرگی ســێیەم*، ئامادەکار ڤالێنتینــۆ جێراتانا، چاپەمەنی ئیناودی، تورینۆ ١٩٧٥]

Macchiavelli, Niccolò, Discorsi sopra la prima deca di Tito Livio, premessa al testo e note di Giorgio Inglese, Bur, 2008

[نیکۆلۆ ماکیاڤێلی، *دیسکۆرسەکان لەسەر دە کتێبی یەکەمی تیتو لیڤیو بە ئیتالیایی*، جۆرجۆ ئینگلێسی پێشەکی و پەراوێزی بۆ نووسیوە، چاپەمەنی بوورڕۆ، چاپی دووهەم، ٢٠٠٨]

Macchiavelli, Niccolò, Il Prinicipe, a curda di Giorgio Inglese, Einaudi, Torino, 1995.

[ نیکۆلۆ ماکیاڤێلی، *شالیار*، جۆرجۆ ئنگلێسی پێشەکی و پەراوێزی بۆ نووسیوە ]

Viroli, Maurizio, Il sorriso di Niccolo, Storia di Machiavelli, Laterza, Bari, 2013.

[ماوریزیۆ ڤیرۆلی، *بزەکەی نیکۆلۆ، سەربردی ماکیاڤێلی*، چاپەمەنی لاتێرزا، باری، ٢٠١٣]

## لە نیکۆلۆ ماکیاڤیلییەوە بۆ شکۆدار لورێنزۆ مێدیچی[1]

١ کاتێک کەسانێک تامەزرۆی وەدەستهێنانی دلۆڤانی و مێهرەبانیی شالیارێک بن و بیانەوێ دڵی ئەو وەدەست بێنن، بەپێی داب و نەریت لەو شتانەی پێشکەش دەکەن کە بە لایانەوە زۆر گران و خۆشەویستە و پێیان وایە دەبێتە هۆی شادمانی و شانازیی پادشا، بۆ نموونە: ئەسپ، چەک، قوماشی زێرکفت، بەردی بەنرخ و شتی ڕازاوەی لەم چەشنە کە لە ئاست شان و شکۆی ئەودا بین. کەوایە ئەوەی من لە ناو سامانی خۆمدا شکی دەبەم و زۆرم بە لاوە گران و بەنرخ و دەلالە و دەمەوێ بەوپەڕی حەزەوە پێشکەشی شکۆداری بکەم، هێندێک بەڵگەیە کە من بە ئەزموونی دووردودرێژی خۆم لە شتە نوێ و سەردەمیانەکان، لە ڕەفتار و کرداری پیاوانی بلیمەت و مەزن و بە خوێندنەوەی قووڵی مێژوو و ڕووداوە کۆنەکانەوە فێریان بووگم؛ ئەو شتانە کە بە وردی هەڵمسەنگاندوون و بە قووڵی لێیان ڕاماوم، ئێستا لە دووتوێی ئەم نامیلکەیەدا، وەک بەجێهێنانی ئەرکی سەر شانی خۆم، ئەینێرمە خزمەتی بەرز و شکۆداری بەڕێزتان. ئەگەرچی لام وایە ئەمە شیاوی شان و شکۆی ئێوە نییە. بەڵام ئەوە بە مانای بە کەم دانانی پایەبەرزی و دلۆڤانیی ئێوە نییە؛ چونکە بە لەبەرچاوگرتنی هۆگریی بەڕێزتان بۆ خێرخوازی، لەسەر

---

١. لۆرێنزۆ کوڕی پیێترۆ مێدیچی، Lorenzo di Piero dei Medici، (١٤٩٢-١٥١٩)، لە ئاگۆستی ١٥١٣ بەم لاوە سەرۆکی دەوڵەتی فیرێنزێ بووە.

ئەم بڕوایەم هیچ پێشکەشـــیەک مەزنتر و بەنرختر لەوە نییە کە بتوانێ لە ماوەیەکی زۆر کورتدا هەموو ئەو شـــتانە کە من ساڵانێکی دوورودرێژ بە کوێرەوەری و چەرمەسەریی زۆر و ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ گەلێک مەترســـی کـــۆم کردوونەوە، تێ بگەن و فێریان بـــبن. من ئەم ڕووپەڕەم بـــە بەند و باو و نەخش و نیگار نەڕازاندۆتـــەوە و بەرییە لە هەر چەشنە پێداهەڵگوتن و زمانلووسی یان هەر چەشنە ڕازاندنەوەیەکی ڕواڵەتی و دەستکرد و هەموو ئەو وشانە کە بۆ پێداهەڵگوتنی درۆیینە و دڵبەرانە باون؛ چونکە من نەمویست و نامەوێ و پێویستم بەوانە نییە. من تەنیا بە فرەچەشنی و گرینگی و بەنرخیی بابەت، ڕێزتان دەگرم و سپاســـی خۆم بۆ ئێوە دەردەبڕم. من نامەوێ ئەو پێشـــداوەرییە بکرێ کە ئاخۆ چۆن یەکێک لەو خوارەوە ئیجازەی بە خۆی داوە خەت و نیشان بۆ شالیاران بکێشێ و یاســـا و دەستووری حکومداری بۆ ئەوان دیاری بکا. ئەمە ڕێک لە کاری ئەوانە ئەچێ کە نەخشـــەی وڵاتان دادەڕێژن؛ ئەوان بۆ ڕامان لە بەرزایی و گاپێڵی شـــاخ و سروشـــتی چیاکان لە تەختایی و دامێنی چیادا ڕادەوەستن، دەزانین کە بۆ ڕامان و ڕوانین لە پێدەشت و تەختایی و شـــوێنە نەوییەکانیش دەڕۆنە سەر تەپۆڵکە و شوێنە بەرزەکان. ڕێک هەر بەم شـــێوەیە، بۆ ئەوەی بە باشی سروشتی گەلان و خەڵک بناسی پێویستە شالیار بی؛ بۆ ئەوەش بە باشی شالیاران بناسی پێویستە پیاوێک بی لە نێو خەڵکدا.

٢ بۆیە بە گەورەیی خۆتان ئەم دیارییە بچووک و کەم بایەخەی من کە بە دڵ و گیان پێشکەشـــتانی دەکەم، وەرگرن؛ ئەم دیارییە کە ئەگەر بە باشـــی سەرەنجی بدرێتێ و بە وردی وەخوێنرێ، گەورەترین ئاواتی ئەز، واتە ئاواتی ئەوە کە ئێوە بگەن بەو بلیمەتی و پایەبەرزییەی کە یاری بەخت و لێهاتوویی دیکەتان بۆتانیان ڕەخساندووە، دێتە دی. جا ئەگەر ئێوەی مەزن لە ترۆپکەوە، لە لووتکەی بەرزیی خۆتانەوە، جار و بار ئاوڕێک لە شوێنە نەوییەکان بدەنەوە، دەبینن من چۆن لەم خوارەوە شانم داوەتە ژێر باری نەهاتی و ڕۆژڕەشیی خۆم و چۆن ژینم ڕادەبوورێ، بێ ئەوەی شیاوی وەها ژیانێک بم.

***نیکۆلۆ ماکیاڤێلی***

***سەبارەت بە پادشایی***

***بۆ شکۆدار لورێنزۆ مێدیچی***

## ١. چەند شێوە پادشایی هەیە و چۆن وەدەست دەهێنرن؟

١ هەموو دەوڵەتان، هەموو ئەو حکومەتانە کە بە سەر مرۆڤدا دەسەڵاتدار بوون و دەسەڵاتدارن، کۆماری یان پادشایی بووگن و هەن. پادشا یان میراتگر و تۆرەمەی ئەو زنجیرە شایانەن کە مەزنەکانیان بۆ ماوەیەکی درێژ پادشا بوون یان نوێن. نوێیەکان یان بە تەواوی نوێن، وەکوو میلانۆ بۆ فرانچسکۆ سفۆرزا[1] یان ئەوە کە کاتێک شالیارێک پادشاییەک داگیر دەکا، ئەوان لە سەر تەختی شای دادەنێن، وەکوو پادشای ناپۆلی بۆ شای ئیسپانیا.[2] ئەم دەسەڵاتانە یان بەم شێوە کە باس کرا وەدەست کەوتوون، یان بە شێوەی نەریتی لە ژێر دەسەڵاتی شالیارێکدا ژیاون، یان خود ڕاهاتوون ئازادانە بژین. ئەوانە کە وەدەست هێنراون یان بە یارمەتیی سپا و لەشکری کەسانی تر بووە، یان بەهۆی چەک و سپای خۆیانەوە بووە، یان بە هۆی یاری بەختەوە وەدەستیان کەوتووە، یان بە لێهاتوویی و لێزانیی خۆیان وەدستیان هێناوە.

---

١. فرانچسکۆ سفورزا، Francesco Soforza، بڕوانە بەشەکانی ،٧، ١٢ و ١٤.

٢. بەپێی ڕێککەوتنی نهێنیی گرانادا (١٥٠٠) فێردیناندۆ کاتولیک پادشای ئیسپانیا لەگەڵ لویجی دووهەم لە سەر دابەشکردنی پادشایی ناپۆلی لە نێوان خۆیاندا سازابوون، دیارە بە زیانی فێدێریکۆی ئاراگۆنا؛ بەڵام دوو هاوپەیمان لە نێوان خۆیاندا دەبێ بە شەڕیان (١٥٠٢-١٥٠٤)، ئینجا لە سایەی لێهاتوویی سەربازیی کونسالڤۆی کوردوڤاییەوە، Cordova، فێردیناندۆ دەبێتە خاوەن هەموو ئەو پادشاییە. ئـ ئی. ف.

## ٢. سەبارەت بە پادشایی نەریتی

١ چونکە ڕامان و ڕاڤەکانی خۆم سەبارەت بە کۆمار لە شوێنێ دیکە بە وردی باس کردووە، بە پێویستی نازانم لێرەدا سەر لە نوێ ئاوڕی لێ بدەمەوە.[١] بۆیە لێرە دەمەوێ تەنیا سەبارەت بە پادشایی بدوێم و بە وردی ڕاڤەی بکەم. کەوابێ بەو پێیەی بەر لەمە ڕیزیانم کرد، دەیاندەمە بەر باس و ڕاڤەکردن و باسی ئەوە ئەکەم کە ئەم پادشاییانە چۆن دەبێ فەرمانڕەوایی بکرێن و چۆن بپارێزرێن.

٢ جا بۆ چوونە ناو باسەکە، ئەمن دەبێژم کە ئەو دەوڵەتانە کە بە میرات بە شالیاری دەگەن و ژێردەستەکانی بە فەرمانبەزی باو و باپیرانی ڕاهاتوون، گیروگرفتی ڕاگرتن و پاراستنیان گەلێ لە هی پادشای نوێ کەمترە. چونکە هەر ئەوەندە بەسە دەستکاریی ئەو دامودەزگا و دامەزراوانە نەکرێ کە باو و باپیران سەقامگیریان کردوون و بەپێی بارودۆخ حکومەت بکرێ و خۆ لەگەڵ هەلومەرج بگونجێنی. ئەوسا ئەگەر ئەو پادشاییە قورس و قایم و چاک دامەزرابێ، بە مەرجێ لەگەڵ هێزێ مەزن ڕووبەڕوو نەبێتەوە کە ببێتە هۆی هەڵتەکاندن و تێکدانی ئارامی و ئاسایشی یان داگیرکردنی، ئەوە ئەو دەوڵەتە سەقامگیر و بەردەوام دەبێ. تەنانەت ئەگەر بێتو داگیرکەر لێی داگیر بکات، هەر ئەوەندە نەهاتی

---

١. ئەمازەیە بە کتێبی *دیسکورسەکان*، کە پێشتر ئاماژەم پێکرد. ئەم ئاماژەی ماکیاڤێلی لێرە ئەو گریمانەی لای توێژەرانی دروست کردووە کە پێش ئەوەی دەست بە کاری نووسینی *شالیار* بکا، کتێبی یەکەمی *دیسکورسەکان*-ی نووسیوە.

ڕووی لە داگیرکەر کرد، ئەو دەتوانێ پادشایی خۆی بەدەست بهێنێتەوە.

٣ ئێمە لە ئیتالیای خۆماندا وەک نموونە دووکی فیرڕارامان[1] هەیە. ئەوە کە لە ساڵی ١٤٨٢دا، لە هەمبەر هێرشی ڤێنێزییەکان خۆڕاگریی کرد و لە ساڵی ١٥١٠ لە بەرانبەر هێرشی پاپا جوولیوە خۆڕاگریی کرد؛ ئەمەش بێجگە لە کەڤناریی ئەم پادشاییە لەو مەڵبەندە هیچ هۆی تری نەبوو.[2] چونکە هیچ هۆکار و پێداویستییەک پاڵ بە پادشای میراتگرەوە نانێ زوڵم و زۆر و سووکایەتی بە بندەستەکانی ڕەوا ببینێ‌و لەو شوێنەشدا کە قازانجی شا لەوەدایە خۆشیان بوێ، ئەگەر کارێک نەکا بە هۆی خووی دزێو و شەڕئەنگێزیی زۆرەوە بکەوێتە بەر تووک و نەفرەت، زۆر ئاساییە ژێردەستانەکانی ڕێزی لێ بگرن و خۆشیان بوێت. هەروەها چونکە لە پادشایی کەڤناردا، بە هۆی بەردەوامیی فەرمانڕەواییانەوە، بیرەوەرییەکانی داگیرکردن کوێر بووەتەوە و فەرامۆش بووگن: چونکە هەر گۆڕانێک بنەڕەتێ لە خۆی بەجێ دەهێڵێ بۆ بنیادنان ئەوە کە شوێنی دەگرێتەوە.

1. Ferrara

٢. لە ساڵی ١٤٨٤دا ڤێنێزییەکان، کە دوو ساڵ پێشتر شەڕ دژی دووک ئێرکۆلێ دێ ئێستێ‌یان بەرپا کردبوو، ڕێککەوتنی ئاشتیی بانیولۆ-یان بە سەردا سەپاندبوو و بەو پێیە پولێسینی ڕوڤیگۆ-یان لە چنگ دەرهێنابوو؛ لە ١٥١٠ پاپا جوولیوی دووهەم بەشێکی بەرچاو لە دووکاتی دووکا ئالفۆنسۆ، هاوپەیمانی فەڕانسەوییەکان، داگیر دەکات، بەڵام دووکا ساڵ دواتر بە دەستی دێنێتەوە. ئـ.ئی.ف.

## ٣. سەبارەت بە پادشایی تێکەڵاو

١ لە پادشایی نوێدا بەردەوام گیر و گرفت هەیە. یەکەم -ئەگەر بە تەواوی نوێ نەبێ، بەڵکوو بە پادشـاییەکی لەمێژینە و کەلەپوورییەوە پەیوەست کرابێ ئەوە دەکرێ بێژین هەموو تێکڕا تا ڕادەیەک پادشاییەکی تێکەڵاوە،- گیر و گرفتەکان لە هەموو پادشاییەکی نوێدا هەن و جۆارجۆریشـن، ئەمەش بەر لە هەموو شـتێک لە گرفتێکی سروشـتی و بنەڕەتییەوە سەرچاوە دەگرێت کە لە هەموو پادشاییەکی نوێدا هەیە: ئەویش ئەوەیە کە خەڵک بەو بیر و بڕوایەوە سـەرۆک دەگۆڕن کە بارودۆخ ڕوو بە چاک بوون بڕوا، هەر ئەم بیر و بڕوا و ئاواتانە بە چاکسازی و چاکبوونە کە وایان لێ دەکات دەست بدەنە چەک و دژی ئەوان ڕاپەڕن[1]، بەڵام ئەوان لەم بوارەوە فریو ئەخۆن و چاوبەست دەکرێن: چونکە زۆری پێ ناچـێ ئەزموونەکان دەری دەخەن کە بارودۆخ نەتەنیا چاک نەبووە، بەڵکوو خراپتریش بووە. ئەمەش بۆخۆی پێوەندیی بە پێویستیی سروشتی و دەستووریی دیکەوە هەیە کە ئەمەیە: ئەوەی کە تازە دەبێ بە پادشـا، بۆ گەیشتن بە دەسەڵات و داگیرکردنی پادشایی و سەپاندنی دەسەڵاتی خۆی، هەمیشە ناچارە دەست بداتە داپڵۆسان و ترساندن

---

١. هەروەها لە دیسکورسـەکاندا کتێبی سێهەم، ٢١. ٢: «مرۆڤەکان تامەزرۆی شتی نوێن،[...] ناخۆشی مرۆڤ پەرێشان و شـەمزاو دەکات و خۆشـی دەبێتە هۆی بێزاربوونی. کەوابێ، ئەو ئاوات و تامەزرۆییە وا دەکات دەرگای وڵات بخرێتە سەرپشت بۆ ئەو کەسەی سەرکردایەتیی نوێخوازی دەکات».

و تۆقاندن. ئەوسا هەموو ئەوانە کە لە کاتی داگیرکردنی ئەو پاشایەتییەدا دەستدرێژی و سووکایەتییان پێکراوە، دەبن بە دوژمنی و ناتوانێ ئەوانەش پشتیوانی بووگن و بە دەسەڵاتیان گەیاندووە، بەو چەشنە کە پێشبینییان کردووە و چاوەڕوانییان هەیە ڕازی بکا و ئاواتەکانیان بێنێتە دی. وێڕای ئەمانەش، ناتوانێ دەستبەجێ بە پشتبەستن بە هێزی سەرکوت و تۆقاندن، کێشەکەیان چارەسەر و یەکلایی بکاتەوە؛ چونکە تەنانەت ئەو کەسەش کە خاوەن سپا و هێزێکی فرە زۆردارە، بۆ چوونە مەڵبەندێکەوە، دیسان هەر پێویستی بە یارمەتیی دانیشتووانی ناوچەکە هەیە. هەر بۆیە لویجی دوازدەهەم، شای فەڕانسە، توانی فرە زوو میلانۆ داگیر بکا، کەچی هێندەی پێ نەچوو دۆڕاندی[1]؛ تەنیا هێزی تایبەتی لۆدۆڤیکو[2] بەس بوو بۆ ئەوەی کە میلانۆی لە چنگ دەربێننەوە: چونکە ئەو خەڵکە کە دەرگایان بۆ خستبووە سەرپشت تێگەیشتبوون کە فریوی وادە و بەڵێنەکانی ئەوانیان خواردووە و سەبارەت بەو دەسکەوتانەش کە لە داهاتوودا دەبوو ببن بە خاوەنی بە هەڵەدا چووگن؛ هەر بۆیە نەیاندەتوانی دان بە خۆیاندا بگرن و سووکایەتی و زوڵم و چەوساندنەوەی شالیاری نوێ قەبووڵ بکەن.

٢ ئەوە ڕاستە کە کاتێک وڵاتێک ڕادەپەڕێت و دەتهەوێ بۆ جاری دووهەم داگیری بکەیتەوە، گیر و گرفتەکان هەر گەلێک زۆرتر دەبن: چونکە لە کاتی داپڵۆساندنەوە و سەرکوتکردنی ڕاپەڕیواندا و زاڵبوون بەسەر بارودۆخدا، سەردارێک کە سەرکردایەتیی داگیرکردنەوە و سەرکوتکردنی لە ئەستۆیە، بۆ سزادانی تاوانکاران و ئاشکراکردنی تێوەگلاوانی ڕاپەڕین، پەیڕەوی ئامۆژگاریی ژیرانە ناکات و بیر لە چارەی کەموکوڕی

---

١. لویجی دوازدەهەم، کە لە پادشایی فەڕانسە دوای کارلۆی پێنجەم لە سەر تەختی شایی دانیشتبوو، هەر زۆر زوو داوای میلانۆی کردبوو، چونکە وەچەی جان گالێئازوو بوو، بۆیە بە هۆی نەنەیەوە، ڤالێنتینا ڤیسکۆنتی‌یەوە، ئەو هەرێمەی بە میراتی خۆی زانیبوو. لەگەڵ ڤێنێزییەکان هاوپەیمانیی پێکهێنابوو و لە سێپتەمبری ١٤٩٩ میلانۆی داگیر کردبوو و لۆدۆڤیکو سفۆرزای دەرپەڕاندبوو. ئەمیش هەڵاتبوو و لای ئیمپراتۆر ماسیمیلیانۆ پەنای گرتبوو. پاشان بە سوود وەرگرتن لە ناڕەزایەتیی خەڵکی میلانۆ، بە هۆی زوڵم و چەوساندنەوەی حاکمانی نوێیەوە، لە فێبرایوی ١٥٠٠دا توانیبووی بگەڕێتەوە میرنشینی خۆی، (بەڵام دوو هەیف دواتر سەرلەنوێ دۆڕاندبووی). ـ ئی. ف.

2. Lodovico

ناکاتەوە و هەوڵی چارەسەری خاڵە لاوازەکان نادا. بۆیە یەکەم جار بۆ دەرهێنانی میلانۆ لە دەست فەڕانسە، تەنیا دووکێک بەس بوو، ئەویش لۆدوڤیکۆ کە سنوورەکانی لێ ئاڵۆز کردبوو. بەڵام بۆ ئەوەی جاری دووهەم فەڕانسە بشکێندرێ و میلانۆ لە چنگی دەربهێنرێتەوە و بۆ دەرپەڕاندنی سپا و ڕاوەدوونانی لە ئیتالیا، دەبوو هەموو جیهان لە دژی ڕابوەستن[1]؛ دیارە هۆیەکانی ئەمەش ئەوانەن کە بەر لەمە باسم کردن. بەڵام بە هەر شێوەیەک بوو، هەم جاری یەکەم و هەم جاری دووهەم میلانۆ لە چنگ فەڕانسە دەرهێنرایەوە. هۆیە سروشتی و گشتییەکانی جاری یەکەم ڕاڤە کران؛ ئێستا ماوەتەوە باسی جاری دووهەم بکەین و بزانین شای فەڕانسە چۆن دەیتوانی کێشەکان چارەسەر بکا؛ یان ئەو کەسەی دەسەڵاتی دەکەوێتە کلۆڵی و گلۆڵەی دەکەوێتە لێژی، بۆ پاراستنی داگیرکارییەکانی، بۆ ئەوەی بە دەردی شای فەڕانسەدا نەڕوا، چارەی چییە.

٣ جا بۆیە من ئێژم ئەو دەوڵەت و مەڵبەندانە کە لە لایەن دەوڵەتی کەڤنار و لەمێژینەوە داگیر دەکرێن و دەخرێنە سەر ئەو پادشاییە کۆنە[2]، یان لە هەمان وڵاتن و هاوزمان و هاوسنوورن یان بە پێچەوانەوە زمانیان جیاوازە و لێک دوورن. لە دۆخی یەکەمدا، واتە کاتێک هاوزمان و هاوسنوورن، ئەوە ڕاگرتنیان فرە سانایە، بە تایبەت کاتێک ژیانی ئازاد لە نێو خەڵکی ئەو مەڵبەندەدا باو نەبووە، بۆ ڕاژێرکردنی ئەمان بۆ ژێر دەسەڵاتی خۆت و کردنیان بە ژێردەستەی خۆت، هەر ئەوەندە بەسە تۆرەمەی پادشای کۆنیان بکوژێنیتەوە. بەڵام لە بابەتی تردا، بە مەرجێک بارودۆخی کەڤناریان بپارێزرێ، چونکە هیچ جیاوازی و ناکۆکیی فەرهەنگی و داب و نەریتی لە ئارادا نییە، خەڵکەکە لە ئاشتی و ئارامیدا

---

١. یەکەم جار کە فەڕانسە میلانۆی دۆڕاندبوو، هەر ئەوەندە بەس بوو کە دووکێکی ئاسایی لە سەر سنوورەکان هەندێ ئاژاوە بنێتەوە و ببێتە هۆی هەستانێکی جەماوەری؛ بەڵام دواتر کە فەڕانسەوییەکان لە ئاپریلی ١٥٠٠دا دووکاتی میلانۆیان داگیر کردبۆوە، بۆ ئەوەی کە دیسانەوە بیدۆڕێنیتەوە، پێویست بوو کە پاپا، شای ئیسپانیا، ئیمپراتۆر، شای ئینگلیس و سویسییەکان دژ بە شای فەڕانسە لە بەرەیەکدا یەک بگرن: لە مانگی ژوئێنی ١٥١٣ هێزەکانی فەڕانسە لە نوڤارا شکابوون و ناچار بیون ئیتالیا بەجێ بهێڵن. ئـ ئی. ڤ.

٢. لەم بوارە م. لە *دیسکورسەکان*دا، ١، ١٢. ٢ دەنووسێ: «چونکە هەر وڵاتێک تا تەواو نەکەوتووە ژێر دەسەڵاتی کۆمارێک یان شایەک قەت یەکگرتوو و بەختەوەر نەبووە، وەکچۆن لە فەڕانسە و ئیسپانیا ئەمە ڕووی داوە».

دەژین؛ وەکچۆن لە بورگونیا، برێتانیا، گوواسکونیا و نورماندیا[1] شایەتی ئەمە بووین و بینیمان چۆن ماوەیەکی درێژ لەگەڵ فەڕانسە بوون؛ ئەگەرچی لە بواری زمانەوە هەندێ جیاوازییان هەیە[2]، بەڵام لە بواری داب و نەریتەوە هاوشێوەن و لێکچوونیان زۆرە، بۆیە بێ گێرە و کێشە و بە ئاسانی پێکەوە هەڵ دەکەن. ئەو کەسە کە ئەم چەشنە دەوڵەت و مەڵبەندانە داگیر دەکا، ئەگەر بیهەوێ بیانپارێزێ، دەبێ ئاگاداری ئەم دوو خاڵە بێ: یەکەم لەوە دڵنیا بێ خوێن و بنج و بناوانی شالیاری پێشوویان بە تەواوی کوێر بۆتەوە و ئاسەواری نەماوە؛ دووەهەم دەستکاریی داب و دەستوور نەکا و نەیگۆڕێ و باجی پتریان لەسەر دانەنێ؛ بەم جۆرە لە ماوەیەکی کورتدا لەگەڵ مەڵبەندی پادشایی کۆنی ئەوان بە تەواوی دەبێ بە یەک پەیکەر.

٤ بەڵام کاتێک دەوڵەت و ئەو مەڵبەندانە کە داگیر دەکرێن زمان و داب و نەریت و دەستووریان تەواو جیاوازە، لەگەڵ گیروگرفتی زۆر ڕووبەڕوو دەبێ و ڕاگرتنی ئەم دەوڵەتانە کاری زۆر و بەختیاریی فرەی پێویستە. یەکێک لە چاکترین و کاریگەرترین چارەسەرییەکان بۆ پاراستنی ئەوەیە کە داگیرکەر بۆخۆی بڕوا بنکە و بارەگای خۆی لەوێ دامەزرێنێ و تێیدا نیشتەجێ ببێ؛ بەم جۆرە هەم ئاسایشی دەسەڵاتی خۆی دەپارێزێ، هەم داگیرکارییەکەی درێژخایەن دەبێ، ڕێک هەر بەو جۆرەی سوڵتانی تورک لە کاتی

---

١. دووکاتی بورگونیا، Borgogna، دوای مەرگی کارلۆ ناسراو بە ئێمێراریو لە ١٤٧٧ لە شەڕدا، دەخرێتە سەر پادشای فەڕانسە؛ کارلۆی هەشتەم بۆ ئەوەی کە لە دەسەڵاتداریی خۆی بەسەر برێتانیا، Bretagna، دڵنیا بێ، لە ١٤٩١ لەگەڵ دووکێسا ئانا زەماوەندی کردبوو، ئینجا کە لە ١٤٩٨ بێوەژن کەوتبوو، جێگرەوەی کارلۆی هەشتەم، لویجی دوازدەهەم دەیخوازێ، هەر بەم بۆنەوە لە ژنی یەکەمی جودا ببۆوە؛ کچەکەی کلاودیا لە ١٥١٤دا شوو دەکاتە فرانچێسکۆی یەکەم، کە ساڵێک دواتر لە جیاتی خەزووری دەڕواتە سەر تەختی شایی فەڕانسە؛ گوواسکونیا، Guascogna، یان وردتر بێژینی دووکاتی ئاکویتانیا، Aquitania، کە لە ژێر فەرمانڕەوایی شای ئینگلیسدا بوو، دوای زەماوەندی دووکێسا ئلێونورا لەگەڵ جوڤانی دووهەمی پلانتاجێنێتو لە ١١٥٢، لە ١٤٥٣ لە لایەن کارلۆی حەفتەمەوە دەستی بە سەردا گیرابوو؛ دووکاتی نورماندیا، کە موڵکی گولیێلمۆ-ی داگیرکەر بوو، هەر لە دەست پادشای ئنگلیس مابۆوە، (بێجگە لە دەورەیەکی کورت نەبێ) هەتاکوو کاتێ ئەمیش لە لایەن کارلۆی حەفتەمەوە داگیر دەکرێتەوە؛ ئاخری لویجی یازدەهەم بۆ هەمیشە لکاندی بە پادشای فەڕانسەوە. ئـ ئی. ف.

٢. لە بواری زمانەوە هەندێ: «زمانێکی هەر تەواو تایبەت و سەربەخۆ» جیاواز لە زمانی فەڕانسەوی، کە زمانی ئۆک-ـە، l'oc، بووە و زمانی ئاخافتنی گوواسکونییش بەشێ لەم بووە، لە کاتێکدا فرەچەشنی ناوچەی زمانی فەڕانسەوی زمانی نورماند و بورگونیۆنیێن «لە برێتانیا بە دیالێکتی چێلتیک قسەیان دەکرد. ئی. ئی.

داگیرکردنی یۆنان کردی[١]: ئەو سەرەڕای پەیڕەوکردنی هەموو شێوازەکان بۆ ڕاگرتن و پاراستنی ئەو دەوڵەتە، خۆیشی ڕۆیشت لەوێ نیشتەجێ بوو. ئەو ئەگەر وای نەکردبا، بە دڵنیاییەوە ئیمکانی نەبوو لە پاراستن و ڕاگرتنی لە بن دەستی خۆیدا سەرکەوتوو بێ. دیارە ئەمەش بۆ ئەوەیە کە کاتێک لەوێ نیشتەجێ دەبی، ئەگەر بشێوی و ئاژاوە سەر هەڵ بدا، ئەوە بەپەلە دەتوانی چارەسەری بۆ بدۆزیتەوە و چارەی بکەی. بەڵام ئەگەر بۆخۆت لەوێ نەبی، کاتێک دەزانی کە کێشە تەشەنەی کردووە و کار لە کار ترازاوە و چیتر چار ناکرێ. بێجگە لەمەش ئەو مەڵبەندە بە دەست پیاوانی شا تاڵان ناکرێ و ژێردەستەکانیشی بە ئاسانی دەستیان بە پادشا ڕادەگات؛ ئەمەش دەبێتە هۆی ڕازیبوونی ئەوان. بۆیە، ئەگەر بیانهەوێ ژێردەستەی چاک و ملکەچ بن، ئەوە بۆ ئەوە کە ڕێز لە شالیار بگرن هۆیان هەیە، ئەگەریش وا نەبن ئەوسا لێی دەترسن. هەروەها ئەگەر هەر هێزێکی دەرەکی بیهەوێ هێرش بکاتە سەر ئەو مەڵبەندە، کاتێک پادشا بۆخۆی لەوەی نیشتەجێیە، لەگەڵ بەرەنگاریی توند ڕووبەڕوو دەبێت و دۆڕاندنی زۆر دژوارە.

٥ یەکێ تر لە چارەسەرییە چاکەکان ئەوەیە دانیشتووانی دەوڵەتی داگیرکراو بگوازرێنەوە بۆ یەک یان دوو لەو شوێنانە کە کۆلۆنیالن و وەکوو شوورە و پەرژینی پاراستنی دەوڵەت وان. یان ئەمە دەکەی، یان ناچاری مەڵبەندی داگیرکراو بکەیتە مۆڵگەی سپا و هەردەم پیادە و سوارەی زۆری ساز و ئامادەی تێدا ڕابگری. گواستنەوە و نیشتەجێکردنیان لە کۆلۆنییەکاندا خەرجی زۆر نییە؛ یان هەر خەرجێ نییە یان بە خەرجێ فرە کەمەوە لەوێ نیشتەجێیان دەکەی و لە ژێر دەستی خۆتدا ڕایان دەگری. لە ئاوا حاڵەتێکدا، شالیار تەنیا زوڵم لەو کەسانە دەکا کە زەویوزار و مەزراکانیان لێ دەستێنێ و دەیدا بەوانە کە تازە لەوێ نیشتەجێ دەکرێن؛ ئەوانەش کە دەست بە سەر زەویوزاریاندا دەگیردرێ کەمینەیەکی فرە بچووک لە دانیشتووانی ئەو دەوڵەتە پێکدێنن؛

١. لە پێوەند بە یۆناندا، بە مانای ئیمپراتۆریی بیزانتینویە. وەک ئاشکرایە سوڵتان محەمەد فاتێح پایەختی عوسمانیی گواستەوە بۆ کوستانتینوپولی و لەوە بە دواوە ناوی نرا ئیستانبول. ـ ئ. ن. ف.

ئـەم کەمینەیەش پـەرژ و بڵاو و پەرتـەوازە دەبێ و هیچکات هێزی زەبر وەشـاندن لە دەوڵەتیـان نابێ. لە لایەکی دیکەشـەوە، ئەو زۆرینەی زوڵـم و زۆری لێ نەکراوە، خۆ دوور دەگرێ لە نانەوەی ئاژاوە و بشێوی. هەروەها ئەوان ئاوی چاویان سێندراوە، بۆیە بۆ ئەوەی کە بیانک نەدەنە دەست شاوە بۆ ئەوە بە وێنەی ئەوانی تر دەست بگرێ بە سەر دارایـی و زەویوزاریاندا ملکەچی هەڵدەبژێرن. لە کۆتاییدا دەبێ بێژم کە ئەم کۆلۆنی و ژێردەستانە، خەرجیان زۆر نییە، ئەمەگناسترن، کێشە و دەردیسەری کەمتر ساز دەکەن و وەک پێشتریش باسم کرد، ئەوانە کە زوڵمیان لێکراوە و دەست بە سەر زەویوزار و ماڵ و حاڵیاندا گیراوە، بە هۆی پەرتەوازەیی، هەژاری و دەستەنگییەوە توانایی زیان گەیاندن و زەبر وەشاندنیان نییە. هەر لەم پێوەندییەدا، پێویستە ئاگاداری ئەوە بین کە مرۆڤ یان دەبێ بە نەرم و نیانی لەگەڵی هەڵسوکەوت بکرێ، یان خاشەبڕ و پاکتاو بکرێ: چونکە ئەوان ناتوانن سـووکایەتیی گەورە قەبووڵ بکەن و بە هەموو شێوەیەک هەوڵی تۆڵەسەندنەوە دەدەن؛ ئەوەی کە سووکایەتی بە مرۆڤ دەکا، دەبێ وەها سووکایەتییەک بێت کە ترسی لە تۆڵەسـەندنەوە نەبێ. بەڵام ئەگەر لە جیاتی ناردن بۆ کۆلۆنی، سپا و هێزی چەکدار لە دەوڵەت و هەرێمی داگیرکراودا جێگیر بکرێ، دەبێ هەموو داهاتی ئەم دەوڵەتە خەرجی ئەو هێزە بکرێ؛ بە جۆرێ کە داگیرکردنی بە زیانت تەواو دەبێ. هەروەها سـووکایەتیی زۆرتر دەکرێ، چونکە بە گواستنەوە و جێبەجێبوونی بەردەوامی سپا و ئوردوولێدانی پەیتا پەیتا لەو وڵاتەدا زیان بە گشت ئەو دەوڵەتە دەگەیەنی؛ هەمووان هەست بەو ناخۆشی و تەنگ و چەڵەمە دەکەن کە سپا بۆتە هۆکاری و هەموو کەس دەبێ بە دوژمنی پادشا؛ ئەمە ئەو دوژمنایەتییەیە کە توانایی زەبر وەشـاندن و زیان گەیاندنی هەیە. ئەمە دوژمنایەتیی ئەو کەسانەیە کە دوژمن بۆتە خاوەن ماڵیان و لە ماڵی خۆیاندا شکۆیان شکاوە، سووک و ڕسـوا بووگن و ژینی ژێردەستەییان بە سەردا سەپاوە. کەوابوو، وەکچۆن گواستنەوە و کردن بە کۆلۆنیال بەسوودە، ئەم زێرەڤانی و چاودێریکردنە بێسوودە.

٦ هەروەها کاتێک لە مەڵبەندێکی فرەچەشـندا، لەو چەشـنەی باسـی کرا، جێگیر

دەبێ، پێویستە سەرۆکایەتیی بەرگری لە هاوسێیە کەم زۆرەکان بکەی و هۆشی خۆت وەگەڕ بخەی بۆ لاوازکردنی زلهێزانی ناوچەکە و وشیار بی کە هێزی دەرەکیی زۆردارتر لە ئاستی خۆتدا، بە هەر هۆکار و بیانوویەکەوە نەیەتە ئەو ناوچەیە: دیارە هەمیشە هەر پێش دێ کە کەسانی نارازی و ڕەنجاو یان بەرزەفڕ و چاوچنۆک یان ترساو دەبنە ڕێخۆشکەر و ڕێنوێنی کەسانێک بۆ ناوچەکە؛ وەکچۆن هەروەک دەزانرێ ئێتولییەکان[1] بوون ڕێگەیان بۆ ڕۆمییەکان خۆش کرد بۆ ئەوەی بڕۆنە یۆنان؛ دەزانین کە ڕۆمییەکان دەڕۆیشتنە هەر مەڵبەند و ناوچەیەکەوە خەڵکانی خۆجێیی ئەو ناوچانەیان لەگەڵ بوو و دەبوونە چاوساخیان؛ یان ئەوەی کە بۆ لای خۆیان بانگهێشتیان دەکردن.[2] ڕەوتی ڕووداوەکان ئاوایە کە هەر ئەوەندەی هێزێکی دەرەکیی زۆردار دێتە ناوچەکەوە، هەموو هێزەکان، کەم یان زۆر، کە نەیاری زۆرداری دەسەڵاتدار بووگن، لە دەوری کۆوە دەبن و دەبنە هاوپەیمانی. بە جۆرێک کە هێزی دەرەکی بۆ کۆکردنەوەی هێزە کەم زۆرەکان لە دەوری خۆی کێشەیەکی ئەوتۆی نابێ؛ هەڵبەت ئەوانیش بۆ ئەوەی لەگەڵی پێک بێن و هاوپەیمانیی لەگەڵ ببەستن دەرفەتەکان لە کیس نادەن. بەڵام دەوڵەتی داگیرکەر، بۆ ئەوەی تەنیا خۆی تاقە زۆردار و بڕیاردەری ئەو ناوچەیە بێ، دەبێ وریا بێ و نەهێڵێ گەشە بکەن و ببنە خاوەن هێزی فرە و بزانێ جارویار بە چەشە و جارویار بە زۆر، هەردەم لاواز ڕایانگرێ. چونکە ئەوەی ڕۆیشتۆتە ئەو مەڵبەندەوە، ئەگەر نەزانێ چاک فەرمانڕەوایی بکا، فرەی پێ ناچێ هەموو ئەوەی بەدەستی هێناوە لە کیسی ئەدا؛ یان ئەوەی کە بۆ ڕاگرتن و پاراستنی لە بن دەستی خۆیدا بەردەوام لەگەڵ گیر و گرفت دەستەو یەخەیە.

---

١. [Etoli, Etolii، ئێتولیا: هەرێمێ کەڤار لە یۆنانی ناوەند هەڵکەوتووە. ئیتولی، دانیشتووانی ئەو هەرێمە]. ئیتولییەکان لە ٢١٩-١٧ی پ.ز بە هاوپەیمانیی سپارتەکان شەڕی دژ بە فیلیپی پێنجەمی مەکدۆنیان کردبوو، دواتر لە یەکەم شەڕی مەکدۆنیدا (٢١٥-٢٠٥) پشتیوانییان لە ڕۆمیەکان کردبوو، ئەمەیش بۆ ئەوەی کە شای مەکدۆنی هەوڵی دابوو، دژی ڕۆما، یارمەتیی کارتاجێنییەکان بدا. ئـ.نی.ڤ.

٢. «ئەگەر لە باس و لێکدانەوەکانم سەبارەت بە پادشایی بە درێژی قسەم لەسەر ئەو شێوازانە نەکردبا کە ڕۆمیەکان بۆ ڕۆیشتنە مەڵبەند و وڵاتی ئەوانی ترەوە پەیڕەویان دەکردن، ئەوە دەبوو لێرە بە وردی لێیان بدوێین: بەڵام لەو ناملیکەدا ئەم بابەتە بە تێروتەسەلی لێک دراوەتەوە». (دیسکۆرسەکان، ٢، ١، ٣).

٧ ڕۆمییەکان لەو ناوچانە کە داگیریان دەکردن زۆر چاک سەرنجی ئەم خاڵانەیان دەدا کە ئەماژەیان پێکرا. ئەوان دانیشتووانیان بۆ کۆلۆنیاکانی خۆیان ڕادەگوازت، هێزە کەم زۆرەکانیان لەگەڵ خۆیان ئاشت دەکردەوە، بێ ئەوەی کە بهێڵن هێزیان گەشە بکا، زلهێزەکانیان لاواز دەکرد، بوار و دەرفەتی ئەوەیان نەدەڕەخساند ناوبانگی هێزگەلی دەرەکی لەو ناوچانە بڵاو ببێتەوە و هۆگریی خەڵک بۆ لای خۆیان ڕاکێشن. وەک نموونە لەم بارەیەوە تەنیا ئاماژەکردن بە شێوەی هەڵسوکەوتی ڕۆمییەکان لە یۆناندا بەبەس دەزانم: ئەوان ئاکێی[1] و ئێتولییەکانیان ئاشت کردەوە و لەگەڵیان پێکهاتن و کردنیانن بە دۆستی خۆیان؛ پادشای مەکدۆنییەکانیان خست و ئانتیۆکۆیان[2] دەرپەڕاند؛ چاکی و ئەمەگناسیی ئاکێی و ئێتولییەکانیش نەبووە هۆی ئەوەی ئیجازەی دامەزراندنی دەوڵەتیان پێ بدەن و بهێڵن دەسەڵاتیان لە ناوچەکە پەرە بسێنێ؛ زمانلووسی، کلکەلەقە و خۆشخزمەتییەکانی فیلیپیش[3] نەیانتوانی دڵی ئەوان ئەوەندە نەرم بکا کە بە هۆی ئەو دۆستایەتییەوە دەوڵەت و دەسەڵاتی لەق و لاواز نەکەن. هەروەها دەسەڵات و هێزی ئانتیۆکۆ نەبووە هۆی ئەوەی کە ئیجازەی پێ بدرێ پەرە بە دەوڵەت و دەسەڵاتی خۆی لەو ناوچەیە بدا. هەڵبەت ڕۆمییەکان لەم بابەت و بوارانەوە هەر ئەوەیان دەکرد کە هەر پادشایەکی ژیر و زانا دەبێ بیکا؛ ئەوان تەنیا تێبینیی ئاڵۆزی و ئاژاوەکانی ئەو کاتەیان نەدەکرد، بەڵکوو ئەوانەی داهاتوویان لەبەرچاو دەگرت؛ بە جۆرێ کە پێش بە سەرهەڵدانی هەر چەشنە ئاژاوەیەک بگرن. چونکە کاتێک سەرهەڵدان دوورە، پێشگیری و چارەسەری ئاسانە و ئاسان چار دەکرێ؛ بەڵام دەستەوەستان و چاوەڕێبوون تا نزیکبوونەوەیان، دەبێتە ئەوەی کە چیتر

---

١. [Achei ئاکێی، لە نووسراوەکانی هومێردا وەک دانیشتووانی یۆنانی کەڤـار دەردەکەون. ئاکێییەکان مەبەست دانیشتووانی ئاکێیایە]. لێرەدا ئاکێی و ئێتولیان «هێزە کەم زۆرەکان»ی یۆنانن؛ «زلهێز»ی ناوچە فیلیپی پێنجەمی مەکدۆنییە؛ «هێزی دەرەکیی زۆردار» ئانتیۆکۆی سورییەیە. ئـ.نی.ف.

٢. Antioco، ئانتیۆکۆی سێهەم، ناسراو بە ئانتیۆکۆی مەزن، لە ٢٢٣ تا کاتی مردنی لە ١٨٧ی پ.ز شای سورییە بووە. لە ساڵی ١٩٢ هەوڵی خۆگلاندن لە شەڕی نێوان ڕۆمییەکان و ئێتولییەکانی داوە، بەڵام پەیتا پەیتا شکێنراوە. ئـ.نی.نی.

٣. Filippo، فیلیپ، لە ئاخر و ئۆخری ساڵی ١٩٢دا، دژی ئانتیۆنۆ لەگەڵ ڕۆمییەکان پێک هاتبوو؛ بەڵام دوای سەرکەوتن و تەواوبوونی شەڕ، ڕۆمییەکان ناچاریان کردبوو هەموو ئەو ناوچانە کە داگیری کردبوون چۆڵیان بکات. ئـ.نی.نی.

دەرمان کاریگەر نەبێ؛ چونکە ئێســتا ئیتر نەخۆشی تەشەنەی کردووە و چاری ناکرێ. ئەمە ڕێک وەک ئەوە وایە کە پزیشــکان ســەبارەت بە نەخۆشــیی دەردە باریکە ئێژن، ئەوەی کە لە ســەرەتای دەردەدارییەوە، چارەکردنی ئاسانە و ناسینەوەی دژوارە؛ بەڵام بە تێپەڕبوونی زەمان، چونکە لە ســەرەتاوە نەناسراوە و چارە نەکراوە، تەشەنە دەکا و ئینجا ناســینەوەی ئاســانە و چارەی دژوارە. کاروباری دەوڵەت بەم جۆرە بەرەو پێش ئەچێ، کەسانی وردبین و دوورنواڕ، زۆر زوو نەخۆشی دەناسنەوە و چارەیان بۆ ئەدۆزنەوە؛ بەڵام کاتێک بە نەناسراوی مابێتەوە، ئەوە تەشــەنە دەکا و هەموو کەس دەیناســێ، بەڵام ئیتر چاری ناکرێ. هەڵبەت ڕۆمییەکان فرە زوو و لە دوورەوە کەموکوڕییەکانیان بەدی دەکرد و دەناســییەوە و هەمیشەیش چارەیان دەکردن. هیچکات لێی نەدەگەڕان سەرهەڵدان لە دەستیان دەرچێ و ببێتە هۆی شەڕ و ئاژاوە. ئەوان دەیانزانی کە نابێ خۆت لە شەڕ ببوێری بەڵکوو دەکرێ بە کاتێ دیکەی بســپێری. هەر بۆیە، بۆ ئەوەی شــەڕ نەکێشرێتە ئیتالیا، شــەڕی خۆیانیان لەگەڵ فیلیپ و ئانتیۆکۆ لە یۆنان کرد. ئەوان ئەو کات دەیانتوانی خۆ لەو دوو شەڕە ببوێرن، بەڵام نەیاندەویست. ئەوان هەرگیز هۆگر و لایەنگری ئەو مەتەڵە نەبوون کە ژیرەکانی سەردەمی ئێمە بەردەوام دووپاتی دەکەنەوە، ئەوەی کە دەڵێ: هەوڵ بدە لە زەمان بە قازانجی خۆت کەڵک وەرگری. ئەوان دوورنواڕی و هەڤیازیی خۆیانیان بــە گونجاوتر و ژیرانەتر دەزانی؛ چونکە زەمان هەموو شــتەکان بۆ پێشــەوە ڕادەماڵێ و لەگەڵ پێشڕەویی خۆیدا شەڕ بە خێر و خێر بە شەڕ دەنوێنێ.

٨ ئێســتا با بگەڕێینەوە بۆ فەڕانسە و لەوە بکۆڵینەوە و بزانین لەوانە کە هەر ئێستا باس کران کامانەیان پەیڕەو کردووە و بە ئەنجامیان گەیاندووە. باسی لویجی دوازدەیەم ئەکەم و قسەی کارلو[١] ناکەم. چونکە لویجی دوازدەیەم بۆ ماوەیەکی درێژتر لە ئیتالیا جێگر بوو و ئێمە باشــتر چاودێری تەرزی هەڵسوکەوتی بووین. دەبینن ئەم بە پێچەوانەی ئەوەی

---

١. کارلۆی هەشتەم شای فەڕانسە، کە نزیک ساڵێک لە ئیتالیا بووە (ئاگۆستی ١٤٩٤ تا جوولای ١٤٩٥)، بەڵام لویجی لە ١٤٩٩ هەتا ١٥١٢ لە ئیتالیا بیووە. ئـ ئی. ئی.

کە بۆ ڕاگرتنی دەوڵەتێکی فرەچەشـن پێویستە بکرێ هەڵسـوکەوتی کردووە. لویجی دوازدەیەم لە سەر داوا و ئارەزووی ڤێنێزییەکان کە دەیانەویست بە هۆی هاتنی ئەمەوە نیوەی لومباردیا[١]یان چنگ کەوێ، هاتە ئیتالیا. من نامەوێ لۆمەی ئەم بڕیارەی پادشای فەڕانسە بکەم و ڕەخنەی لێ بگرم؛ ئەو دەیەویست جێ پێی خۆی لە ئیتالیا خۆش بکات و هیچ دۆسـتێکی لەم ناوچەیە نەبوو. بە پێچەوانەوە، بە هۆی هەڵسـوکەوتی پێشـووی کارلوی هەشـتەمەوە، هەموو دەرگاکان بە ڕوویدا داخرابـوون. هەر بۆیە ناچار بوو ئەو دۆسـتایەتییەی بۆی هەڵکەوتبوو قەبووڵی بکات. دۆسـتایەتییەک کـە ئەگەر لە کار و چالاکییەکانی دیکەیدا تووشی هەڵەی قورس نەبووبایە، تێیدا سەرکەوتوو دەبوو. دوای داگیرکردنی لومباردیا لە لایەن پادشـای فەڕانسەوە، دەسبەجێ ئەو ناوبانگە خراپەی کە کارلوی هەشتەم لە دوای خۆی بەجێی هێشتبوو ڕەوییەوە و ناوی لویجی بە چاک ڕۆیی و هێنـدەی پێ نەچوو جێنوڤا[٢] خۆی دا بەدەسـتەوە، فیورێنتینییەکان بوون بە دۆسـتی، مارکێز و بەگزادەکانـی مانتۆڤا[٣]، دووکی فیرڕارا[٤] بێنتیڤۆلی سـەرداری بلۆنیا[٥]، مادۆننای فوورلی، سەرداری فاینزا، لە لایەن ڕیمینییەکانەوە، لە لایەن پێسێرۆ، لە لایەن گامێرینۆ، لە لایەن پیۆمبینۆ، لووکاییەکان، پیساییەکان، سیێناییەکانەوە،[٦] بۆ ئەوەی دۆستایەتیی خۆیانی پێ ڕاگەیەنن و پەیمانی دۆسـتیی لەگەڵ ببەسـتن هەر هەموویان سەردانیان کرد. ئەوسا بـوو کە ڤێنێزییەکان تێگەیشـتن بڕیارەکەیان تا چ ڕادەیەک بـەری لە تێڕامانی قووڵ و دوورنواڕی بووە؛ ئەوان بۆ وەدەسـتهێنانی دوو شاری لومباردییا، شای فەڕانسەیان کردە خاوەن و گەورەی دوو لە سێی خاکی ئیتالیا.

---

١. Lombardia، ناوچەیەکی پان و بەرین و پڕ بەروبووم لە باکووری ئیتالیا.

٢. Genova، هەرێمێکی خۆش و دڵڕفێنە لە لای باکووری ئیتالیا.

3. Mantova

4. Ferrara

5. Bologna

٦. هەموو ناوی پادشـایی و میرایەتیـیەکانی ناوەند و باکووری ئیتالیای ئەودەم بووگن. ئێسـتاش زۆربەیان بازێڕی گەورە و پاتەختی پارێزگاکانن. پێویسـتە خوێنەر ئاگادار بێ کە ئیتالیا تەنیا لە سـاڵی ١٨٦٠دا یەکیگرتووە و دەوڵەتی ناسیـۆناڵی پێکهێناوە.

٩ جا ئێستا بە سەرنجدانی ئەوەی گوترا، هەموو کەس دەتوانێ بە ئاسانی لێکی بداتەوە کە شای فەڕانسە چۆن دەیتوانی بە کەمترین گیر و گرفتەوە ناو و ناوبانگی خۆی لە ئیتالیا بپارێزێ؛ هەڵبەت، ئەگەر سەرنجی ئەو داب و دەستوورانەی دابا کە پێشتر باسمان کرد و دڵنیایی بە هەموو دۆستانی بدابا و بەرگری لە هەموویان کردبا. ئەوان سەرەڕای ئەوەی کە ژمارەیان زۆر بوو، بەڵام کەم هێز و لاواز بوون و هەموو ترسابوون؛ یەکێک لە دەسەڵاتی کلیسا دەترسا، یەکێکی تر لە ڤێنێزییەکان. بۆیە ناچار دەبوون بۆ هەمیشە هاوپەیمان و دۆستی لویجی بمێننەوە، ئەویش هەر بە بۆنەی ئەمانەوە دەیتوانی وەکوو هەموو مەزنێک جێگە و پایەی خۆی پتەو بکا و بیپارێزێ. بەڵام ئەو هێمان پێی نەنابووە میلانۆ-وە، بە پێچەوانەوە جووڵایەوە: هەر زۆر زوو بووە پشتیوان و یارمەتیدەری پاپا ئەلێکساندری شەشەم بۆ داگیرکردنی ڕومانیا[1]. پادشای فەڕانسە نەیزانی کە بەم بڕیارەی دەبێتە هۆی لاوازبوونی خۆی و ئەوانەی کە هاتبوون لە بەری نووشتابوونەوە و پەیمانی دۆستایەتییان لەگەڵ بەستبوو پشتی تێ دەکەن و لێی دوور دەکەونەوە. لویجی دەسەڵاتی پتری بەخشییە کلیسا، ئەو کلیسا زۆردار و مەزنە کە لە بواری ڕۆحانییەوە تاقە دەسەڵات بوو و ئێستاش خەریکی پەرەدان بە دەسەڵاتی دنیایی خۆی بوو. لویجی دوای ئەوەی کە یەکەم هەڵەی کرد، ناچار بوو هەر لە سەر ئەو ڕێڕەوە بڕوا، تا لە ئەنجامدا گەیشتە ئەو جێگایە کە بۆ کۆتایی هێنان بە بەرزەفڕی و فرەخوازییەکانی ئەلێکساندری شەشەم، بۆ ئەوەی نەهێڵێ دەست بگرێتە سەر تۆسکانا[2] و ببێ بە دەسەڵاتداری، ناچار بوو خۆی بێ بۆ ئیتالیا.

١٠ لویجی بە هۆی مەزنکردنەوەی دەسەڵاتی کلیساوە هەموو دۆستانی خۆی لە ئیتالیا دۆڕاند، بەڵام بە ئەوەشەوە نەوەستا، بەڵکوو چاوی بڕییە پادشایی ناپۆلی و لە ئاکامدا لەگەڵ پادشای ئیسپانیا پێکهات و لە نێوان خۆیاندا دابەشیان کرد. ئەم بەم کارەی زلهێزێ

---

١. Romagna هەرێمێ لەمێژینە لە باکووری ئیتالیا.

٢. Toscana مەڵبەندێکی بەرین و بە بەروبوومە، لە ناوەندی ئیتالیا هەڵکەوتووە.

تری هاورده ناوچەکە و کردییە شەریکە بەشی خۆی؛ لە کاتێکدا پێشتر بۆخۆی بە تەنیا بڕیاردەر و داوەری ئیتالیا بوو. ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە ئەوانەی لێی ناڕازی بوون یا شوێن بەرزەفڕی و پلانی خۆیان کەوتبوون، پەنا ببەنە بەر پادشای ئیسپانیا کە تازە هاتبووە ناوچەکەوە. لویجی لە کاتێکدا دەیتوانی شـــایەک لە سەر تەختی شای ناپۆلی دانێ کە پیتـــاک و باجی بۆ بنێرێ، یەکێکی دانا کە بووە هۆی درکردن و دەرپەڕاندنی خۆی لەو مەڵبەندە. ڕاســـتە حەز و تامەزرۆیی بۆ هەرچێ پتر بەدەست هێنان شتێ فرە سروشتی و ئاساییە و ئەوانەش لەم بوارەدا سەرکەوتن بە دەست دێنن هەمیشە دەبنە جێی پەسەند و ستایش، یا لانیکەم ناکەونە بەر گلەیی و گازندە، بەڵام هەڵە و گرفت لەوەدایە کە کاتێک توانای بە ئەنجام گەیاندنی ئەو کارەیان نییە هەر پێداگریی لە سەر دەکەن و دەیانەوێ بە هەر شـــێوازێک بووە ئەنجامی بدەن؛ ئەوســـایە کە دەکەونە بەر گلەیی و گازندە و دەبنە نیشـــانە بۆ تیر و تانە. کەوابوو، ئەگەر فەڕانســـە تەنیا بە هێزی خۆیەوە دەیتوانی پەلاماری ناپۆلی بـــدا و داگیری بکا، ئەوە دەبوو وای کردبا؛ ئەگەر نەیدەتوانی، نەدەبوو دابەشـــی بکا. دابەشـــکردنی لومباردیا لەگەڵ ڤینیزییەکان پاساوهەڵگەر بوو، چونکە دەرفەتی بۆ ڕەخساند پێی بنێتە سەر خاکی ئیتالیا و بێتە ئەم وڵاتەوە؛ بەڵام دابەشکردنی ناپۆلی لەگەڵ ئیســـپانیا بە هیچ مەرج و کلۆجێک پاساوی نییە و جێی ڕەخنە و گازندەیە؛ چونکە هیچ ناچارییەک لە ئارادا نەبوو.

١١ بە کورتی، لویجی ئەم پێنج هەڵەیەی کرد: هێزە بچووکەکانی لاوازتر و بێدەسەڵاتتر کرد و بووە هۆی گەشەدان بە دەسەڵاتێک و کردی بە تاقە دەسەڵاتی زۆردار و بڕیاردەر لە ناوچەکە، واتە دەســـەڵاتی کلیســـا؛ هێزێکی دەرەکیی فرە بەهێزی هاوردە ناوچەکەوە -پادشـــای ئیســـپانیا-؛ کۆلۆنیاڵی دروست نەکرد و بۆخۆیشـــی نەهات لە ئیتالیا جێگیر بێ. ئەگەر هەڵەی شەشـــەمی نەکردبا، واتە هەوڵدان بۆ ڕووخاندنی دەوڵەتی ڤینیزیا[1] و

---

١. بە دەستپێشـــخەریی پاپا جوولیـــوی دووهەم (Giuglio II) لە ١٠ی دێســـەمبری ١٥٠٨دا، لـــە کامبرایی [Cambrai] پەیمانێ لە نێوان کلیسا، ئیمپراتۆر، فەڕانسە و ئیسپانیا مۆر کرا، کە بە ڕواڵەت دژی تورکەکان بوو، بەڵام ژێر بە ژێر و بە نهێنی ڤینیزیای مەبەست بوو. ئـ.ئی.ئی.

دەستگرتن بە سەر ئەو هەرێمەدا، ڕەنگە تا کاتێک بۆخۆی لە ژیاندا بیووا هەڵەکانی دیکەی هێندە زیانی مەزن و کاریگەریان پێی نەگەیاندبا. بۆ لویجی، تا کاتێک نەبووە هۆی پەرەسەندن و مەزنتربوونی دەسەڵاتی کلیسا و ئیسپانیای نەهێنابووە ئیتالیاوە، تێکشکانی ڤێنێزییەکان فرە بەجێ، ئاقڵانە و پێویست بوو. بەڵام کاتێک یەکەم بڕیارەکانی دا، ئیتر نەدەبوو هەوڵی ڕووخانی ئەوان بدات؛ چونکە ڤێنێزییەکان زۆردار بوون و نەیاندەهێشت کەس دەست لە کاروباری لۆمبادریا وەردا و بێ ئەوەی مەزنیی خۆی لەو مەڵبەندە بە فەرمی بناسرێ، لەگەڵ کەس، بۆ هاتنە ناوچەکەوە، ڕێک نەدەکەوتن؛ بۆیە بەرژەوەندیی ئەوان لەوەدا نەبوو لۆمباردیا لە دەست فەڕانسە دەربێنن و ڕادەستی کەسانی تری بکەن. هەروەها لەخۆڕادیتوویی و بوێریی ئەوەیان نەبوو شەڕی دوو لایەنەکەش بکەن.

١٢ ئەگەر کەسێک بێژێ لویجی دوازدەیەم، بۆ ئەوەی تووشی شەڕ و ئاژاوە نەبێ و خۆی لێ بپوێرێ، ڕومانیای ڕادەستی پاپا ئەلێکساندری شەشەم کرد و پادشایی ناپۆلی لەگەڵ ئیسپانیا دابەش کرد؛ ئەوە بەرسڤی ئەز، ئەو هزر و بۆچوونانەیە کە بەر لەمە دەرمبڕین؛ یانی ئەوەی کە نابێ هیچکات ئیجازە بدرێ بشێوی سەر هەڵ بدا و لە دەست دەرچێ و ببێتە هۆی شەڕ و ئاژاوە، چونکە ئەوسا ڕزگاری لە دەستی ئەستەمە و بە زیان دەشکێتەوە. ئەگەر کەسانێک بیانەوێ هۆی بڕیارەکەی لویجی، سەبارەت بە ڕێخۆشکردن بۆ ئەوەی کە پاپا دەست بگرێ بە سەر ڕومانیا، بگێڕنەوە بۆ ئەوەی کە بەڵێنی بە پاپا دابوو لە پێناو بەفەرمیناسینی تەلاقی ژنەکەی و گومبەزی ڕۆنانودا[1]، ئەمیش ئەو کارەی بۆ دەکا، ئەوە لەو شوێنە کە باسی پەیمان و بەڵێنی شالیار و چۆنیەتیی سەرنجدانی ئەو بەم بابەتە دەکەم، وەڵامی دەدەمەوە[2].

١٣ بەهۆی ڕاڤەکردن و لێکدانەوەی وردی ئەم باسەی سەرەوە دەردەکەوێ کە بۆچی

---

١. گومبەز یان قوببەی ڕۆنان، ئاماژەیە بە ڕۆنان ئوسقۆفی ڕۆوێن، جۆرجێس دێ ئامبویسێ (١٤٦٠-١٥١٠) ڕاوێژکار و ڕێنوێنی سیاسەتەکانی لویجی دوازدەهەم. ئـ نی.نی.

٢. بەشی ١٨.

لویجی دوازدەیەم لۆمباردیای دۆڕاند؛ چونکە گوێی بە هیچکام لەو خاڵانەی سەرەوە نەدا و تێبینیی نەکردن، لە کاتێکدا ئەوانی تر ئاوڕیان لێ دانەوە و پەیڕەویان کردن، بۆیە توانیان دەست بگرن بەسەر ناوچەکەدا. بە دڵنیاییەوە، هیچکام لەو خاڵانە پەرجوو ناکەن، بەڵام تا ڕادەیەکی زۆر لەگەڵ ئاوەز و لۆژیکدا کۆکن. کاتێک چێساریێ بۆڕجیا[1] -ئەوەی کە لە ناو خەڵکدا بە ڤالنتینۆ بەناوبانگە- ڕومانیای داگیر کرد، من لە نانتێس[2] لەگەڵ ڕۆئانو[3] باسی ئەم بابەتانەم کرد. کاردیناڵ دەیگوت ئیتالیاییەکان لە شەڕ نازانن و لێی حاڵی نین، منیش لە وەڵامدا پێم گوت: فەڕانسەییەکان لە دەوڵەت و دەوڵەتداری تێناگەن و لێی نازانن، ئاخر ئەگەر لێیان زانیبا، نەیاندەهێشت دەسەڵاتی کلیسا پەرە بسێنێ و هێندە مەزن ببێتەوە. ئەزموونەکان سەلماندیان چۆن فەڕانسە، کە خۆی بووە هۆی پەرەسەندن و مەزنبوونەوەی دەسەڵاتی کلیسا و ئیسپانیای هێنا ئیتالیاوە، هەر بەدەست ئەم دووانەش تێک شکا و لە ئیتالیا دەر کرا. هەر ئا لەمەوە قانوونێکی گشتی هەڵدەهێنجرێ کە بە دەگمەن بە هەڵەدا ئەچێ، واتە هەمیشە ئاکامەکەی ڕاست دەردەچێ، ئەویش ئەمەیە: ئەوەی دەبێتە هۆی زۆرداربوون و پەرەسەندنی دەسەڵاتی یەکێ تر، هەر وەدەست ئەو دەخرێ؛ چونکە ئەو زۆرداركردن و گەورەكردنەوە یان بە زۆر و هێز بووە، یان بە دوورنواڕی و ژیری، ڕێک بۆیە ئەو کەسە کە لەم دوو ڕێگەیەوە و بە یارمەتیی کەسانی تر ئەگاتە دەسەڵات و مەزن دەکرێتەوە، هەردەم لەو کەسە کە بە دەسەڵاتی گەیاندووە دڕدۆنگە و وەکوو هەڕەشە بۆ سەر خۆی سەیری دەکا.

---

١. Cesare Borgia (١٤٧٥-١٥٠٧) کوڕی پاپا ئەلێکساندری شەشەم؛ ئەم هەر بوو بە پاپا چێساری کوڕێ وەکوو ئۆسقۆفی ڤالێنسیا دیاری کرد (١٤٩٢) و لە (١٤٩٣) کردییە کاردینال و پلەکەی بەرز کردەوە. لە ئاگۆستی ١٤٩٨دا وازی لە پلە و پایەی کلیسا و دینی و دووکایەتی ئەو هەرێمە هێنا کە پادشای فەڕانسە پێی دابوو. ئـ نی. نی. [ئەم کەسایەتییە، لە بەشی حەوتمدا بە تەسەلی باسی لەسەر دەکرێ].

2. Nantes

3. Roano

## ٤. ئەسکەندەر پادشایی داریوشی داگیر کرد، کەچی پاش مەرگی، خەڵکی وڵاتی داگیرکراو دژی جێنشینەکانی ڕانەپەڕین، هۆکارەکانی ئەمە کامانە بوون؟

١ به تێبینیکردنی دژوارییەکانی ڕاگرتنی دەوڵەتێکی تازە داگیرکراو، ڕەنگە هەندێ کەس سەریان لەوە سوور بمێنێ کە ئەسکەندەر مەکدۆنی لە ماوەیەکی کورتدا بووە پادشای ئاسیا؛ ئەو کاتەی مرد تازە لە داگیرکاری و لەشکەرکێشییەکانی بۆوە.[1] بە تێڕامان لەو گیر و گرفتانە کە لە ڕاگرتن و پاراستنی وڵاتێکی تازە داگیرکراودا سەر هەڵدەدەن، پێشبینیی ئەوەی کە دوای مەرگی ئەسکەندەر هەموو ئەو دەوڵەتە بخرۆشێ و ڕاپەڕێ فرە ژیرانە بوو. کەچی بە پێچەوانەوە، جێگرەوەکانی ئەسکەندەر جگە لە کێشە و ململانێی نێو خۆیان نەبێ، کە بە هۆی فرەخوازی و چاوچنۆکییەوە بوون، بۆ ڕاگرتن و پاراستنی ئەو دەوڵەت و وڵاتە تووشی گیر و گرفتێکی ئەوتۆ نەبوون. لێرەدا دەپەرژێمە سەر ئەم پرسە و بەرسڤی ئەدەمەوە کە ئەرێ ئەو پادشایانە کە هێمان لە بیرگەدا زیندوون چۆن و بە کام شێواز فەرمانڕەواییان کردووە. ئەوان بە دوو شێواز فەرمانڕەواییان دەکرا: یەکەم ئەوەی کە شایەک لە سەر تەخت بووە و هەموو ئەوانی تر لە خزمەت ئەودا بووگن و بەپێی ئیرادەی

١. داگیرکردنی ڕۆژهەڵات لە ٣٣٤ تا ٣٢٧ پ.ز-ی خایاند؛ ئەسکەندەری مەزن لە ٣٢٣ دا مرد، ئەوکات تەمەنی سی و سێ ساڵ بوو. ئـ.ئی.ئی.

خـۆی وەزیر و میری بۆ هەڵسـووڕان و بەڕێوەبردنی کاروبار پادشـایی دیاری دەکرد. شێوەی دووهەم ئەوەیە کە پادشاییەک هەیە و ئەوانی تر بارۆن و ئاغا و دەرەبەگە خاوەن موڵکەکانن. ئەم ئاغا و بارۆنانە بە ئیرادەی شا بەم پلە و پایە نەگەیشتبوون، بەڵکوو بە هۆی خوێنەوە و بە میرات پێیان گەیشتووە. ئەم ئاغا و میر و مەزنانە خێوی دەوڵەت و ڕایەتی خۆیانن، کە لە لایەن شـاوە بە فەرمی ناسراون و ڕێزیان لێ دەگیردرێ. لەو دەوڵەتانە کە شـایەک لەگەڵ دەسـت و پێوەند و خزمەتکارانی فەرمانڕەوایی دەکا، دەسەڵاتی پادشا گەلێ زۆرترە و تەنیا دەسـەڵاتی باڵایە و ڕایەتەکانی لە هەموو ناوچەی ژێر دەسەڵاتیدا، تەنیا دەسـەڵاتی ئەو بە فەرمی دەناسـن و ملی بۆ کەچ ئەکەن، ئەگەریش گوێبیسـتی کەسـێکی تر ببن، ئەوە میر و وەزیر و نێردراوی جێی متمانەی پادشـان و تەنیا وەفایان بۆ شـا هەیە. لە سـەردەمی ئێمەدا، نموونەی ئەم دوو شـێوە جیاوازە لە دەوڵەتداری و فەرمانڕەواییدا سوڵتانی تورک و پادشای فەڕانسەیە. بەڕێوەبردنی هەموو پادشایی تورک بەدەست سوڵتانە و هەموو ئەوانی تر لە خزمەت ئەمدان؛ ئەم وڵاتی ژێر دەسەڵاتی خۆی دابەش کردووە بەسەر پارێزگا و سنجاقەکاندا و هەر جارێک میر و مەزنێک بەسەریانەوە دادەنێ و هەر کات مەیلی لێ بێ دەیانگۆڕێ. بەڵام پادشای فەڕانسە وا نییە. ئەم ژمارەی زۆر ئاغا و دەرەبەگ و بارۆن لە دەوری کۆوە بووگن کە لە لایەن ڕایەتەکانی خۆیانەوە بە فەرمی دەناسرێن و ڕێزیان لێ دەگیردرێ. ئەمانە میراتگری ئەم جێگە و پێگە تایبەتانەن و ئەگەر شـا بیهەوێ لێیانی بستێنێتەوە، دەردیسەر و مەترسی بۆ خۆی دروست دەکات. ئەو کەسە کە چاو ببڕێتە هەرکام لەم دەوڵەتانە و بە تەمای داگیرکردنیان بێ، لە داگیرکردنی دەوڵەت تورکدا تووشـی تەنگ و چەڵەمە و بەرهەڵەسـتی توند دەبێتـەوە؛ بەڵام دوای داگیرکردن، بۆ ڕاگرتن و پاراسـتنی لەگەڵ گیر و گرفتی زۆر ڕووبەڕوو نابێتەوە؛ ڕێک بە پێچەوانەی ئەمەی تورکەوە، بە سـانایی پترەوە دەتوانرێ پادشایی فەڕانسە داگیر بکرێ، بـەڵام لە ڕاگرتن و پاراسـتنیدا لەگەڵ گەلێ گیر و گرفت و تەنـگ و چەڵمە ڕووبەڕوو دەبێتەوە.

٢ ئـەو هۆکارانە کە داگیرکردنی ئیمپراتۆریی تورک سـەخت دەکەنەوە پێکهاتوون لەوەی کە میر و والییەکانی ئیمپراتۆریی تورک بۆ داگیرکاری نە دەتوانن هێزی دەرەکی بانگهێشــت بکەن، نە بۆ بەئەنجامگەیاندنی پلانیان دەتوانن پشت بە ڕاپەڕینی ئەوانەی دەوروبەریان ببەستن؛ سەرچاوەی ئەمەش ئەو هۆیانەیە کە تاوێک بەر لەمە باس کران. هەروەتر چونکە هەموو وەزیر و خزمەتکارن و گوێبیســتی سوڵتانن، گەندەڵکردنەوە و کڕینیان بە بەرتیل و وادە و بەڵێن گەلێک دژوارە؛ ئەگەریش بکرێ، زۆر جێی هیوا نییە و کەڵکێ ئەوتۆیان نابێ و چیيان لێ ناوەشێتەوە. چونکە هەر بەو هۆیانە کە پێشتر باس کران، ئەمان توانای ئەوەیان نییە خەڵک لەگەڵ خۆ بخەن و بە شوێن خۆیاندا ڕایانکێشن. کاتێک کەسێک بڕیاری هێرشکردنە سەر ئیمپراتۆریی عوسمانی ئەدا پێویستە بیری لەوە کردبێتەوە کە لەگەڵ یەکگرتوویی تەواودا ڕووبەڕوو دەبێتەوە. کەوابوو ژیرانە ئەوەیە هیوا لەسەر ئەوە هەڵنەچنێ کە بە نانەوەی ئاژاوە لە ڕێگەی کەسانی ترەوە ئەو دەسەڵاتە لەق و لاواز بکا، بەڵکوو چاک وایە پشــت بە هێزی خۆی ببەستێ. بەڵام کاتێک لە مەیدانی شــەڕدا شکاندی و بەسەریدا ســەرکەوت، بە چەشنێک کە ئیتر نەتوانێ سەرلەنوێ سپا ساز بکاتەوە، ئەدی بێجگە لە تۆرەمەی پادشا نابێ لە کەس بترسێ. بۆ ڕەواندنەوەی ئەم ترسەش دەبێ بە تەواوی تۆرەمەی کوێر بکرێتەوە و خاشەبڕ بکرێ. ئەوسا هیچ شتێک نامێنێ ببێتە هۆی مەترسی و هەڕەشــە: چونکە کەسانێکی دیکە لەو پادشاییەدا نین کە خاوەن جێگە و پێگەی هێندە قایم و پتەو بن کە بتوانن مەترســی دروســت بکەن؛ هەر وەکچۆن سەرکەوتووی شەڕ پێشتر نەیدەتوانی پشتیان پێ ببەستێ، ئێستاش نابێ هێندە ترسی لێیان هەبێ.

٣ ئەو پادشاییانە کە وەک پادشایی فەڕانسە حکومڕانی دەکرێن، ڕەوتی ڕووداوەکان بە پێچەوانەیە؛ لەبەر ئەوەی کە هەمیشە وا ڕوو دەدات کە یەکێک لە بارۆن و ئاغاکانی ئەو پادشاییە ناڕازی بێ و تامەزرۆی گۆڕان و نوێگەریی سیاسی بێ. بۆیە دەبێتە ڕێخۆشکەر و ڕێنوێنی تۆ و دەتوانی بە ئاســانی بڕۆیتە ئەو وڵاتەوە. ئەم کەسانە، بەو هۆیانە کە باس

کران، دەرگای چوونە ژوورەوەی ئەو دەوڵەتەت بۆ دەخەنە ســەر پشت و ئاسانکاری بۆ ســەرکەوتنی تۆ دەکەن؛ بەڵام پاش سەرکەوتن، ئەگەر بتهەوێ دەوڵەتی ناوبراو ڕابگری و بیپارێــزی، هەم لەگەڵ ئەوانە کە یارمەتی تۆیان کردووە، هەم لەگەڵ ئەوانە کە ڕاژێری ژێر چەمەبەرت کردوون و ژینی ژێردەستی بەسەریاندا سەپاوە تووشی گیروگرفتی بێژمار دەبــی. لێرەدا بە کوژاندنەوەی یەکجاریی تۆرەمەی شــا ڕزگارت نابێ؛ چونکە بارۆن و ئاغاکان هەر هەن و سەرۆکایەتیی پێکهاتە و بزاڤی سیاسیی نوێ وە ئەستۆ دەگرن. تۆش نە ئەتوانی وەڵامی داواکانیان بدەیتەوە، نە ئەتوانی بە یەکجاری ڕەگ و ڕیشــەیان کوێر بکەیتــەوە؛ بۆیە هەر ئەوەنــدە کە هەل و دەرفەتی گونجاویان بۆ بڕەخســێ ڕادەپەڕن و وڵاتت لە دەست دەردێننەوە.

٤ ئێستا ئەگەر ئێوە تێبینیی ئەوە بکەن کە سروشت و پێکهاتەی پادشایی داریووش[1] چــۆن بووە و بە کام یەک لەم شــێوازانەی باس کــران فەرمانڕەوایی کــراوە، دەبینن کە چەشــنی ئیمپراتۆریی عوســمانی فەرمانڕەوایی کراوە و بەڕێوە چووە. بۆیە ئەسکەندەر دەبووا لە پێشدا بە هەموو جۆرێک پەلاماری بدا و وەها لە مەیدانی شەڕدا تێکی شکێنێ و ســپای تەفر و توونا بکا، بە هیچ کلۆجێک نەتوانێ خۆی کۆ بکاتەوە و هەســتێتەوە.[2] پــاش ســەرکەوتن و دوای مەرگی داریووش، ئەســکەندەر لە ئاســایش و ئارامیدا لەو وڵاتــەدا جێگیر بوو. ئەگــەر جێگرەوەکان یەکگرتوو و هاوپەیمان ببــان، دەیانتوانی لە ئاســایش و ئارامیدا ڕایبوێرن و بێ گێرە و کێشە بەسەر ئەو وڵاتەدا ڕابگەن؛ چونکە هیچ شەڕ و ئاژاوەیەک سەری هەڵنەدا؛ ئەوەی کە بووە گێرە و کێشە و ئاژاوە ململانێ و شەڕ و کێشەکانی نێوان خۆیان بوو. بە پێچەوانەوە دەستبەسەرداگرتن و پاراستنی وڵاتێک کە

١. مەبەست داریووشی سێهەم، دوایین پادشای هەخامەنشیەکانە، کە لە پارسا لە ساڵی ٣٣٥ پـ. ز.، لە سەر تەختی شایی بووە؛ لە شــەڕی ئیسۆ (لە ساڵی ٣٣٣) و شــەڕی ئەربیل (٣٣١) لەگەڵ ئەسکەندەر مەکدۆنی شکا و هەڵات؛ لە ئاکامدا لە ساڵی (٣٣٠) بە دەست یەک لە پیاوانی خۆی کوژرا. ئـ. نی. ئی.

٢. داریووش پاش شکان هەڵاتبوو بۆ مێدیا و وڵاتی ماد، بەو هیوایە کە سپا ساز بکاتەوە، بۆ هەستانەوە و بەرەنگاری. ئـ. نی. ئی.

وەک فەڕانسە ڕێکخراو و دامەزراوە، بەم جۆرەی باس کرا، سانا نییە و دوای داگیرکردنی ناتوانی لە ئاسایش و ئارامیدا تێیدا بحەسێیتەوە: هەر بەم هۆیەوە بوو کە زۆرێک لە ڕاپەڕینەکان دژی ڕۆمییەکان لە ئیسپانیا، فەڕانسە و یۆناندا سەریان هەڵدەدا. هۆکاری سەرەکیی ئەم ڕاپەڕینانە فرەیی سەرۆک و میر و ئاغاکانی ئەم وڵاتانە بوون. تا کاتێک بیرەوەریی سەرۆک و مەزنەکانیان لە بیرگەدا زیندوو بوو، دەسەڵاتی ناوەند لە ڕۆما لە خاوەندارێتیی خۆی لەم وڵاتانەدا دڵنیا نەبوو و هەمیشە بە دڕدۆنگییەوە بۆیانی دەنواڕی. بەڵام لە درێژماوەدا، کە بە هێزی دەسەڵاتی داپڵۆسێنەرانە یاد و بیری ئەوانەی بە یەکجاری کوێر دەکردەوە و ئاسەواریانی دەسڕیەوە، بە تەواوی چنگی دەگرت بەسەریاندا و دەبووە خاوەنیان؛ ئەوسا دڵنیایی جێگەی دڕدۆنگیی دەگرتەوە. هەڵبەت ئەمانیش دواتر تووشی شەڕ و ئاژاوەی نێوخۆیی بوون و هەر کەسێ بەپێی ئەو جێگە و پێگە و دەسەڵاتە کە لە هەرێمەکاندا هەیبوو هەوڵی ئەدا دانیشتووان بۆ ڕاپەڕین لەگەڵ خۆی بخات. بەڵام چونکە خوێنی سەرۆک و مەزنانی کەڤنار لە جمان کەوتبوو و سەرچاوەکەی بە تەواوی کوێر ببۆوە، دانیشتووانی ئەو هەرێمانە تەنیا دەسەڵاتی ڕۆمییەکانیان بە فەرمی دەناسی و ملکەچی ئەمان بوون. کەوابوو، بە لەبەرچاوگرتن و ڕاڤەکردنی گشت ئەم ڕوانگە و ڕاوێژانە دەردەکەوێ کە نە ڕاگرتن و پاراستنی دەوڵەتانی ئاسیایی لە لایەن ئەسکەندەرەوە بە ئاسانی، نە ئاستەنگی و دژوارییەکانی پیرڕۆ[1] و زۆر سەرکردەی تر بۆ ڕاگرتن و پاراستنی دەستکەوتەکانیان جێی سەرسووڕمانە؛ چونکە سەرچاوەی ئەمانە هەڤیازی، ژیری و لێهاتوویی یان لێنەهاتوویی و نەزانیی سەرکەوتووان نەبووە، بەڵکوو جیاوازی و هەڤ یەک نەبوونی بارودۆخ و هەلومەرجەکان بووگن.

---

١. Pirro، پیرڕۆ: پادشای ئیپیرۆ Epiro، لە ساڵی (٣٠٧ تا ٣٠٣)؛ لە (٢٩٧ تا ٢٧٢ پ.ز.) لە ئیپیرۆ [ناوچەیەکی جوگرافی لە باشووری ڕۆژهەڵاتی ئورووپا، بەشێ لە ئاڵبانی و یۆنانی ئەمڕۆ]. پیرڕۆ بۆ ماوەیەکی کورت بەشێک لە مەکدۆنیا و تێساڵیای داگیر کرد، پاشان لە باشووری ئیتالیا و سپارتدا دژی ڕۆمییەکان شەڕی هەڵگیرسان، بەڵام مایەپووچ دەرچوو و هیچ سەرکەوتنێکی بەدەست نەهێنا. ئـ.ئی.ئی.

## ٥. ئەو شــار و پادشــایانە کە پێش داگیرکردن بەپێی داب و دەســتووری خۆیان ژیاون بە چ شێوازێک دەبێ فەرمانڕەوایی بکرێن؟

١ هەروەک باســم کرد ئەو دەوڵەتانە کە لەگەڵ داب و دەســتووری خۆیان و ژیانی ئازادانە ڕاهاتوون، کاتێک داگیر دەکرێن، ئەگەر بتەوێ لە بن دەســتی خۆتدا ڕایانگری و بیانپارێزی، سێ ڕێگەت لە بەر دەمدایە: یەکەم وێرانی بکەی؛ دووهەم بۆخۆت بڕۆی لەوێ نیشتەجێ ببی؛ ســێهەم دەســەڵاتی تاقمێکی بژاردەی[1] تێدا سەقامگیر بکەی بۆ ئەوەی فەرمانڕەوایی بکەن و دۆســتایەتیی ئەو وڵاتە بۆ تۆ دەســتەبەر بکەن و لێگەڕێی بەپێی داب و دستووری خۆیان بژین و پیتاکی لە سەر دابنێی. ئەم حکومەتە کە لە لایەن شالیارێکەوە دامەزراوە و ســەقامی گرتووە دەزانێ کە بێ دۆستایەتی و ویستی ئەو خۆ ڕاناگرێ، هەر بۆیە هەموو هەوڵێکی دەخاتە گەڕ بۆ ڕاگرتنی دۆستایەتیی ئەو شالیارە کە دایمەزرانــدووە؛ بۆ ئەوەی کە ناچار نەبی ئەو شــارانە کە بە ژیانی ئازاد ڕاهاتوون وێران بکــەی و هاوکات لە بن دەســتی خۆتدا ڕایانگری، چاکترین ڕێگــە ئەوەیە یارمەتی و هاوکاری لە هاووڵاتییان و دانیشتووانی وەرگری.

٢ لەم بوارەوە دەکرێ ئاوڕ لە نموونەی ڕۆمییەکان و سپارتەکان بدەینەوە. سپارتەکان

---

١. دەسەڵاتی تاقمی بژاردە: مەبەست دەسەڵات و حکومەتی ئولیگارشیە.

ئاتــن[١] و تێبێ[٢]یان داگیر کــرد و دەوڵەتی تاقمــی بژاردەیان تێــدا دامەزراندن. کەچی ســەرەڕای ئەمەش فرەی پێ نەچوو لە دەســتیان دانەوە. ڕۆمییەکان بــۆ ئەوەی کاپووا، کارتاجینێ و نوومانزیا[٣] لە بندەست خۆیاندا ڕابگرن وێرانیان کردن؛ بەم جۆرە توانیان لە بندەســت خۆیاندا ڕایانگرن و لە دەستیان نەدەنەوە. بۆ پاراستن و ڕاگرتنی یۆنان دەکرێ بێژین هەروەک سپارتەکانیان کرد: دەســتیان لە داب و دەستووری وەرنەدا و بە ئازادی هێشــتیانەوە. بەڵام بۆ ڕاگرتن و پاراستنی لە بندەســت خۆیاندا پلانەکەیان سەرکەوتوو نەبوو و گەلێک جار ناچار بوون شــارەکانی ئەو وڵاتە خاپوور بکەن. چونکە لە ڕاستیدا بۆ ڕاگرتن و پاراستنی شار یان وڵاتێکی داگیرکراو لە بندەست خۆتدا، هیچ ڕێگەیەک لە تەفر و توونا کردن و وێرانکردنی باشتر نییە. ئەو کەسە کە شارێک داگیر دەکا کە لەگەڵ ژیانــی ئازاد ڕاهاتووە، ئەگەر وێرانی نەکا ئــەوە چاوەڕێ دەبێ کە خۆیان کاولی بکەن. چونکە ئەوان هەمیشــە بە ناوی ژیانی ئازادەوە، بە ناوی داب و دەستووری لەمێژینەوە، کە نە تێپەڕبوونی زەمان و نە ئەو خزمەتانە کە پێیان دەکرێ دەتوانن ئاسەواریان بسڕنەوە و لە بیریانی ببەنەوە، ڕادەپەڕان و لە پێناو ئازادی لەدەســتچوویاندا دەجەنگن. ئەگەر لە بەر یەک هەڵنەوەشــێندرێنەوە و پەرتەوازە و پەخش و بڵاو نەکرێنەوە، یان تەفر و توونا و پاکتــاو نەکرێن هەر کارێک بکرێت هەر دوورنواڕی و تەگبیرێ لەبەرچاو بگیردرێ، دانیشــتووانی ئەو دەڤەر و وڵاتانە هیچکات ناو و نیشــانی کەڤنارانــی خۆیان و داب و دەستووریان لە بیر ناکەن و هەر کە هەل و بوارێ لە باریان بۆ بڕەخسێ ڕادەپەڕن. ڕێک وەک خەڵکی پیســا[٤] کە دوای سەد ساڵ لە بندەســتی فیرێنزێ ڕاپەڕین و دەستیان دایە

---

١. ئاتێن: لە ســاڵی ٤٠٤ پــز.دا، ســپارت دەسەڵاتی «سی ملهوڕی» سەپاند بە ســەر نەیاری شکستخواردوودا [لە شەڕی پێلوپونێس]، بەڵام هەموو یەک ساڵ عومری نەبوو. ئـ.ئی.ئی.

2. Tebe

٣. کاپووا، Capua، کارتاجینێ، Cartagine، نوومانزیا، Numanzia: کارتاجینێ و نوومانزیا [لە ئیسپانیا] وێران کرابوون و لەگەڵ خاک یەکســان ببوون؛ کاپووا [لە ئیتالیا] هەموو پێگەیشتووانی شار قەڵاچۆ کرابوون و هەموو دارایی و سامانیان دەســتی بە ســەردا گیرابوو، هەموو ســەربەخۆییەکی لێ زەوت کرابوو، بەڵام شــار کاول نەکرابوو. تیتو لیڤیۆ لە ١٦،٢٤دا دەبێژێ: «بۆ ئەوە کە خاکی جوتیاران بوو». ئـ.ئی.ڤ.

٤. Pisa، لە ســاڵی ١٤٠٦ لە ژێر دەســەڵاتی فیرێنزێدا بوو، لە ١٤٩٤ هاتنی کارلۆی هەشــتەم بۆ ئیتالیا دەقۆزێتەوە و دژی

چەک و بۆ بەدەستهێنانەوەی سەربەستیی خۆیان شەڕیان کرد.

٣ بەڵام کاتێک شارێک یان وڵاتێ کە لەگەڵ ژین لە ژێر دەستی شالیارێدا ڕاهاتووە کە تۆرەمەی کوێر بۆتەوە و خوێنی لە جمان کەوتووە، دانیشتووانی، لە لایەک بە ژینی ژێردەستی ڕاهاتوون، لە لایەکی ترەوە لە نەبوونی شالیارێ کەڤناردا ناتوانن لە سەر دانانی یەکێکی تر پێکەوە ڕێک کەون و مەزنێ لۆ خۆیان هەڵبژێرن، ئەمانە ژیانی ئازادیان ئەزموون نەکردووە و تامی ئازاد ژیانیان نەچێشتووە[1]؛ بۆیە دژوارە دەست بدەنە چەک و ڕاپەڕن. هەر بۆیە شالیاری داگیرکەر بە سانایی دەتوانێ بیانکاتە ژێردەستەی خۆی و بە زۆر گوێرایەڵیان بکا و وەها دەستەمۆیان بکا کە مەترسیی بۆ دروست نەکەن. بەڵام لە کۆمارەکاندا، هێز و وزەی ژیار و ژیان گەلێک زۆرترە، هەر بۆیە تامەزرۆیی و ڕقی تۆڵەئەستاندنەوەش لە هەمبەر هێزی زاڵم و داگیرکەر زۆر زۆر بە زەبر و تەوژمترە؛ چونکە نە لێگەڕاوە، نە لێدەگەڕێ بیری ئازادیی لەدەسچوو و لەمێژینە لە بیر بچێتەوە. بۆیە دڵنیاترین چارە ئەوەیە یان بە یەکجاری ڕەگ و ڕیشەی دەربێری و ئاسەواری نەهێڵێ، یان ئەوەی کە بڕۆی بنکە و بارەگای خۆتی تێدا دامەزرێنێ و لەوێ جێگیر ببی.

داگیرکەرانی ڕادەپەڕێ. بەڵام دوای شەڕێکی درێژخایەن لە ساڵی ١٥٠٩ داپڵۆسرا و سەرکوت کرایەوە. ماکیاڤێلی ئەوکات سکرتێری کۆماری فیرێنزێ بووە و وزەی زۆری بۆ داپڵۆسان و سەرکوتکردنی ڕاپەڕیوان و داگیرکردنەوەی پیسا تەرخان کردبوو. ئـ ئی. ئی.

١. «گەلێ کە بە ژینی ژێردەستی سەرۆکێ ڕاهاتووە و دواتر بە هۆی هەندێ ڕووداو ئازادیی بە دەست هێناوە، وەکچۆن ڕۆما دوای ڕاوانانی تراکوینییەکان بە دەستی هێنابوو، ئەو نموونە بێژمارانە کە لە مێژووە کۆنەکاندا دەیانخوێنینەوە پێمانی دەسەلمێنن کە بۆ پاراستنی ئازادیی خۆی لەگەڵ چ دژواری و گیر و گرفتێ ڕووبەڕووە.» دیسکۆرسەکان ١.١.١٦.

## ٦. سـەبارەت بەو پادشـاییە نوێیانە کە لە ڕێگای سپای خۆیی و بە هۆی ژیری و ژیهاتووییەوە بە دەست دەهێنرێن

١ ئەگەر ئێستا دەپەرژێمە سەر باسی پادشایی بە تەواوی نوێ و باسی زنجیرە پادشایی و دەوڵەت بەپێی دەستووری بنەڕەتی دەکەم و لەم بوارەوە نموونەی گەلێ هێژا دەهێنمەوە، نابێ تووشـی سەرسـوورمان ببن. دەکرێ بێژین کە مرۆڤ لـە کار و چالاکیی خۆیدا هەمیشە هەر بەو ڕێگایانەدا دەڕوا کە ئەوانی تر تەخت و خۆشیان کردووە و لاسایی ئەوان دەکاتـەوە. کەچی نە دەتوانن بە تەواوی ڕێبازی ئەوان بپارێزن، نە لە لاسـاییکردنەوەدا دەتوانن بگەن بە هێژایی و شـکۆداریی ئەوان. بۆیە پیاوی ژیر و زانا دەبێ ئەو ڕێگایانە بگرێتە بەر کە مرۆڤە بلیمەتەکان خۆشیان کردوون و لاسایی هەرە بلیمەتەکان بکاتەوە. بە جۆرێک کە ئەگەر نەتوانێ بگاتە ئاستی ئەوان، لانیکەم هەندێک بۆن و بەرامەی ئەوانی لـێ بەرز ببێتەوە. لەم بـوارەوە دەبێ وەکوو کەوانگیرە لێهاتـوو و دوورنوارەکان بکەی. ئەمان کاتێک لەو بڕوایەدان کە ئەو شـوێنەی کردوویانە نیشانە و مەبەستیان پێکانیەتی زۆر دوورە، چونکە هێز و برسـتی کەوانی خۆیان دەناسن، شوێنێ گەلێ بەرزتر لەوەی جێی مەبەست دەکەنە نیشانە. هەڵبەت ئەمە بۆ ئەوە نییە کە تیری کەوانیان بگاتە شوێنێ فرە بەرزتر، بەڵکوو بە هیوان بە یارمەتیی بەرزە ئەنگاوتی شوێنی جێی مەبەست بپێکن.

٢ جا بۆیە ئەز دەبێژم کە لە پادشایی تەواو نوێدا، کە شالیاری نوێ بەسەری ڕادەگات،

ڕادەی گیر و گرفتەکان و ڕاگرتن و پاراستنی پێوەندیی بە ڕادەی لێهاتوویی و ژیریی شالیاری نوێوە هەیە. چونکە وەها ڕووداوێک، واتە لە هاووڵاتیی ئاسایەوە بوون بە شالیار، پێویستی بەوەیە کە یان دەبێ ژیر و ژێهاتوو بی یان یاری بەخت ڕووی لە تۆ کردبێ. چما هەرکام لەم دووانە بەش بە حاڵی خۆیان پێش بە گیر و گرفتی زۆر دەگرن. هەڵبەت ئەوەی کەمتر پشتی بە یاری بەخت بەستووە، قورس و قایمتر و درێژخایەنتر خۆی پاراستووە. کاتێک کەسێ تازە دەبێ بە شالیار و دەوڵەت و دەسەڵاتی دیکەی، بێجگە لەوەی ئێستا دەستی خستووە نییە، ئاسانترین ڕێگەی بۆ ڕاگرتن و پاراستنی پادشایی نوێ ئەوەیە بۆخۆی بڕوا لەوێ نیشتەجێ بێ.

٣ ئێستا بۆ ئاخافتن لەوانەی بە هۆی ژیری و ژێهاتیی خۆیانەوە بووگن بە شالیار نەک بە هۆی یاری بەختەوە، باسی نموونە فرە هێژاکان دەکەم و دەبێژم کە ئەمانە بووگن: مووسا، کورش، ڕۆمولۆ و تێسێئۆ و کەسانی وەک ئەمان[١]. ئەگەرچی نابێ سەبارەت بە مووسا بێنە ڕامان و لێکدانەوە، چونکە ئەم تەنیا بەڕێوەبەری ئەو فەرمانانە بووە کە خودا فەرمانی پێ دەدا. بەڵام سەرەڕای ئەمەش، لەبەر ئەو ژیری و ژێهاتییانە کە وایان پێکردبوو خودا بە شیاوی ئەوەی بزانێ لەگەڵی بێتە ئاخافتن، هەر دەبێ ڕێزی لێ بگیرێ و ستایش بکرێ. بەڵام با بێینە ڕامان لەمەڕ کورش و ئەوانی دی کە یان دەستیان گرتووە بە سەر پادشاییدا و داگیریان کردوون، یان بنیادنەر و دامەزرێنەریان بووگن؛ ئەوسا بۆمان دەردەکەێ بۆچی ئەوەندە جێگای ڕێز و ستایشی هەمووانن. ئەگەر لەمەڕ کار و کردار، فەرمان و دەستوورە تایبەتییەکانی ئەمانە بێینە ڕامان و ڕاڤەیان بکەین، پێدەچێ لەگەڵ ئەوانەی مووسا، کە

---

١. ماکیاڤێلی بۆ هێنانەوەی «نموونە فرە هێژاکان» ئاوڕ لەم کەسێیانە دەداتەوە کە بۆ یەکخستنی گەلی خۆیان و دامەزراندنی دەوڵەتێکی نوێ کاریان کردووە، بێ ئەوەی کە خۆی لە پرسی مێژوویەتی بوونی ئەوان بدا: مووسا وەک قانووندانەرێ کە جووەکانی لە کۆیلەتیی میسرییەکان ڕزگار کردووە. گریمانە ئەوە دەکرێ ئەم ڕووداوە هەشتسەد ساڵ پ.ز. بووبێ. تەورات ئەم ڕاسپاردەی مووسای بە وردی گێڕاوەتەوە؛ کورش وەک ڕزگارکەری پارسەکان لە ژێردەستی مادەکان و بنیادنەری ئیمپراتورییەکی نوێ لە شەشی پ.ز.، هێرودۆت ئەم ڕووداوانەی گێڕاوەتەوە؛ تێسێئۆ، Teseo، قارەمانی مێتۆلۆژیی کوڕی ئێژە کە دەبێ دێهاتەکانی ئاتیکی یەکخستبێ و شاری ئاتێنی بنیاد نابێ (ڕەنگە لە سەدەی حەوتی پ.ز.، پلوتارک چیرۆکی ئەمی گێڕاوەتەوە، ئەمە هاوزەمانێ بووە، هەر بەپێی نووسراوەکانی پلوتارک. لەگەڵ بنیادنانی شاری ڕۆما لە لایەن ڕۆمولۆوە لە سەدەی هەشتی پ.ز.، دە کتێبی یەکەمی تیتو لیڤیو لێرەوە دەست پێ دەکات. ئـ نی. ف.

ئامـۆژگار و ڕێنوێنی هێنده مەزنی بووە، جیاوازییـان نەبێ. بە لێکدانەوەی کار و کردار و ژیانـی ئەمان بەو ئاکامە دەگەین کە بەخت هەر ئەوەندە یاریان بووە کە هەل و بوار و ماک و زەمینەی بۆ ڕەخسـاندوون بۆ ئەوەی فۆرم بەو دامەزراوانە بدەن کە ویستوویانە و توانیویانە قایم، پایەدار و سەقامگیریان بکەن. بە دڵنیاییەوە بەبێ ئەو بوار و هەلانە، هێژایی و هەڤیازیـی گیانی ئەوان دەکوژایەوە، هەروەها بەبێ ئەم کەسـێتی و گیانانە ئەو بوار و هەلانە بێهوودە هەڵدەکەوتن.

٤ هــەر بۆیە مووسـا دەبوو گەلی ئیسرائیـل بدۆزێتەوە کە بە دەسـت زوڵم و زۆر و چەوسـانەوەی میسرییەکانـەوە وە زاڵە هاتبوون و بۆ ڕزگاری لــە کۆیلەتی ئامادە بوون شوێنی کەون. ڕۆمولۆ بەرژەوەندیی لەوەدا بوو کە لە ئالبا[1] شوێنی گونجاو نەدۆزێتەوە و بخرێتە نێو قرتالێ و بدرێتە دەم ئاڤەوە[2]، بۆ ئەوەی کە ببێتە پادشای ڕۆما و دامەزرێنەری ئەو نیشتمانە. بۆ کورش پێویسـت بوو کە بکەوێ بە سەر ئەو گازندە و ناڕەزایەتییانە کە پارسـەکان لە ئیمپراتۆریی مادەکان بوویان و تووشی مادەکان ببێ کە بە هۆی ئاشتی و ئاسایشـی درێژخایەنەوە لاواز و ژنانی ببوونەوە.[3] تێسێئۆ ئەگەر تووشی پەرژ و بڵاوی و لەتوپەتبوونی یۆنانییەکان نەبووا، نەیدەتوانی بلیمەتیی خۆی بنوێنێ. ئەم هەل و بوارە لەبار و گونجاوانە بوونە هۆی شـان و شـکۆ و بەختیاریی ئەم پیاوانە؛ بلیمەتیی ئەوانیش بووە هۆی ئەوەی کە ئەم بوار و هەلانە بناسـن و بیانقۆزنـەوە؛ بە جۆرێک کە تاجی فەخر و شانازییان لەسەر نیشتمانی خۆیان دانا و بوونە هۆی شکۆ و ڕازیبوون و خۆشگوزەرانیی هاونیشتمانییانیان.

---

١. Alba یا Alba Lunga، ناوی شارێکی لەمێژینەیە لە ناوەندی ئیتالیا و نزیک ڕۆما هەڵکەوتووە.

٢. ئەم بەسـەرهاتە لیڤیو گێڕاویەتیـەوە؛ ڕۆمۆلۆ و ڕێمۆ، کوڕی ڕێا سـیلڤیا و نەوەی نوومیتۆر، بە فەرمانی مامیان ئامولیۆ [Amulio]، کە تەپی دابووە سـەر تەختی شـایی و داگیری کردبوو، درابوون بە دەم ئاڤی تێڤێرێ [Tevere]ـەوە. ئـ ئی. بەپێی ئەم دیرۆک و ئەفسانەیە ڕۆمۆلۆ و ڕیمۆ بنیادنەر و دامەزرێنەری شاری ڕۆمان.

٣. لاواز و ژنانی؛ ڕەنگە ماکیاڤێلی ئیلهامی لە *پەروەردەی کورش*، لە نووسینی گەزنفون وەرگرتبێ. گەزنفون لە پەڕاوەکەیدا بە وردی دەپەرژێتە سـەر ژیانی سـادە و ساکار و خاکەسارانەی پارسـەکان و، ژینی پڕ لە عەیش و نۆش و شاهانەی ماڵی خاڵۆی کورش، واتە پادشاکانی ماد.

٥ ئەوانە کە لە ڕێگە و بواری هەڵموووت و سەختی لە چەشنی ئەوەی ئەمانەوە دەبن بە شالیار، بە ڕەنج و دژواریی زۆرەوە پادشایی وەدەست دێنن، بەڵام بە ئاسانی ڕایدەگرن و دەیپارێزن؛ بەشێک لەو گیر و گرفت و دژوارییانە کە لە کاتی داگیرکردندا شالیار لەگەڵیان ڕووبەڕووە، لەمەوە سەرچاوە دەگرن کە ئەوان لە پێناو دامەزراندن و بنیادنانی دەوڵەتی خۆیان و پاراستنی لە دەست خۆیاندا، ناچارن دەست بدەنە دانان و سەپاندنی دەستووری نوێ و داموودەزگای نوێ سەقامگیر بکەن. پێویستە سەرنجی ئەوە بدرێ کە نە داگیرکردن و نە دڕدۆنگی لە سەرکەوتندا هیچکامەیان هێندەی سەرکردایەتیکردنی چەسپاندن و سەقامگیرکردنی داب و دەستووری نوێ دژوار و پڕئاستەنگ نین. چونکە هەموو ئەوانە کە لەگەڵ داب و دەستووری کۆندا کۆک بووگن و بەرژەوەندییان لەگەڵ دامەزراوە کۆنەکەدایە، دەبنە دوژمنی ئەوەی کە سەرکردایەتیی چەسپاندنی داب و دەستووری نوێ دەکا؛ ئەوانەش بەرژەوەندییان لەگەڵ داب و دەستووری نوێدایە، هەموو بە گەرموگوڕی بەرگریی لێ ناکەن. سەرچاوەی بەشێک لە ئەم ساردوسڕی و مینگەمینگ کردنە لە بەرگریکردندا، ترس و لەرزە لە هەمبەر نەیارانێک کە بە قانوون پشتئەستوورن، بەشێکی تری لە بێبڕوایی مرۆڤەوە سەرچاوە دەگرێ، کە هەتا باش لە قورس و قایمیی دامەزراوەی نوێ دڵنیا نەبێ و ئەزموونی نەکا، ئیمانی پێ ناهێنێ و باوەڕ بە دروستی و پایەداربوونی ناکات. هەر بۆیە گەلێ جار وا پێش دێ کە ئەوانەی دوژمنی دامەزراوەی نوێن، بوار و دەرفەت دەقۆزنەوە و بەوپەڕی توندوتیژییەوە پەلاماری دەدەن و زەبری خۆیانی لێ دەوەشێنن؛ ئەوانەش کە دەبێ بەرگریی لێ بکەن نابەدڵ و ڕاڕایین، هەر بۆیە خۆیان و سەرکردەیان دەشکێن و دەکەونە مەترسیی گەورەوە.

٦ ئێستا ئەگەر بمانەوێ باش ئەم باسە ڕاڤە بکەین، دەبێ لەوە بکۆڵینەوە کە ئاخۆ ئەوانە کە بە تەمای نوێگەری و دامەزراندنی داب و دەستووری نوێن، پشتیان بە هێزی خۆیان بەستووە یان پاڵیان بە کەسانی ترەوە داوە. دەمەوێ بێژم: ئاخۆ بۆ جێبەجێکردن و پێشبردنی پلانەکەیان دەبێ بپاڕێنەوە و دەستەوداوێنی کەسانی تر بن یان دەتوانن بە

هێزی خۆیان ئەو داب و دەســتووره کە مەبەستییانە بیچەسپێنن و سەقامگیری بکەن. لە حاڵەتی یەکەمدا، هەمیشە نەهاتی دەهێنن و سەرکەوتنێ بەرچاو وەدەست ناهێنن؛ بەڵام کاتێک پشتیان بە هێزی خۆیانەوە بەســتبێ دەتوانن بە زۆر پلانی خۆیان ببەنە پێشەوە، ئەوســا فرە بە دەگمەن تووشــی شــکان و گلان دەبن. ڕێک هەر ئا لــەم بۆچوونەوەیە کە هەموو پێغەمبەرانی چەکدار و زۆردار ســەرکەوتوو بــوون و هەموو بێ چەک و بێ زۆرەکان شــکاون[1]. چونکە، بێجگە لەو شتانە کە باس کران، سروشتی گەلان و خەڵک دەگۆڕدرێ؛ بە ئاسانی دەکرێ سەبارەت بە شتێک ڕازییان بکەی، بەڵام ڕاگرتنیان لەسەر ئەو باوەڕە گەلێک دژوارە: بۆیە پێویســتە ئامــادە و تەیار بیت کە کاتێک ئیتر باوەڕیان نامێنێ، بتوانی بە زۆر باوەڕیان پێ بێنیتەوە. ئەگەر مووســا، کورش، تێسێئۆ و ڕۆمولۆ بێ زۆر و بێ چەک بــوان، بە دڵنیاییەوە نەیاندەتوانی درێژخایەن پارێزەر و چاودێری ئەو دەستوورە بن کە خۆیان بناخەیان دانابوو یان داهێنەر و دامەزرێنەریان بیوون. وەکچۆن لە ڕۆژگاری خۆماندا شایەتی بەسەرهاتی قەشە جیرولامۆ ساڤۆنارۆلا[2] بووین. ئەو کەسە کە ئەو داب و دەستوور و دامودەزگایەی بنیاتی نابوو لە بەریەک هەڵوەشایەوە و زۆرێک لە پەیڕەوانی لێی هەڵگەڕانەوە و باوەڕیان پێی نەما، ئەویش هیچی بە دەســتەوە نەبوو بۆ ئەوەی نەهێڵێ ئەوانە کە باوەڕیان پێی هێنابوو لێی پاشگەز نەبنەوە و هێزی ئەوەشی نەبوو بڕوا بە بێباوەڕان بێنێ. ئەم کەسانە لە پێشڕەوییەکانی خۆیاندا لەگەڵ گەلێک ئاستەنگ و گیر و گرفت ڕووبەڕوو دەبنەوە و لەم ڕێگەیەدا زۆر مەترســی هەڕەشەیان لێ دەکا و بۆ زاڵبوون بە سەریاندا پێویستیان بە لێزانی، ژیرڤانی و هێژایی زۆر هەیە؛ بەڵام دوای زاڵبوون

---

١. پێغەمبەرانی چەکدار و زۆردار؛ مەبەست ئەو کەسانەیە کە بە هێزی سپای خۆیان پشتەستوورن.

٢. Girolamo Savonarola، لــە ١٤٥٢ لە فێرڕارا لە دایک بووە. لە ١٤٧٥ چووەتە ڕیزی پەیڕەوانی ســان دومێنیکۆ-وە؛ یەکەم جار لە ســاڵی ١٤٨٢دا دەڕواتە فیرێنزێ و، لە ١٤٩٠ دەســت دەکات بە خوێندنەوەی کتێب بۆ خەڵک و گوتاریان پێشکەش دەکات. کاریگەریی بەهێز لە سەر ژیانی ڕۆحانیی دانیشتووانی ئەو شارە دادەنێ، بە تایبەتی دوای دەرپەڕاندنی زنجیرە پادشــای ئەو میرنشــینە بە ناوی مێدیچی؛ لە ١٤٩٢. پشــتیوانی بێ هەدادان و کۆڵنەدەری نوێکردنەوەی کلیــا و دژەبەری پاپا ئەلێکســاندری شەشەم بووە. لە ئاکامدا، پاپا توانی لە ڕێگەی دەسەڵاتدارانی فیرێنزێوە قۆڵبەستی بکات. لە هاوینی ١٤٩٨دا سزای خنکاندن و سووتاندنی بۆ دەرچووە. ئـ.ئی.ئی.

و لەنێوبردنی ئەوانە کە بەخێڵی بە باڵادەستیان دەبەن، بە زۆرداری دەمێننەوە و، ئەرخەیان لە جێگە و پێگەی خۆیان، شکۆدارانە بەردەوام دەبن.

٧ دوای ئەم نموونە مەزنانە ئێستا دەخوازم نموونەیەکی بچووک بێنمەوە. ئەگەرچی بچووکە، بەڵام شان لە شانی ئەمانە دەدا و هاوسەنگیانە؛ هەروەها بۆ شیکردنەوەی گشت نموونە هاوچەشنەکان تەنیا ئاماژەکردن بۆ ئەمە بە تەواو دەزانم. ئەمەش نموونەی جێرۆنیی[1] دووهەم سیراکۆسی-یە. ئەو کەسەی لە شارۆمەندێ ئاساییەوە ببوو بە شالیاری سیراکووس. ئەوەندەی کە پێوەندیی بە یاری بەختەوە هەبێ، جێرۆنی دەبوو ئەو دەرفەت و هەلەی بۆی ڕەخسابوو بناسێ و لە دەستی نەدا؛ ئەویش ئەوە بوو کە سیراکووسییەکان لە ژێر زوڵم و زۆردا بوون و ژینی ژێردەستی و چەوسانەوە بێزاری کردبوون. بۆیە ئەمیان وەکوو کاپیتانی خۆیان هەڵبژاردبوو، ئەمیش سەلماندبووی کە شایانی ئەمەیە و شالیاری هەر لە خۆی دەوەشێتەوە. جێرۆنی کاتێک هاووڵاتییەکی ئاسایی بوو گەلێک خۆشبەخت و بەخت یاری بوو؛ بە جۆرێک کە ئەوانەی سەبارەت بە ئەو نووسیویانە دەبێژن: ئەو بۆ تاج لەسەرنان و دانیشتن لە سەر تەختی شایی بێجگە لە سەرناوی شالیاری هیچی کەم نەبوو. جێرۆنێ هێز و سپای کۆنی تەفر و توونا کردبوو و هی نوێی دامەزراندبوو؛ وازی لە دۆستایەتیی کۆن هێنابوو و دۆستانی نوێی گرتبوو؛ چونکە دۆست و سپای نوێی هەبوو، توانیبووی لە سەر ئەم بناغە بنیادی هەموو دامەزراوەکانی دابنێ و بەرزیان بکاتەوە. هەڵبەت لە وەدەستهێنان و دامەزران و سەقامگیریدا زۆر ماندوو ببوو و گەلێک ڕەنجی کێشابوو؛ بەڵام بۆ ڕاگرتن و پاراستن ئەو دژواری و دەردیسەرانەی نەببوو.

---

١. Gerone II، لە ساڵی ٢٧٥ پ.ز.، سپاسالاری سیراکووس، Siracusa، بووە و لە ٢٦٥ بووەتە حاکمی ملهوڕی ئەو مەڵبەندە؛ لە پێشدا هاوپەیمانی کارتاجێنییەکان بوو و پاشان بایداوەتەوە بۆ لای ڕۆمییەکان. ئـ.ئی.ئی.

## ٧. سەبارەت بەو پادشاییە نوێیانە کە بە هۆی یاری بەخت و سپای کەسانی ترەوە وەدەست دەهێنرێن

١ ئەوانە کە تەنیا بە هۆی یاری بەختەوە لە هاوولاتیی ئاسـاییەوە دەبن بە شـالیار، بۆ گەیشتن بەم پلە و پایەیە هێندە ماندوو نابن و ڕەنجی زۆر ناکێشن، بەڵام گیر و گرفتەکان کاتێک دەسـت پێ ئەکەن کە لە ترۆپکدا دانیشتوون. ئەوان لە ڕێگەی گەیشتن بە ئەم شـوێنەدا تووشـی ئاسـتەنگ و گرفت نابنەوە، چونکە فڕیون و بە فڕینەوە بەم پێگەیە گەیشـتوون. گیر و گرفتەکان ئەوکاتە سـەر هەڵدەدەن کە لە سـەر کورسیی دەسەڵات دانیشـتوون. ئەم گیر و گرفتانە کاتێک خۆ دەنوێنن کە دەسـەڵاتی دەوڵەتێک بە هۆی دراوەوە یان لە لایەن بەخشـندەی دەسـت و دڵ ئاوەڵاوە دەدرێتە کەسێک. وەکچۆن ڕووی دەدا کە داریووش[1] لە شارەکانی یۆنان، یۆنیا و ئلێسپۆنتودا، بە مەبەستی ئاسایشی خۆی و دابینکردنی شـانازی بۆ خۆی شای بۆ دیاری دەکردن. هەر وەکچۆن هێندێ لە ئیمپراتۆرەکانی ڕۆما، لە هاوولاتیی ئاساییەوە دەگەیشتن بەم پلە و پایەیە؛ هەڵبەت ئەمانە لە ڕێگەی دانی بەرتیل بە سەربازان و گەندەڵکردنەوەی سپاوە دەگەیشتنە ئیمپراتۆری و دەسەڵاتیان وەدەستەوە دەگرت.

١. داریووش: مەبەست داریووشی یەکەمە، کە لە ٥٥٢ تا ٤٨٥ی پ.ز.، پادشای ئیمپراتوریی پارس بووە. ئەو دەستپێکەری شـەر دژی ئاتێن بوو و لە ماراتۆنا شـکا (سـاڵی ٤٩٠)؛ شـارانی یۆنان، مەبەسـت شارانی ئاسـیای بچووکە، (ئلێسپۆنتو Ellesponto ناوی کۆنی داردانیلی‌یە، کە لە تورکیای ئێستادا هەڵکەوتووە). ئـ.ئی.ئی.

٢ ئـەم دەوڵەتانـە تەنیا بە ئیـرادە و بەختی ئەو کەسـانەوە ڕاوەسـتاون کە ئیجازەی دامەزراندنیانیـان داوە. ئەم دوو شـتەش هـەر دوو لەرزان و ناجێگیرن؛ نـە دەزانن و نە دەتوانن پاراستنی ئەو پلە و پایەیە دەستەبەر بکەن. نازانن: چونکە ئەو کەسە کە هەمیشە وەکوو هاووڵاتیی ئاسـایی، بەڵام بەختیار ژیاوە، ئەگەر بۆخۆی خاوەن ژیرهاتی و ژیری نەبـێ، لەگەڵ ئەقڵ و ئاوەزدا ناگونجێ هونەری فەرماندان و دەوڵەتداری بزانێ. ناتوانن: چونکە خاوەن ئەو هێزە نییە کە دۆسـتی بەردەوامی ئەو بێ و ئەمەگی بۆی هەبێ. ئینجا ئەو دەوڵەتانە کە لە ناکاو سـەر هەڵدەدەن، وەک هەموو شتەکانی تری ناو سروشتن کە زوو دەڕسکێن و بەپەلە گەشە دەکەن و دەرفەتی داکوتانی ڕەگ و ڕیشەی پتەو و پەلوپۆ هاویشـتنیان نییە، بۆیە خێوی ئەو بنیاد و بناغە پتەوە نین کە بتوانن لە بەر یەکەم بای دژ و باهـۆزی نەیاردا خۆ ڕابگرن و بەرەنگاری بکەن - جگە لەوەی کە هەروەک بەر لەمە باس کرا ئەوانەی کە لە ناکاو سـەریان هەڵداوە و بووگن بە شالیار، خاوەن ئەو هێزایی و ژێهاتییەش بن کە دەستبەجێ بتوانن خۆیان تەیار و ئامادە بکەن و ئەوەی یاری بەخت پێشکەشی کردوون بە لێزانی و ژیریی خۆیان بیپارێزن و ئەو بنەڕەتە قورس و قایمانە کە شالیارانی تر پێش گەیشتن بەو پلە و پایە ساز و قایمیان کردوون، ئەمان پاش گەیشتن بە دەسەڵات قایمیان بکەن.

٣ ئێسـتا سـەبارەت بە چۆنیەتیی بوون بە شالیار بە هەرکام لەم شـێوازانە، واتە یان بە هۆی ژیری و ژێهاتییەوە، یان بە هۆی ڕووتێکردنی بەختەوە؛ دەمەوێ باسی دوو نموونە بکـەم، کە هەر لـە ڕۆژگاری خۆماندا ڕوویـان داوە. ئەوانەش نموونەی فرانچێسـکۆ سـفۆرزا[1] و چێساریێ بۆرجیایە.[2] فرانچێسکۆ بەپێی ڕەخسانی هەل و داخوازی بارودۆخ

---

١. Francesco Sforza (١٤٠١-١٤٦٦) بـە هۆی ژێهاتیی سـەربازییەوە ناوبانگی دەرکردبـوو. بیانکا ماریا، کچی فلیپۆ ڤیسـکۆنتی، یەک لە دووکانی میلانۆی خواسـتبوو. پاش مەرگی دووک لە ساڵی ١٤٤٧دا، شار دەخرۆشێ و بۆ ئەستاندنی ئازادیی خۆی؛ لە شـەڕ دژی ڤێنێزیا، میلانۆییەکان فرانچێسـکۆ دەکەن بە سەرداری سـەربازیی خۆیان؛ بەڵام فەرماندەر لەگەڵ ڤێنێزییەکان ڕێک دەکەوێ و چەکەکانی بە دژی کۆماری تازە دامەزراوی میلانۆ وەردەگێڕێ و ناچاریان دەکا خۆ بەدەستەوە بدەن و سەر بۆ ئاغاکانی شار دانوێنن. ئـ ئی. ئی.

٢. بڕوانە بەشی ٣.

و بە هۆی ئەو لێزانی و لێهاتووییە کە لە سەردەمی ژیانیدا وەک هاووڵاتیی ئاسایی لە خۆی نواندبوو، بوو بە دووکی میلانۆ؛ ئەوەی کە بە هەزاران چەرمەسەری و ماندوویی زۆرەوە وەدەستی هێنابوو، بە کەمترین ئاستەنگ و ماندوویی پاراستی. لەو لایشەوە، چێساری بۆرجیا کە لە ناو خەڵکدا بە ڤالێنتینۆ ناسراوە -بە هۆی سەرکەوتن و بەختیاریی باوکییەوە گەیشتە دەسەڵات و بووە خاوەن دەوڵەت؛ بەڵام لە پاراستنیدا سەرکەوتوو نەبوو و دۆڕاندنی. هەموو کار و چالاکییەکانی چێساری بۆرجیا، وەک مرۆڤێکی بەڕاوتەگبیر، بۆ پتەوکردنی بناغەی دەسەڵاتی خۆی، لەو مەڵبەند و دەوڵەتانە کە بە هۆی یاری بەختەوە و لە لایەن کەسانی ترەوە پێی درابوون بێسوود بوون و نەیانتوانی دەوڵەتی بپارێزن. هۆی ئەمەش ئاشکرایە، هەروەک پێشتر باس کرا، ئەوەی کە لە پێشدا بنەڕەتی قورس و قایم دانانێ، دەتوانێ دواتر بە ژیری و ڕاوتەگبیری زۆرەوە دایبنێ؛ هەڵبەت پێش ئەوە کە کاری ئەندازیار فرە دژوار بێتەوە و لە پتەوکردنی بناغەی دامودەزگا و دامەزراوەکانیدا تووشی مەترسی ببێ. کەوابوو، ئەگەر هەموو سەرکەفتن و پێشڕەوییەکانی چێساری بۆرجیا بە وردی ڕاڤە بکرێن، دەبینین کە ئەو بناخەیەکی قورس و قایمی بۆ دەسەڵات داهاتووی خۆی دانابوو. جا ئێستا چونکە من نازانم باشترین ئامۆژگاری بۆ شالیاری نوێ و تازە بە دەسەڵات گەیشتوو بێجگە لە کار و کردەوەکانی خودی خۆی چییە، لە سەر ئەم بڕوایەم شرۆڤەی کار و چالاکییەکانی چێساری بۆرجیا، شتی زێدە و نەپێویست نین. جا کەوابوو، ئەوە خەتای چێساری بۆرجیا نەبوو کە هەموو کارەکانی بۆ پتەوکردنی بنەڕەت دەوڵەتی بێسوود و نەزۆک دەرچوون. ڕاستی ئەوەیە کە بەخت پشتی تێ کرد و تووشی نەهامەتییەکی بێوێنە و فرە گەورە بوو.

٤ پاپا ئەلێکساندری شەشەم کە گەرەکی بوو کوڕەکەی بکاتە سەردارێکی گەورە و ناسراو، لەگەڵ گەلێک ئاستەنگ و گیر و گرفتی ئەوسایی و داهاتوو دەستەویەخە بوو. یەکەم ئەوەی کە، بۆ ئەوەی کە کوڕەکەی بەسەر دەوڵەتێکەوە دانێ کە موڵکی کلیسا نەبێ یان سەر بە کلیسا نەبێ، هیچ ڕێگە و دەرەتانێکی شک نەدەبرد؛ دەشیزانی ئەگەر

بیهەوێ لەوانەی کلیسای بۆ داگیر بکا و لەسەریانی دانێ، سەرداری میلانۆ و ڤێنێزییەکان لێی قەبووڵ ناکەن؛ چونکە ڤێنێزییەکان داڵدەدەر و پشـتیوانی دەسـەڵاتدارانی فائێزا و ڕیمینۆ بوون. دووهـەم، ئەو دەیبینی کە هێزە چەکدارەکانی ئیتالیا، بە تایبەتی ئەوانە کە بەکەڵک بوون و دەکرا سوودیان لێ وەربگیردرێ، لە ژێر فەرمانی ئەو کەسانەدا بوون کە دەبوو لە گەورەیی پاپا بترسـن و حەساوی بۆ بکەن، بەڵام نەیدەتوانی باوەڕیان پێ بکا و پشتیان پێ ببەستێ؛ چونکە هەموو لە ژێر فەرمانی ئورسینی و کولونێسی-یەکان[1] و دەست و پێوەندەکانی ئەواندا بوون. بۆیە پێویست بوو پێکهاتە و نەزمی سەقامگرتوو ژێر و ژوور بکرێ و ئاژاوە دەوڵەت و میرنیشینەکان[ی ئیتالیا] بتەنێتەوە، بۆ ئەوەی ئەو بە دڵنیاییەوە دەسـت بگرێ بەسەر بەشـێک لەو دەوڵەتانەدا و ببێتە دەسەڵاتداریان. ئەم پلانەش فرە ئاسان سـەری گرت: چونکە کەوت بەسەر ڤێنێزییەکاندا کە بە بۆنە و هۆی ترەوە پێش فەڕانسەییەکان کەوتبوون و دەرگای وڵاتیان بۆ خستبوونە سەرپشت و هێنابوونیانە ئیتالیا؛ ئەم ڕووداوە، نەتەنیا نەبووە بەرهەڵستی پلانەکەی، بەڵکوو بە بۆنەی بەفەرمیناسینی تەڵاقی ژنی لویجی دوازدەیەم لە لایەن پاپاوە، بووە ڕێخۆشکەر و یارمەتیدەر بۆ جێبەجێکردنی.

٥ جا کە پادشای فەڕانسە بە یارمەتیی ڤێنێزییەکان و پێکهاتن لەگەڵ پاپا ئەلێکساندری شەشەمدا هاتە ئیتالیا، هێشتا پێی نەگەیشتبووە میلانۆ، پاپا داوای هێزی سەربازیی لێ کرد بۆ ئەوەی بڕواتە سـۆراخی کاروباری ڕومانیاوە.[2] دیارە بە هۆی ناو و ناوبانگی پادشاوە، وەڵامی داواکەی بە ئەرێنی درایەوە. ئینجا دەسـتی گرت بە سـەر ڕومانیا و داگیری کرد و کۆلۆنیستەکانی تەفر و توونا کرد. بەڵام کاتێک ویستی ئەم دەسکەوتانە بپارێزێ و بۆ جێبەجێکردنی پلانەکانی پێشـڕەویی زیاتر بکا، دوو شـت بوونە پێشگری. یەکەم، ئەو لەسـەر ئەم بڕوایە بوو کە ئەو سـپایە وەفای بۆ نییە و نابێ پشـتی پێ ببەستێ؛ دووهەم، خواسـت و ئیرادەی فەڕانسە. چێساری بۆرجیا، دەترسـا ئەو هێزە چەکدارانە کە لە ژێر

---

١. Orsini, Colonnesi، بڕوانە بەشی ١١.

2. Romagna

فەرمانی پاولۆ ئورسینیدا بوون و تا ئەوکات لێوەشاوەیی و نەترسیی خۆیانیان سەلماندبوو، بە گوێی نەکەن و پادشــای فەڕانســەش وەکوو جاران دالدەی نەدا و پشتی تێ بکا: بەم جۆرە ئەوەی کە تا ئەوکات بە دەســتی هێنابوو لە دەســتی بچێ و ڕەنج بەخەســار بێ. چونکە تا ئەو کاتە جارێک شایەتی بێئەمەگیی هێزەکانی ئورسینی ببوو. ئەویش ئەو دەم کە لە گەمارۆی فائێزا بۆوە و پەلاماری بلۆنیای دابوو. ئەم لەم هێرشەدا شایەتی ئەوە بوو کە بە بێمەیلی و ناوەدڵانە پێشڕەوی دەکەن. ئەوەندەش پێوەندیی بە هەڵوێستی پادشاوە بوو، هەر ئەوکات تێگەیشتبوو کە ئیدی وەکوو پێشوو، واتە کاتێک کە دەستی گرتبوو بە ســەر میرنشینی ئوربینۆیدا[1] و بە تەمای پەلامارادانی تۆسکانا بوو، پشتی ناگرێ؛ ئەوسا پادشا پێشی پێگرتبوو و ئیجازەی داگیرکردنی تۆسکانای پێ نەدابوو.

٦ دوای ئەمانە، چێســارێ بۆرجیا بڕیاری دا ئیتر پشــت بە هێــزی چەکدار و بەختی کەسانی تر نەبەستێ و کەوتە بیری ئەوە کە سەربەخۆ بێ و بە سپای خۆی پشت ئەستوور بێ. پێش لە هەموو شــتێک هێزی کولونییەکان و ئورســینییەکانی لە ڕۆمــا لاواز کرد؛ گشت گەورە و ئاغاکانی ئەوانی بە پارە و پلە و پایە کڕی و کردنی بە پیاوماقووڵی خۆی و مانگانەی زۆری بۆ بڕیبوونەوە. پاشــان بەپێی لێهاتوویی و توانابییەکانیان، پلە و پایە و شانازیی وەکوو سەردار، سپاسالاریی سەربازی و سیاسیی پێ بەخشیبوون. بە جۆرێک کە لە مــاوەی چەند مانگدا هەســتی لایەنگــری و هۆگریی بۆ لایەنبازی لــە ناخیاندا کوژایەوە و هەموو بوونە لایەنگری چێسارێ و سەری خۆیانیان پێ دەسپارد. دوای ئەم کردەوانــە چاوەڕێی هەل و دەرفەتی گونجاو بوو بۆ ئەوەی کە ســەرکردە و گەورەکانی ئورســینییەکان لەناو بەرێت و تەفر و توونایان بکا؛ ئەو پێشتر سەرکردەی کولونییەکانی لە ســەر خاک و ماڵی خۆیان تەفر و توونا کردبــوون و لە نێوی بردبوون؛ لە ئاکامدا ئەم هەلەشی بۆ ڕەخسا و ئەویش زۆر چاک قۆزتیەوە. ئورسینییەکان، درەنگ تێگەیشتبوون کە گەورە دووک، چێسارێ و دەسەڵاتی کلیسا لە بەرژەوەندیی ئەواندا نییە و تێکشکان و

1. Urbino

لەناوچوونی ئەوانی بە دواوە دەبێ. بۆیە لە ماگینوێ، بازێرێ لە پێرووجا[1]، کۆبوونەوەیان پێکهێنابوو، کە بەرهەمەکەی سـەرهەڵدان و ڕاپەڕینـی ئوورینۆ و ئاژاوەکانی ڕومانیا و زۆر مەترسـیی تر بۆ دووک چێسارێ بوو. بەڵام دووک زۆر ژیرانە و لێزانانە، بە یارمەتی و پشـتیوانیی فەڕانسەوییەکان، بەسەر هەموویاندا زاڵ بوو و خۆی لێیان پەڕاندەوە. پاش ئەوەی ناوبانگ و ئابڕووی خۆی سـەندەوە، ئیدی نە پشتی بە هێزی فەڕانسە بەست، نە هیچ هێزێکی دەرەکـی؛ لەبەر ئەوەش نەیانکات بە نەیاری خۆی پەنای بردە بەر فێڵ و فریودان. ئەو ئەوەندە چاک دەیزانی خۆی بگۆڕێ و لە ژێر دەمامکی درۆ و دووڕووییەوە ڕووی ڕاستی خۆی بشـارێتەوە کە تەنانەت ئورسینییەکانی لە ڕێگەی سەردار پاولۆ-وە لەگەڵ خۆی ئاشت کردەوە. دووک چێسارێ، بۆ ئەوەی لە پاولۆ دڵنیا بێ و بە مەبەستی نمەکگیرکردنی دراوی زۆر و جلوبەرگ و ئەسـپی پێشکەش کرد، بە جۆرێک کە ئەو ساویلکەیەی وەها نەرم کردبوو کە شاری سێنیگالیانی[2] دا بە دەستییەوە.

٧ دوای تەفر و توونا کردنی گەورەکانی ئورسـینییەکان و ڕاکێشـانی فەرماندە و هێزە چەکدارەکانیان بۆ لای خۆی و کردنیان بە دۆست، دووک چێسارێ زۆر چاک بناغەی دەسـەڵاتی خۆی پتەو کرد. ئەم ئێسـتا ئیتر بووە بە خاوەنی هەموو ڕومانیا و میرنشـینی ئوورزینـۆ؛ پێی وا بوو ڕومانیا بە تەواوی بووە بە دۆسـت و خۆی بە خاوەنی هەموو ئەو خەڵکانەش دەزانی کە تازە خەریک بوو تامی ئاسوودەیی و خۆشگوزەرانی هەست پێ بکەن. جا چونکە ئەم بەشە لە کارەکانی شیاوی لاساییکردنەوەن نامەوێ بە سەریاندا باز بدەم، بەڵکوو دەمەوێ باش سەرنجیان بدەم و بە وردی ڕاڤەیان بکەم. دووک چێسارێ، کاتێک دەستی گرت بەسـەر ڕۆمانیا و داگیری کرد، هەر زۆر زوو تێگەیشت کە مەزن و ئاغاکانی ئەو مەڵبەندە کەم دەسـەڵاتن و زۆر ناشیاوانە ناوچەکە بەڕێوە دەبەن. ئەوان لە جیاتی ئەوەی سـەر و سامان بەو دەفەرە بدەن و بە ڕێکوپێکی بەڕێوەی ببەن، هەموو

---

١. ماجیونێ، Magione، پێرووجا، Perugia.

٢. Senigaglia شارێ کە لە ناوەندی ئیتالیا هەڵکەوتووە.

بندەســت و ڕایەتانی خۆیانیان تالآن دەکرد؛ بۆخۆیان ببوونە هۆی دامەزرانی دەســتە و تاقم و نایەکگرتوویی و چەندبەرەکایەتی و پەرژ و بڵاویی دانیشتووانی ئەو مەڵبەندە؛ بە جۆرێک کە دەستە و تاقمی دز و جەردە ببوونە باڵادەست و هەموو چەشنە شەڕئەنگێزی و گەندەکارییەک لەو ناوەدا تەشەنەی کردبوو و گشت ئەو ناوچەی تەنی بۆوە. دووک بۆ گەڕاندنەوەی ئاشتی و ئارامی بۆ ناوچەکە و بۆ ئەوەی کە هەمووان ملکەچی دەسەڵاتی خۆی بکا، وای بە چاک زانیبوو لەو مەڵبەندە نموونەیەک لە دەوڵەتداریی باش بەدەستەوە بدات. بۆیە میسۆ ڕیمیرڕۆ دێ ئۆرکا[1] پیاوێکی دڵڕەق و بێبەزەیی کردە میری ئەو دەڤەرە. ئۆرکا لەو دەڤەرە بە پیاوی خاوەن دەســەڵاتی ڕەها دەناسرایەوە و پێی دەگوترا: تەژی لە زۆر و دەســەڵات. ئەم تەژی لە زۆر و دەسەڵاتە، لە ماوەیەکی کەمدا ئارامی و ئاسایشی بەرقەرار کرد و ناوچەکەی یەکخستەوە و ناوبانگی دەرکرد. دووک چێساری، کە دەترسا ڕیمیرڕۆی نەکەوێتە بەر تووک و ڕقی دانیشتووان، بەو ئاکامە گەیشتبوو کە بەکاربردنی ئەو هەموو دڵڕەقی و توندوتیژییە پێویســت نەبوو. بۆیە لە ناوەڕاســتی ئەو مەڵبەندەدا دادگایەکــی ســیڤیلی بۆ دادگاییکردنی پیاوی تــەژی لە زۆر و دەســەڵات بەڕێوەبرد و کەســێکی مەزنی کردە ســەرۆکی دادگا و فەرمانی دا هەموو شــارێک نوێنەری خۆی بنێرێ بۆ ئەوەی کە سکاڵا و ناڕەزایەتیی خۆیان بە گوێی سەرۆک دادگا بگەیەنن. دووک چونکە دەیزانی دڵڕەقی و توندئاژۆیی میسۆ ڕیمیرڕۆ بۆتە هۆی دڵ ئێشانی هێندێک لە دانیشتووان و ڕقیان لێی هەڵگرتووە، بۆ ئەوەی دڵی ئەوان بداتەوە و بیانکاتەوە لایەنگری خۆی، گەرەکی بوو نیشانی بدا کە ئەو توندوتیژی و دڵڕەقی نواندنە بە فەرمان و خواستی ئەم نەبــووە، بەڵکوو لە بەدزاتی و سروشــتی توندئــاژۆ و دڕندانەی میســۆ ڕێمێرۆ-وە سەرچاوەی گرتووە. بۆیە ناڕەزایەتی و گازندەی خەڵکی ئەو دەڤەرە لە میسۆی قۆزتەوە و فەرمانی دابوو لەتوپەتی بکەن. بەرەبەیانییەک تەرمەکەی میســۆ، لە کاتێکدا دوو پاژ

1. Ramirrio de Orco

تەختــە و چەقۆی خوێناوی لە تەنیشــتییەوە داکەوتبوو، لە بازێــری چێزێنا[1] دۆزرایەوە. دڕندەیی و دڵڕەقیی ئەو دیمەنە لە لایەک ببووە هۆی دڵنەوایی و ڕازیبوونی خەڵک و لە لایەکی ترەوە بە قووڵی تووشی واقوڕمان و حەپەسانی کردبوون.

٨ بەڵام با ئێستا بگەڕێینەوە ســەر مەبەست و کاکڵەی باسەکەمان. ئەز دەبێژم دووک چێساری، زۆر باش دەســەڵاتی خۆی سەقامگیر کردبوو و دامەزراندبوو؛ ئەو مەترسییە ئێستاییەکانی لە خۆی دوور خستبۆوە و تا ڕادەیەکی بەرچاو ئاسایش و ئارامیی بۆ خۆی دەســتەبەر کردبوو؛ چونکە بە باو دڵی خۆی هێزی چەکداری ســاز کردبوو؛ بەشێکی چاک لــەو هێزانەی کە گومانی ئەوەی لــێ دەکردن ڕەنگە لــە کورتخایەندا پەلاماری بدەن و بتوانن زەبری لێ بزەشێنن تەفر و توونا کردبوو. ئێستا بۆ جێبەجێکردنی درێژەی پلانەکەی و بەردەوامبوون لە ســەر پێشــڕەوی و داگیرکارییەکانی تەنیا ترســی لە شای فەڕانسە هەبوو؛ چونکە دەیزانی ئەگەر پادشا دواتر ئاگاداری هەڵە و لارییەکانی بێ لێی قەبووڵ ناکات و ئیجازەی پێشڕەویی پێ نادا. بۆیە کەوتە بیری دۆزینەوەی دۆستایەتیی نوێ، ئەگەرچی پێوەندییەکانی لەگەڵ فەڕانســە نەپچڕاندبوو و کەم و زۆر ڕایگرتبوون؛ بەڵام لە هاتن و هێرشی فەڕانســەییەکان بۆ سەر پادشای ناپۆلی دژی ئیسپانیاییەکان کە کائێتایان گەمارۆ دابوو[2]، هۆشــی بە لای ئــەوەوە بوو لێیان دڵنیا بێ. بە دڵنیاییەوە ئەگەر پاپا ئەلێکســاندر لە ژیاندا بووایە، پلانەکەی سەری دەگرت و تێیدا سەرکەوتوو دەبوو؛ ئەوەندەی کە پێوەندیی بە هەلومەرج و دۆخی ئێســتاییەوە بوو، چێســاری بەم جۆرەی باس کرا جووڵایەوە.

٩ بەڵام ئەوەندەی کە پەیوەندیی بە داهاتووەوە هەبوو، یەکەم شــت کە لێی بەگومان بوو ئەوە بوو کە ڕەنگە پاپای نوێ و جێگرەوەی ئەلێکســاندر دۆست و لایەنگری نەبێ و هەوڵ بدا ئەوەی کە بابی پێی داوە لێی بستێنێتەوە. بۆیە بیری لەوە کردەوە ئەم گومانانە

1. Cesena
2. Caeta

بەم چوار شـێوازەی خوارەوە برەونێتــەوە و خۆی دڵنیا بکا. یەکەم، دەســتبەکار بوو بۆ کوێرکردنــەوەی تۆرەمەی هەموو ئەو دەرەبــەگ و میرانە کە دەوڵەت و هەرێمەکانیانی داگیــر کردبوو؛ بۆ ئەوەی بوار بۆ پاپای نوێ نەهێڵێتەوە کە بیانگێڕێتەوە ســەر تەخت و بەختی خۆیان. دووهەم، هەروەک پێشتر گوترا، هەوڵی دا هەموو پیاوماقووڵ و ئاغاکانی ڕۆما بکاتە دۆســت و دەست و پێوەندی خۆی؛ بۆ ئەوەی لەم ڕێگەیەوە دەست و باڵی پاپا ببەستێ و نەهێڵێ دژی بجووڵێتەوە. سێهەم، هەموو هەوڵ و هێزی خۆی خستە گەڕ بۆ ئەوەی کە لە کۆڕی کاردیناڵەکاندا [بۆ هەڵبژاردنی پاپای نوێ] زۆرترین ژمارەیان بکاتە دۆست و لایەنگری خۆی. چوارم، پێش ئەوەی کە باوکی، واتە پاپا ئەلێکساندر، بمرێ، ئەوەندەی پێی کرا پەرەی بە پانتایی دەسەڵات و هێزی خۆی دا، بە جۆرێک لە ئەگەری سەرهەڵدانی شــەڕدا بتوانێ بە تەنیا بەرگری لە خۆی و تاج و تەختی بکا. بەڵام کاتێک پاپا ئەلێکســاندر مرد، لەم چوار خاڵە، سێیانی چاک جێبەجێ کردبوو و لە سەرویەندی بە سەرئەنجام گەیاندنی سەرکەوتووانەی چوارەمیشدا بوو. هەموو ئەو دەرەبەگ و میرانە کە دەســتی گرتبوو بە ســەر دەوڵەت و هەرێمەکانیاندا ئەوەندەی کە دەستی کەوتبوون کوشتبوونی و ژمارەی کەمیان خۆیان دەرباز کردبوو. ئاغا و گەورەکانی ڕۆمای کردبووە دەست و پێوەند و لایەنگری خۆی؛ لە کۆڕی کاردیناڵەکان زۆربەیان لەگەڵ ئەم بوون؛ ئەوەندەش پێوەندیی بە داگیرکارییە نوێیەکانییەوە هەبوو، پلانی دارشتبوو لە تۆسکانا ببێتە باڵادەست؛ ئاخر ئێستا ئەو خاوەن پێرووجا و پیۆمبینۆ بوو[1]، دڵی پیساییەکانیشی وەدەست هێنابوو و سەرنجیانی بۆ لای خۆی ڕاکێشابوو. هەروەها چونکە ئێستا ئیتر ترسی لە شای فەڕانســە ڕەوییبۆوە -ئیتر لە شای فەڕانســە نەدەترسا، چونکە ئیسپانیا پادشای ناپۆلیی لە چنگ دەرهێنابوو، بۆیە هەر دوو لا بە پێویســتیان ئەزانی دۆســتایەتیی لەگەڵ بکەن و دڵی ڕابگرن- بە تەمای پەلاماردان و داگیرکردنی پیســا بوو[2]. پاش داگیرکردنی پیساش،

---

1. Piombino
2. Pisa

پەلاماری لووکا و سیێنای دەدا[1]، ئەمانەش زۆر زوو خۆیانیان دەدا بە دەستەوە؛ هەم لە داخ فیورێنتینییەکان، هەم دەترسان. ئەوسا ئیتر فیورێنتینییەکان هیچ چارەیان نەبوو. ئەگەریش ئـەم پلانەی سـەری گرتبا –واتە هەمان سـاڵ کە ئەلێکسـاندر مـرد فیرێنزێی ڕاژێری دەسەڵاتی خۆی کردبا– ئەوسا بۆ خۆی دەبووە خاوەن دەسەڵات و ناوبانگی فراوان و بە سەر پێی خۆیەوە ڕادەوەستا؛ ئیتر پشتی بە بەخت و هێزی کەسانی دیکە نەدەبەست و تەنیا بە هێز و ژیری و هێژایی خۆی پشت ئەستوور دەبوو.

١٠ بەڵام لە کاتێکدا پێنج سـاڵ بوو دەسەڵاتی بەدەسـتەوە بوو و شیری بە دەم زەردی ڕاگرتبوو، پاپا ئەلێکساندر مرد. ئەویش تا ئەوکات تەنیا دەسەڵاتی خۆی لە ڕومانیا قایم و سەقامگیر کردبوو. لە هەموو شوێنەکانی دیکەدا دەسەڵاتی لەرزۆک بوو، دوو هێزی زۆردار و نەیاریش دەوریان دابوو. سـەرباری ئەمانەش بۆخۆی بە قورسـی نەخۆش و لە جێدا کەوتبوو؛ مەرگ بەرۆکی پێگرتبوو. هەڵبەت دووک چێسـارێ، خاوەنی گیانی بەرز و بەهێز و گەلێ هەڤیازیی تر بوو. ئەو زۆر چاک دەیزانی چۆن مرۆڤەکان دەستەمۆ و گوێڕایەڵ دەکرێن و چۆن لە دەسـت دەردەچن و قینت لێ هەڵدەگرن. هەروەها ئەو بنەڕەتـە کە لـەو ماوە کورتەدا داینابوو زۆر بەجێ و قـورس و قایم بوو. ئەگەر ئەو هێزە نەیارانـە دەوریان نەدابا و بۆخۆی سـاغ و سـەڵامەت با، بە دڵنیاییـەوە لە هەمبەر هەموو ئاستەنگ و نەهامەتییەکەوە خۆی ڕادەگرت.

١١ ئەوەی کە دووک چێسارێ بناغەیەکی چاکی دامەزراندبوو بە ڕومانیادا دەردەکەێ: چونکە لە کاتێکدا لە ئاویلکەدا بوو، ڕومانیا زیاتر لە مانگێ لە سەری ڕاوەستا و چاوەڕێ بوو بزانێ چی بەسـەر دێ، لە کاتێکیشدا لە ڕۆما نیوەگیان داکەوتبوو، کەچی ئاسایشی پارێزراو بوو. هەروەها سـەرەڕای ئەوەی بالیۆنی ڤیتێلی و ئورسـینییەکان بە مەبەسـتی پەلاماردانی هاتبوونە ڕۆما، بەڵام نەیانتوانی هیچی لە دژ بکەن. هەروەتر بەو حاڵەشـەوە کە تێیدا بوو، ئەگەرچی پێی نەدەکرا ئەو کەسە کە دەیەویست بیکاتە پاپا، بەڵام دەیتوانی

---

1. Luca, Siena

پێشگر بێ و نەهێڵی ئەو کەسە کە نەیدەویست ببێ بە پاپا. بە دڵنیاییەوە ئەگەر لە سەردەمی مەرگی پاپا ئەلێکساندردا، ساغ بایە ئەوە هەموو شتێکی بە ئاسانی بۆ جێبەجێ دەبوو. لە کاتی هەڵبژاردنی جوولیوی دووهەمدا[1] بۆخۆی پێی گوتم[2] بیرم لە گشت ئەو شتانە کردبۆوە کە ڕەنگە دوای مەرگی باوکم سەر هەڵبدەن، چارەشم بۆ هەموویان دۆزیبۆوە؛ پەکۆ! تەنیا بیرم لەوە نەکردبۆوە کە کاتێ باوکم دەمرێ، خۆیشم لە سەرەمەرگدا بم.

١٢ ئێستا دوای کۆکردنەوە و ڕۆنانی هەموو کار و چالاکییەکانی دووک چێساری لە پێش چاوان، من نەتەنیا ڕەخنە و گازندەم لێی نییە، بەڵکوو بە پێچەوانەوە لەو باوەڕەدام هەموو ئەوانە کە بە هۆی یاری بەخت و هێزی کەسانی ترەوە بە پلە و پایە و دەسەڵات دەگەن، دەبێ وەک نموونە چاوی لێ بکەن و لاسایی بکەنەوە. هەڵبەت منیش لە هێنانەوەی ئەو وەک نموونە هەر ئەوەم مەبەست بوو. چونکە ئەم خاوەن گیانێ هێژا بوو و هاوکات ئامانجی بەرزیشی هەبوو نەدەکرا بە تەرزێ تر فەرمانڕەوایی بکا؛ ئەو شتانە کە بە دژی چوونە پێشەڤە ئەمانە بوون: بە دەستەوە نەبوونی کاتی پێویست بۆ جێبەجێکردنی پلانەکانی، مەرگی پاپا ئەلێکساندری باوکی و نەخۆشبوون و کەوتنی لە جێگەدا. هەر کەسێک هەست بەم پێویستییانەی خوارەوە بکا و بخوازێ لە پادشایی تازە دامەزراو و نوێی خۆیدا لە دوژمنان دڵنیا بێ و دۆستی نوێ بدۆزێتەوە، بیهەوێ بە هۆی هێزەوە یان فێڵ و فریوەوە سەرکەوتن وەدەست بێنێ؛ بیهەوێ کارێک بکا خەڵک ڕێزی بگرن و هاوکات ترسیان لێی هەبێ؛ بیهەوێ سەربازان لە فەرمانی دەرنەچن و گوێڕایەڵی بن؛ گەرەکی بێ هەموو ئەوانە کە ڕەنگە زەبری لێ بوەشێنن و مەترسیی بۆ دروست بکەن تەفر و توونا و دوابڕاو بکا؛ بیهەوێ بە شێوازی نوێ داب و دەستووری کۆن نوێ بکاتەوە؛ بیهەوێ هاوکات جددی و قورس و قایم و دڵفراوان، خاوەن گیانی هێژا و لیبراڵ بێ؛ بیهەوێ سپای بێ ئەمەگ و خاین تەفر و توونا و سپای نوێ و وەفادار بە خۆی ساز

---

1. Julio II

٢. ماکیاڤێلی ئەودەم وەکوو باڵوێزی کۆماری فیرێنزێ، بە مەبەستی کاری دیپلۆماسی لە ڕۆما بووە. ـ ئ. ئی.

بکا؛ بیهەوێ دۆستایەتیی خۆی لەگەڵ خونکار و شاکان ڕابگرێ، بە جۆرێ کە دۆستان خێری پێ بگەیەنن و دوژمنان دوای چەند جار بیرکردنەوە و هەڵســەنگاندن زەبری لێ بوەشێنن؛ ئەوە نموونەی تەڕ و تازەتر لەمەی دووک چێساریٚ دەست ناکەوێ.

١٣ بە بڕوای من تەنیا هەڵەی دووک چێساریٚ ئەوە بوو کە هێشتی جوولیو ببێ بە پاپا. لــەم بوارەدا دووک چێســاریٚ هەڵبژاردنێکی خراپی کرد. چونکە، وەک پێشــتر گوترا، ئەگەرچی پێی نەدەکرا ئەو کەسە کە دەیەویست بیکا بە پاپا، بەڵام دەیتوانی ڕێگر بێ و نەهێڵی ئەو کەســە کە نەیدەویست ببێ بە پاپا. ڕێک بۆیە نەدەبوو هەرگیز لەگەڵ بوون بە پاپای کاردیناڵێکدا بسازێ کە سووکایەتیی پێ کردبوو، یان ئەوەی دوای بوون بە پاپا ترسی لە ئەم ببێ؛ چونکە مرۆڤ یان بە هۆی ترسەوە یان بە هۆی ڕق و داخ لە دڵییەوە زەبر دەوەشێنێ. لە نێو کاردیناڵەکاندا چێساریٚ سووکایەتیی بە ئەم کەسانەش کردبوو و زیانی پێ گەیاندبوون: سان پییێترۆی ڤینکۆلا، سان جۆرجۆی کولۆنا، ئاسکینۆ سفۆرزا، بێجگە لە ڕوانیو و ئیسپانییەکان، هەموو ئەوانی تر کە ببوان بە پاپا لێی دەترسان. ئیسپانیاییەکان دەست و پێوەند و هاونیشتمانی دووک چێساریٚ بوون. ئەو تریش بە هۆی زۆرداریییەوە لێی نەدەترسا؛ چونکە شای فەڕانسەی لە پشت بوو. ژیرانەترین بژاردە بۆ دووک چێساریٚ ئەوە بوو کە پێش لە هەموو کەسێک هەوڵ بدا یەکێ لە ئیسپانیاییەکان ببن بە پاپا. ئەگەر نەیتوانی ئەمە بکا، دەبووا پشــتگیریی ڕوانوی کردبا، نەوەک سان پییێترۆی ڤینکۆلا. ئەو کەســەی پێی وایە دەتوانێ بە چاکەکردن و خێرگەیاندن بەو کەسانە کە دەبن بە خاوەن دەســەڵات، ئەو دژایەتی و سووکایەتییە کە پێشتر پێیانی کردووە لە بیریانی باتەوە و لە دڵیانــی دەربێنێ، هەر زۆر زۆر بــە هەڵەدا چووە و خۆ فریو دەدا. هــەر بۆیە لە ئاکامدا دەکرێ بێژین: دووک چێساریٚ لەم دوایین هەڵبژاردنەیدا هەڵەی کرد، هەر ئەمەش بووە هۆی تێکشان، ڕووخان و تێداچوونی یەکجاریی تەخت و بەختی.

## ٨. سەبارەت بە ئەوانە کە بە شەڕئەنگێزی و بەدفەڕی پادشاییان وەدەست هێناوە

١ چونکە لە شـارۆمەندی ئاساییەوە بە دوو شێوە دەبی بە شالیار، ناکرێ هەموو شتێ بدرێتە پاڵ بەخت و ڕەوشـتبەرزی؛ بۆیە منیش نامەوێ لێکدانـەوەی ئەم دوو ڕێگەیە پشتگوێ بخەم. ئەگەرچی سەبارەت بە یەکێ لەوانە، واتە کاتێک باسی کۆمار لە ئارادایە، دەکرێ بە بەرپلاوی تاوتوێ بکرێ. بەڵام ئەم شـێوازانە کە لێرەدا تاوتوێ دەکرێن ئا لەم دووانە پێکهاتوون: یەکەم، ئەو کەسـانە کە بە بەدفەڕی و شەڕئەنگێزی دەبن بە شالیار، دووهـەم ئەوەی کە لە هاووڵاتیی ئاسـاییەوە بە یارمەتی و دنەدانـی هاووڵاتیانی دەبێتە شالیاری نیشـتمانی. لە ئاخاوتن لەمەڕ شـێوازی یەکەم، واتە چوونە سەر تەختی شایی بە بەدفەڕی و شـەڕئەنگێزی بە هێنانەوەی دوو نموونە، یەک کەڤنار و یەک ئەمڕۆیی، تەوەرەی باسـەکەمان دەخەملێنن؛ هەڵبـەت بێ ئەوەی زۆر لـە وردەکارییەکانیان ورد ببینەوە؛ چونکە بڕوام وایە بۆ ئەو کەسـە کە بیهەوێ دەرسـیان لێ وەرگرێ و لاسـاییان بکاتەوە هەر ئەوەندە بەسە.

٢ ئاگاتۆکلێ سیسیلیایی نەک لە هاووڵاتیی ئاساییەوە و بە هۆی یاری بەختەوە، بەڵکوو لەوپەڕی بەدناوی، شەڕاشویی و لاساریدا ببوو بە پادشای سیراکووس.[١] ئاگاتۆکلێ، کوڕی

١. ئاگاتۆکلێ، Agatocle، لەساڵی ٣١٦ تا ٢٨٩ی پ.ز. شای ملهوڕی سیراکوس بووە.

گۆزەکەرێ بوو؛ لە تەواوی قۆناغەکانی ژیانی خۆیدا لاتێکی شەڕئەنگێز، لاسار، ناڕەسەن و بەرەڵا بوو. بەڵام سەرەڕای شەڕاشوویی، لاساری و بەرەڵاییەکەی خاوەن گیانێکی هێژا، زیست و وریا و چاونەترس و ئازا بوو. کاتێک ڕۆیشتبووە نێو هێزە چەکدارەکان و ببوو بە ملیشیا، هەموو پلەکانی ئەو بوارەی سەرکەوتووانە بڕیبوو و لە ئاکامدا ببوو بە سپاسالاری سیراکووس. کە گەیشتبووە ئەم پلەیە بێ ئەوەی چاوەڕوانی کەسی دیکە بێ، بڕیاری دابوو بە ملهوڕی تەختی دەسەڵات داگیر بکا و ببێ بە شالیاری ئەو مەڵبەندە. ئەوەی کە ببووە هۆی سەرکەوتنی پلانەکەی پێکهاتنی توندوتۆڵی لەگەڵ ئامیکلاری کارتاجێنی بوو[1]، واتە ئەو کەسە کە بە سپاوە زێرەڤانی ئاسایش و هێمنیی سیسلیای بوو. ئاگاتۆکلێ بەرەبەیانییەک، چما بیهەوێ بڕیار لە سەر شتێکی پێوەندیدار بە بابەتی گشتی و کۆمارییەوە بدا، هەموو خەڵک و سناتۆرانی لە ناوەڕاستی شاردا کۆوە کردبوو، ئینجا بە ئاماژەیەک کە لە پێشدا سەربازانی لێ تێگەیاندبوو، فەرمانی پێدابوون سناتۆر، پیاوانی گەورە و دەوڵەمەند بکوژن و نەهێڵن کەسیان دەرباز ببێ. پاش قەڵاچۆکردنی ئەوان بێ ئەوەی کە لەگەڵ هیچ بەرخۆدانێ مەدەنی ڕووبەڕوو ببێتەوە، تەپی دابووە سەر تەختی شایی و ببووە شالیاری شار. ئەگەرچی کارتاجێنییەکان[2] دوو جار شکانیان و بە تەواوی گەمارۆیان دابوو، بەڵام ئەو نەتەنیا توانی بەرگری لە شارەکەی بکا، بەڵکوو هاوکات هێرش و پێشڕەوییشی کردبوو. فرە لێزانانە بەشێ لە خەڵک و سپاکەی دامەزراندبوو بۆ بەرگری لە شاری گەمارۆدراو، خۆشی لەگەڵ بەشێ تر لە سپا پەلاماری ئافریقای دابوو. بەم جۆرە لە ماوەیەکی کەمدا گەمارۆی سەر سیراکووسای شکاندبوو و کارتاجێنییەکانی ناچار بە کشانەوە و ڕێککەوتن کردبوو. ئەوان ناچار بوون مل بە ئەوە بدەن کە لە بەرانبەر گەڕانەوەی ئافریقا بۆ ژێر دەسەڵاتی خۆیان واز لە سیسلیا بێنن و بۆ

1. Amilcare

٢. کارتاجێنییەکان؛ بە گشتی مەبەست دانیشتووانی شاریی کەونار و لەمێژینەی کارتاج یان قارتاجە لە ئافریقا، کۆلۆنیای فێنیقییەکان بووە. ناوبانگی کارتاجێنییەکان پتر بە هۆی زنجیرە شەڕی دڕندانە و دەلڕەقانەوەیە کە لەگەڵ ڕۆمیەکان کردوویانە؛ بە شەڕەکانی پوونی یان پوونیک ناسراون. سپاسالاری فرە بەناوبانگیان ئانیباڵ-ە کە لە دووهەم شەڕی پوونیکدا ناوی دەرکردووە.

ئاگاتۆکلێ بە جێی بهێڵن.

٣ ئێستا هەر کەس گەرەکی بێ کار و چالاکییەکانی ئاگاتۆکلێ لەبەرچاو دابنێت و لێکیان بداتەوە هیچ شتێک یان شتێکی وەها بەدی ناکات کە بکرێ بدرێنە پاڵ بەختی ئەو؛ جگە لەمەش، هەروەک لە سەرەوە گوترا، سەرکەوتنی ئاگاتۆکلێ بە هۆی پشتیوانی و یارمەتیی کەسەوە نەبووە و تەنیا بە هۆی پلەی سەربازیی خۆیەوە بووە؛ هەڵبەت، دیارە بە هەزاران مەترسی و دژواری و بە ماندوویی زۆر بەم پلەیە گەیشتبوو. کاتێکیش بوو بە شالیار، بە زۆر بڕیاری جوامێرانە و بوێرانە، هاوکات پڕمەترسی و هەڕەشەئامێز، توانیبووی پایە و دەسەڵاتی خۆی بپارێزێ. هەڵبەت لە لایەکی تریشەوە ناکرێ کوشت و بڕی شارۆمەندان، خەیانەت بە دۆستان، بێباوەڕی، بێدینی و دڵڕەقی بە هەڤیازی و هێژایی گیان دابنرێن؛ دەکرێ لەم ڕێگایانەوە کورسیی دەسەڵات بەدەست بهێنی، بەڵام ناتوانرێ و ناکرێ شکۆ و شانازی بۆ خۆت بەدی بێنی. چونکە ئەگەر ڕووبەڕووبوونەوەی ئاگاتۆکلێ لەگەڵ مەترسی و هەڕەشەکان و دەربازبوونی لێیان بە هێژایی و زانایی بزانرێ و دابنرێ؛ ئەگەر خۆڕاگری لە هەمبەر نەهامەتی، دژواری و نەیارییەکان و پەڕینەوە لێیان بە مەزنیی گیانی ئەو بزانرێ؛ ئەدی کەس لەوە تێناگات بۆچی ئەو بە نزمتر لە هەر کاپیتانێ لێهاتوو و هێژا زانراوە و دادوەرییەکان سەبارەت بە ئەو هێندە نەرێنی و نەوین؟ ئاشکرایە کە نائینسان بوون، دڕندەیی و دڵڕەقی و شەڕاشویی و گزیکاری و لاساریی ئەو ئەوەندە ناویان زڕاندبوو و بەدناویان کردبوو کە نەیانهێشتووە بخرێتە ڕیزی پیاوانی بلیمەت و شکۆدارەوە. کەوابوو ئەوەی کە ئاگاتۆکلێ بردبوویە پێشەوە و جێبەجێی کردبوو، ناکرێ بدرێنە پاڵ ئازایەتی و یاری بەخت؛ ئەگەرچی هەموو ئەم کارانەی بەبێ ئەم دووانە بە ئەنجام گەیاندبوو.

٤ لە ڕۆژگاری خۆماندا و لە سەردەمی فەرمانڕەوایی ئەلێکساندری شەشەمدا، ئولیڤێروتۆ ئوفێردوچی خەڵکی فێرمۆ[1]، زۆر منداڵ بوو کە باوکی مرد، کە هەتیویش

1. Oliverotto Eufreducci (1475-1502); Fermo

کەوت خاڵۆی بە ناوی جوڤانی فولیاننی[1] گەورەی کرد. خاڵۆی هەر لە سەرەتای لاوییەوە کوڕەی نارده ژێر دەستی پاولۆ ڤیتێلی[2] بۆ ئەوەی کە تەکنیکی شەڕ فێر ببێ و ببێتە شەڕڤان. کوڕە لای پاولۆ، فێری تەکووزی و ڕێســای بواری ســەربازی بوو و پلەی بەرز بۆوە. لە دوای مەرگی پاولۆ، چووە بەردەســتی براکەی بە ناوی ڤیتێلوزۆ[3] و بە هۆی لێهاتوویی و چالاکیی جەستەیی و وشیاریی فکرییەوە لە ماوەیەکی کورتدا بووە کەسی یەکەمی هێزە چەکدارەکانی ئەم. بەڵام لای وا بوو کە ژێردەستی و شوێنکەوتنی کەسانی تر نۆکەرییە؛ بۆیە بیری گەوزەی کەوتە کەلــلەی و بە یارمەتیی هێندێک هاوولاتیی خەڵکی فێرمۆ، ئەوانە کە کۆیلەتییان لە ئازادیی نیشــتمانی خۆیان پێ چاکــتر بوو، هەروەها بە یارمەتی و ئیجازەی ڤیتێلۆ شــاری فێرمۆی داگیر کرد. دوای ئەوە، چونکە چەند ســاڵێک دەبوو لە ماڵی خاڵی دوور بوو، نامەی بۆ خاڵی نووســی بۆ ئەوەی کە بێت و خۆی ئەو شــارە کە داگیری کردبوو ببینێ؛ هەڵبەت بەم جۆرە مەبەستی بوو خاڵی ڕێز لە شان و شکۆی بگرێ و بزانێ چ سەرمایە و داراییەکی بە دەست هێناوە. چونکە هەموو ڕەنج و تێکۆشانی ئەو لە پێناو بەدەستهێنانی شانازیدا بوو. بۆیە بۆ ئەوەی کە نیشانی هاوولایەتییەکانی بدا کە کاتی خۆی بە فیرۆ نەداوە، داوای لە خاڵی کردبوو لەگەڵ ســەد سوار لە هەڤالانی خۆی و بە لەبەرچاوگرتنی هەموو داب و نەریتێکەوە بێتە سەردانی. هەروەها تکای لێ کردبوو شــانازیی ئەوەی بداتێ کە لە لایەن هاوولاتییانی فیرمۆوە بە ڕێوڕەســمێکی شــکۆدار پێشوازیی لێ بکرێ؛ دیارە مەبەستی لە ڕێکخستنی ئەو ڕێوڕەسمە شکۆدارە، تەنیا خودی خۆی نەبوو، بەڵکوو بە جۆرێ ڕێزگرتن بوو لە خاڵۆیشی کە ئەمی گەورە کردبوو.

٥ خاڵۆی ڕێزی شیاوی لە خوشکەزای گرتبوو و لەم بوارەدا کەمی دانەنابوو. ئەمیش بە شــکۆ و شانازییەوە پێشــوازیی لێ کردبوو و میوانداریی شیاوی کردبوو و چەند ڕۆژ هــەر لە ماڵی خۆیدا ڕایگرتبوو. هەڵبەت لە ماوەی ئەو چەند ڕۆژەدا لە بنەوە و بە نهێنی

1. Giovani fogliani
2. Paolo Vitegli
3. Vitellozzo

خەریکی پێشبردنی پیلانی چەپەڵ، لاسارانە و ناجوامێرانەی خۆی دەبێ. جا دوای گرتنە بەری هەموو ڕێوشـوێنێکی پێویست بۆ جێبەجێکردنی پیلانەکەی، میوانداریيەکی فرە شـکۆدار سـاز دەکا و خالۆ و هەموو گەورە و ناودارەکانی شار بانگهێشتی ئەم میوانییە دەکا. پـاش خـواردن و خواردنەوە و تەواوبوونی هەموو ئەو ڕابواردنانە کە لەم چەشـنە میوانداریيانەدا باوە، ئولیڤێرۆتۆ، زۆر بە فرەزانی و زیرەکانە، دەمەتەقە و گفتوگۆی بردبووە سـەر هێندێ باسی زۆر ناسک و هەستیار و دەسـتی کردبوو بە ئاخاوتن لە مەزنیی پاپا ئەلێکسـاندر و چێسـارێ کوڕی و کاروباری ئەوان. جوڤانی خالـۆی و میوانەکانی تر وەڵامی قسـە و تاریفەکانی ئەمیان دابۆوە. ئەمیش لە ناوبڕێکدا هەسـتابووە سەر پێی و گوتبووی: باشـتر وایە لە شوێنێ شـاراوە و نهێنی لەم بارەیەوە گفتوگۆ بکەین و بیر و ڕا بگۆڕینەوە. ئەوسـا کەوتبووە پێش خالۆی و هەمـوو میوانانی تر و بردبوونیە ژوورێکی تـرەوە. دوای ئەوەی کە هەموویان لەو ژوورەدا و لەو شـوێنانە کە بۆی دیاری کردبوون دانیشتبوون، سەرباز لە کون و قوژنەوە دەرپەڕیبوون و جوڤانی و هەموو ئەوانی تریشیان کوشـتبوون. دوای ئەم کۆکوژی و جەنایەتە، ئولیڤێرۆتۆ سـواری ئەسـپەکەی دەبێ و لەگەڵ پیاوانی بە ناو شـاردا تێدەپەڕێ و دەڕوا بنکەی ئەنجومەنی باڵای بەڕێوبەرایەتیی شـار گەمارۆ دەدا. ئەوانیش لە ترسـا ناچار دەبن حکومەتێک پێک بێنن و ئولیڤێرۆتۆ بکەنە سەرۆکی ئەو دەوڵەت و دامودەزگایە. ئەوسا چونکە هەموو ئەوانەی کە دەکرا لێی نارازی بن و دژی ڕاپەڕن و زەبری لێ بوەشـێنن کوشـتبوونی، داب و دەستووری نوێی مەدەنی و سەربازیی خۆی جێگیر کرد، بە جۆرێک کە لە ماوەی ساڵێکدا نەتەنیا هەموو ئەو میرنشینەی بۆ خۆی داگیر کرد و ئاسایشی خۆی لە شاری فێرمۆدا دەستەبەر کردبوو، بەڵکوو بووە جێی مەترسیی هاوساکانیشی. ئەگەر فریوی چێسارێ بۆرجیای نەخواردبایە و، بەو چەشنەی پێشتر لەمەڕ ئوورسینی و ڤیتلی لە سینیگالا گوترا، نەکەوتبایەتە داوییەوە هەروەک ئاگاتۆکلێ گەمارۆدان و تێکشکاندنی دژوار دەبوو. بەڵام ڕێک ساڵێک دوای

ئــەوەی فێرمۆی داگیر کرد و ئەم کۆکوژی و باوککوژییەی[1] ئەنجام دا، لەگەڵ فیتێلێزۆ، کە مامۆستای بوو و خەت و نیشانی بۆ کێشابوو، چێساریێ بۆرجیا گرتی و هەڵیواسین.

٦ ڕەنگە لەم بابەتەوە لای هێندێک کەس شــک و گومان بێتە ئاراوە و بپرسن ئەرێ ئەوە چۆنە لە شــوێنێک کە ئاگاتۆکلێ و کەســانی وەک ئەو سەر هەڵدەدەن، پاش ئەو هەموو خیانەت، دڵڕەقی، دڕندەیی و لاســارییە دەتوانن بۆ ماوەیەکی درێژ لە نیشتمانی خۆیانــدا بژین و خۆ ڕابگرن؛ لە هەمبەر دژ و دوژمنــی دەرەکی بەرگری لە خۆ بکەن و هاوولاتییانیــش نەکەونە بیری ئەوەی کە دژیان ڕاپەڕن؛ لە کاتێکدا کەســانی دیکە بەم تەرزە تەنانەت لە کاتی ئاشتی و ئارامیدا نەیانتوانیوە دەوڵەت و دەسەڵاتی خۆیان بپارێزن، جا چ بگا بە ســەردەمی دڕدۆنگی و شــەڕ و ئاژاوە. بە بڕوای من هۆی ئەمە بەکاربردنی دڕندەیــی، دڵڕەقیی خراپ کەڵک لێ وەرگیــراو و چاک کەڵک لێ وەرگیراوە. دەکرێ ئەو [شــەڕانە] بە چاک کەڵک لێ وەرگیراو -هەڵبەت ئەگەر ڕەوا بێ لە شــەڕ بە چاکە بئاخفی- ناو ببەین کە بە گشتی لە ماوەیەکی دیاریکراودا، لە پێناو دابینکردنی ئاسایشی خۆت کەڵکی لێ وەردەگری و پاشان ئیتر پێداگریی لە سەر ناکەی و لە سەری ناڕۆی، بەڵکــو هەموو کار و چالاکی دەگۆڕدرێ بۆ ئەوەی کە فرەترین خزمەتگوزاری بکرێ و خێر بە ژێردەســتان بگەیەندرێ. خراپ کەڵک لێ وەرگیراو، مەبەســت ئەوانەیە کە ئەگەرچی لە سەرەتاوە کەمن، بەڵام لە جیاتی ئەوەی کە بە تێپەڕبوونی زەمان بە تەواوی نەمێنن و بکوژێنەوە، بە پێچەوانەوە پەرە دەســێنن. ئەوانە کە تەرزی یەکەم بە کار دێنن و کەڵکی لێ وەردەگرن، ڕەنگە بە پشتیوانیی ئاسمان و ئینسان چارەی لۆ ئەو مەترسیانە بدۆزنەوە کە لە ســەر دەسەڵاتیان هەیە؛ ڕێک وەکچۆن ئاگاتوکلێ چارەی کردن. بەڵام ئەوانی تر، واتە ئەوانەی کە لە ســەری بەردەوام دەبــن و هیچکات کۆتایی پێ ناهێنن، ئیمکانی نییە بەو شێوە بتوانن دەسەڵاتی خۆیان بپارێزن.

---

١. لێرەدا مەبەســت لە کوشتنی باوک، ئەو کەسەیە کە لە جیاتی باوک سەرپەرستی و پێگەیاندنی ئولیفێرۆتۆی وە ئەستۆ گرتووە. ئـ.ئی.ئی.

٧ دەبێ باسـی ئەوەش بکەم لە داگیرکردنی وڵات و دەوڵەتێکدا، پێویستە داگیرکەر هەموو ئەو سووکایەتی و زەبروزەنگە کە مەبەستیە بینوێنێ بە وردی ڕاڤەیان بکا و لێکیان داتـەوە و لە یەک کاتدا تێکڕا گشـتی جێبەجێ بکا؛ بۆ ئەوەی کـە ناچار نەبێ هەموو ڕۆژێـک توندوتیژی بنوێنێ و بەردەوام بێ لـە دووپاتکردنەوەیان و، بتوانێ دڵنیایی بۆ ژێردەسـتەکانی بگێڕێتەوە و بـە چاکە و خێرکردن دڵیان بداتـەوە و بیانکاتە لایەنگر و پشتیوانی خۆی. ئەوانە کە پەیڕەوی لەم ئامۆژگارییە ناکەن و بە هۆی ترسنۆکی و تۆقاوی یان بە هۆی لێکدانەوەی نادروسـتەوە پەنا دەبەنە بـەر زەبروزەنگ، ناچارن بەردەوام ڕم و کێردەکەیان بە دەسـتەوە بێ، نە دەتوانن پشـت بە ژێردەسـتەکانیان ببەستن، نە ئەوان دەتوانن، بە هۆی ئەو توندوتیژی و سووکایەتییە بەردەوامەوە کە پێیان دەکرێ، لە ئەم دڵنیا بن و دڵی پێ خۆش بکەن. چونکە توندوتیژی نواندن، سووکایەتیکردن و زەبر وەشاندن دەبێ هەموو تێکڕا و بە جارێ بکرێ؛ بە جۆرێک کە کەمتر هەست بە تام و چێژی بکرێ و بە سووکایەتی و ناڕەواییەکی کەم بزانرێ؛ بەڵام چاکە و خێرکردن، دەبێ هێدی هێدی و بە شێنەیی بکرێت، بە جۆرێک کە زۆر چاک هەست بە تام و چێژی بکرێ. سەرباری هەموو شتێک، شالیار دەبێ بە چەشنێک لەگەڵ ژێردەستەکانی بجووڵێتەوە، کە ڕەوتی ڕووداوەکان بە باری نەهات یان هاتدا، نەبنە هۆی گۆڕانی هەڵسوکەوتی لەگەڵیان؛ چونکە ئەگەر ڕۆژگارە سـەخت و دژەکان بگەن، هەل و دەرفەتی خراپەکردن لە تۆ دەسـتێنن؛ ئەگەریش بتـەوێ بە چاکە و خێرکردن دڵیان بدەیتەوە لای ئەوان هیچ سـوودی نابێ، چونکە بە شتێکی زۆرەملێی دەزانن و بایەخی نازانن و بێبایەخ و سووکی دەکەن.

## ٩. سەبارەت بە شالیاری مەدەنی

١ ئێستا با ئاوڕێک لەو دیوی باسەکەمان بدەینەوە[1]، واتە کاتێک شارۆمەندێ ئاسایی بە یارمەتی و پشتیوانیی هاوولاتییانی دەبێتە شالیاری نیشتمانی خۆی، نەک لە ڕێگای شەڕئەنگێزی، ملهوڕی و زۆر توندوتیژیی ناپەسەند و گەندەکاریی هاوچەشنەوە. مەبەست لە شالیاری مەدەنی، ئەو کەسەیە بۆ گەیشتن بەم پلە و پایە پێویستی بە گشت لێهاتوویی و هێژایی یان یاری بەخت نییە، بەڵکوو زۆرتر پێویستی بە وشیاری، ژێهاتی و لێزانیی گونجاوە. جا بە بڕوای من کەسانی لەم چەشنە، یان بە هۆی پشتیوانیی گەلەوە یان بە هۆی پشتیوانیی ئاغاکانەوە لە سەر کورسیی دەسەڵات و تەختی شایی شار و وڵاتێ دادەنرێن، چونکە ئەم دوو مەیل و مەزاجە جیاوازە لە هەموو شارێکدا بوونیان هەیە[2]؛ ئەمەش لەوەوە سەرچاوە دەگرێ کە گەل بە ئاواتە لە لایەن ئاغاکانەوە حکومڕانی نەکرێ و نەکەوێتە ژێر دەسەڵاتی چەوسێنەرانەی ئەمانەوە و زوڵم و زۆری لێ نەکرێ؛ ئاغاکانیش تامەزرۆی چەوساندنەوە و زوڵم و زۆرکردن لە گەل و هێنانە ژێر دەسەڵاتی

١. ئاماژەیە – وەک هەر زوو ئاشکرا دەبێ – بە ئەو دوو حاڵەتەی لە سەرەتای بەشی پێشوودا باسی کرد.

٢. ئەم دوو مەیل و مەزاجە: لایەن، حیزب. بەراوردکردنی جەستەی سیاسی و جەستەی ئینسانی پێکەوە دەبێتە تەواوکەری دیمەنی جێی مەبەست، چونکە مەیل و مەزاج، بەپێی دەرمانناسیی گالێنیک، بۆ تەندروستیی ئینسان بەشێ فرە گرینگ و دیاریکەرن. ماکیاڤێلی لە دیسکورسەکانیشیدا ١، ٤. ١ دەنووسێ: «لە هەر کۆمارێکدا دوو مەیلی جیاواز هەیە، ئەوەی گەل و ئەوەی گەورەکان».

چەوسێنەرانەی خۆیان و حکومڕانیکردنین[1]؛ بە هۆی ئەم دوو مەیلە لێک جیاوازەوە لە شاردا، یەک لەم سێ دۆخە دێتە ئاراوە: یان پادشایی، یان ئازادی، یان ئاژاوە. یان پادشایی لە لایەن گەلەوە یان لە لایەن ئاغاکانەوە دادەمەزرێت؛ هەڵبەت ئەمەش بەپێی ئەو بوار و دەرفەتانە کە بۆ هەرکام لەم دوو بەرەیە هەڵدەکەوێ. چونکە کاتێک ئاغاکان دەزانن بەرگەی تەوژمی گەل ناگرن دەست ئەدەنە هەڵسەنگاندن و ڕاوێژ بۆ هەڵبژاردنی یەک لە خۆیان و کردنی بە شالیار، بۆ ئەوەی کە بتوانن لە ژێر سێبەری ئەودا حەز و مەرامەکانی خۆیان بەدی بێنن؛ لەو لایشەوە کاتێک گەل دەبینێ لە هەمبەر تەوژمی ئاغاکان خۆی پێ ڕاناگیرێ و باشاریان ناکات، دەست دەداتە هەڵسەنگاندنی یەکێک و دەیکا بە شالیار، بۆ ئەوەی کە بە زۆر و دەسەڵاتی خۆی بەرگریی لێ بکا.

٢ ئەوەی کە بە یارمەتی و پشتیوانیی ئاغاکان دەبێ بە شالیار فرە دژوارتر لەوە کە بە پشتیوانی و یارمەتیی گەل دەڕواتە سەر کورسیی دەسەڵات خۆ ڕادەگرێ؛ چونکە ئەوەی ئاغاکان دەیکەن بە شالیار، ئەوانە کە دەوریان داوە هەموو خۆ بە هاوشان و هاوپایەی ئەو دەزانن، هەر بۆیە نە دەتوانێ فەرمانڕەواییان بە سەردا بکات و نە دەتوانێ بەپێی ویست و حەزی خۆی هەڵیان سووڕێنێ و فەرمانیان پێ بدا. بەڵام ئەوەی کە بە پشتیوانی و یارمەتیی گەل دەگاتە دەسەڵات، یان هەر کەسی بە دەورەوە نییە، یان ئەوانەی کە ئامادە نەبن گوێبیستی بین ژمارەیان فرە کەمە. پتر لەمەش بەبێ زوڵم و زۆرکردن لە ئەوانی تر ناکرێ بە داد دڵی ئاغایان ڕابگری و ڕازییان بکەی. بەڵام بۆ ڕاگرتنی دڵی گەل و ڕازیکردنی پێویست بە زوڵم و زۆرکردن لە کەس ناکات؛ چونکە ئەوەی گەل لەگەڵ داددا کۆکترە لەوەی ئاغاکان؛ ئەمان دەخوازن بچەوسێننەوە و زوڵم و زۆری بکەن، بەڵام ئەوان دەخوازن زوڵم و زۆرییان لێ نەکرێ و نەچەوسێنەوە. هەروەتر شالیارێک کە دژ و دوژمنی گەلە قەت ناتوانێ لە ئاسایش و ئەرخەیانیدا بێ؛ چونکە گەل زۆرینەی

---

١. هەروەها لێرەش لەگەڵ ١.٥.٢ دیسکۆرسەکان بەراورد بکرێ، لەوێ کە دەنووسێ: «ئەگەر لە ئامانجی نەجیبان و ئاپۆڕە ورد ببینەوە، دەبینرێ کە نەجیبەکان چەندە بە ئاواتی فەرمانڕەوایین، کەچی ئاپۆڕە تەنیا بە ئاواتی ئەوەیە فەرمانڕەوایی بەسەردا نەکرێ». بە بڕوای ڤیڤانتی ئەمە دژایەتیی ئاشکرای ماکیاڤێلی لەگەڵ هەر فۆرمێک لە ئۆلیگارشی نیشان دەدا.

ئەو کۆمەڵگە پێکدێنێ. بەڵام دەکرێ لــە ئاغاکان دڵنیا بێ؛ چونکە ئەمان کەمینەیەکی بچووکن. خراپترین شتێک کە چاوەڕوانی شالیاری دوژمنی گەل دەکا، ئەوەیە کە گەل پشــتی تێ بکا و بەرەڵای بکا. بەڵام شالیارێک کە ئاغاکان دژ و دوژمنین، نەتەنیا دەبێ لەوە بترســێ کە بەرەڵای دەکەن و پشــتی تێ دەکەن، بەڵکوو دەبێ لەوەش بترســێ کە ئەوان لە دژی خۆ ڕێک بخەن و بۆ نەمانی تێبکۆشــن و بێنە جەنگییەوە؛ چونکە ئەمانە لە پێشــبینیکردن و دووربینیدا زۆر وریان و بۆ ڕزگاریی خۆیان هەمیشە دەستپێشخەری دەکــەن. بۆیە هەمــوو هەوڵی خۆیان دەخەنــە گەڕ بۆ وەدەســتهێنانی دڵ و لوتفی ئەو کەســەی هیوایان بە سەرکەوتنی بەستووە. بۆ شالیار پێویستە کە لە دڵی گەل و نەتەوەی خۆیدا بژیت و پشتی پێ ببەستێ؛ چونکە ئەم بێ [پشتیوانیی] ئاغاکان دەیکرێ و هەموو ڕۆژێک چۆن گەرەکی بێ دەتوانێ [ئاغاکان] هەڵوەشێنێتەوە و سەرلەنوێ دایانڕێژێتەوە و ناوبانگیان لێ بستێنێتەوە و پێیانی بداتەوە.

٣ بۆ چاکتر ڕوونکردنەوەی ئەم بەشــە، باســی ئەوە دەکەم چۆن دەبێ بە دوو تەرزی بنەڕەتی ئاغاکان هەڵسەنگێندرێن: یان ئەوەی بەرە بەرە پێشڕەوی دەکەن و خۆ ڕادێنن بە ئەوەی کە بە تەواوی ملکەچی ســەرکەوتوویی و بەختیاریی تۆ بن، یان وا ناکەن. ئەوانە کە خۆ بە ملکەچی ڕادێنن و بە ویســتی خۆیان دێنە ســەر هێڵ، پێویستە شانازییان پێ بدرێ و ڕێزیان لێ بگیردرێ. ئەوانەی کە خۆ بە ملکەچی ڕاناهێنن، دەکرێ بە دوو شێوە هەڵیانســەنگێنی، ئەگەر بە هۆی ڕەزیلیی گیان و نوقسانی سروشتی گیانەوە وا دەکەن[١]، ئەوکات تۆ دەبێ زۆر چاک ســوودیان لێ وەربگری، بە تایبەت ئەوانەیان کە ڕاوێژڤانی باشن، چونکە لە کاتی هات و ئارامیدا دەبنە هۆی شکۆ و شانازیی تۆ و لە کاتی نەهات و ئاســتەنگ و نەیاردا ترســت لێیان نییە؛ بەڵام کاتێک ملکەچبوونیان بە هۆی زیرەکی و بەرزەفڕییــەوە نییە، ئەوە بەو مانایــە کە فرەتر لە بیری بەرژەوەندیــی خۆیاندان تاکوو بەرژەوەندیی تۆ؛ ئەوســا شالیار دەبێ خۆی لێیان بوێرێ و وەکوو دوژمنی ئەنقەست و

---

١. واتە بە هۆی ترسنۆکی و نەوێرییەوە.

ڕووداماڵراوی خۆی ســەیریان بکا؛ چونکە لە کاتی نەهات و نەیاریدا هەردەم ئامادەن پشتی نەیارانی بگرن و هەوڵی ڕووخان و نەمانی بدەن.

٤ کەوابوو ئەو کەســە کە بە پشتیوانیی گەل دەبێتە شــالیار، پێویستە وەک دۆست و یاری خۆی ڕایگرێ: ئەمەش هەر فرە ئاســانە، چونکە تەنیا خواست و داواکاریی گەل لە شــالیار ئەوەیە نەچەوســێتەوە و زوڵم و زۆری لێ نەکرێ. بەڵام ئەوەی دژی ویستی گەل و بە خواست و پشتیوانیی ئاغاکان دەبێتە شالیار، بەر لە هەموو شتێک دەبێ هەوڵی بەدەســتهێنانی دۆســتایەتیی گەل بدا؛ ئەمەش ئەوکات ئاســانە کە هەوڵی پشتیوانی و لایەنگریی گەل بدا. چونکە مرۆڤەکان کاتێک چاکە و خێریان لەو کەســانەوە پێ دەگا کــە چاوەڕێی خراپەیان لێی بووە، زۆرتر خۆ بە دەریەســت دەزانن و بە ئەرکی خۆیانی دەزانــن بە چاکە وەڵامی چاکەکــەی بدەنەوە، بۆیە هــەر زۆر زوو دەبن بە لایەنگری و ئامادەی فەرمانبەری دەبن؛ چما هەر بە ویست و پشتیوانیی خۆیان بوویێ بە شالیار. ڕێگە و شــێوەکان بۆ وەدەستهێنانی پادشــاییی فرەن: هەمووانیش بەپێی بارودۆخ دەگۆڕدرێن و چونکە ناکرێ بخرێنە چوارچێوەی ڕێســایەکی نەگۆڕ و چەقبەستوو، لێرە ناپەرژێمە ســەریان و پشــتگوێیان دەخەم و ئا بەم جۆرە کۆتایی بەم باسە دێنم: پێویستە شالیار لە نێــو دڵی گەلدا بژیێت و بیانکاتە دۆســت و لایەنگری خۆی، ئەگینا لە کاتی کێشــە و نەهامەتییەکاندا هیچ چارەیەکی نییە. نابیدێ[١]، شــالیاری سپارتەکان، لە هەمبەر گەمارۆ و هێرشــی بەربڵاوی ســپایەکی بێژماری ڕۆما و یۆنان خۆڕاگریی کرد و، لە هەمبەریان بەرگریی لە نیشتمان و دەوڵەتی خۆی کرد. نابیدێ لەم شەڕەدا تەنیا پشتی بە گەل بەستبوو و خۆی لە دەستی هێندێک لە ئاغاکان ڕزگار کردبوو.[٢] بەم گوێرەیە دیارە ئەگەر گەل لە

---

١. Nabiede، خونکار و مەزنی سپارت لە ٢٠٦ تا ١٩٢ی پ.ز.؛ نابیدێ، دەستووری شۆڕشگێڕانەی بە زەرەری خێوەندار و مالکەکان چەسپاند، و ئاغاکانیش بە دژی کەوتنە خۆ و پەنایان بردە بەر ڕۆمی و یۆنانیــەکان، ئەوانیش بە هانایانەوە هاتن و لەو شەڕەدا پشــتیوانییان لێ کردن. ئــ نی. ئی.

٢. بە گوێرەی نووسراوەکانی لیڤیو، نابیدێ نزیک بە هەشــتا کەس لــە ئاغا و دەرەبەگەکانی لە گرتووخانە توند کردبوو و کوشتبوونی. ئــ نی. ف.

دژی بووایە نەیدەتوانی خۆی ڕابگرێ و ئەو شەڕەی پێ نەئەکرا.

٥ نامەوێ کەس بەم پەندە کە بەردەوام دەگوترێتەوە و دەڵێ: **کێ لە سەر گەل بناغە دادەنێ، ئەوە لە سەر قوڕ و لیتە بناغەی دادەنێ**، وەڵامی ئەم بۆچوونانەی من بداتەوە. چونکە ئەمە ئەودەم ڕاستە کە هاووڵاتیی ئاسایی پشتی پێ دەبەستێ و کاتێک لە لایەن دوژمن و حوکم بە دەستانەوە دەچەوسێتەوە و زوڵم و زۆری لێ دەکرێ و چاوەڕوانی ئەوەیە کە خەڵک فریای کەون و ئازادی بکەن. لە نموونەی لەم چەشنەدا زۆر جار دەکرێ فریو بخۆی، وەکچۆن لە سەردەمی ڕۆمییەکاندا، گراکییەکان[1] و لە فیرێنزیش مێسێر جۆرجۆ سکالی[2] وایان بە سەر هات.

٦ بەڵام ئەو کەسە کە پشت بە گەل دەبەستێ و دەیکا بە بناغە بۆ دەسەڵاتی خۆی، ئەگەر شالیارێک بێ کە توانای فەرمانڕەوایی و فەرماندانی بوێرانە و جوامێرانەی هەبێ و کەموکوڕی و ئائامادەیی تری نەبێ، لە کاتە نەهات و ناهەموارەکاندا قەت دەستەوەستان نابێ و لە تەنگانەدا نامێنێتەوە. ئەو دەتوانێ بە گیانێکی بەرز و هێژاوە خۆڕاگری بکا و گیانی خۆڕاگریی ژێردەستەکانیشی بەرز بکاتەوە و نەهێڵێ تووشی ورەبەردان و هەدادان ببن. وەها کەسێک هیچکات ناکەوێتە دۆخێکەوە کە گەل بخوازێ فریوی بدا؛ ئەوسا ئەویش دەزانێ کە بنیادی دەسەڵاتی خۆی لە سەر بناغەیەکی پتەو داناوە.

---

١. Gracchi، دوو برا بوون بە ناوەکانی تیبریۆ سێمپرۆنیۆ و کایو سێپرۆنیۆ. تیبریۆ کە نوێنەری ئاپۆڕەی ڕۆما بووە، (١٣٣پ.ز) لە ئاژاوە و بشێویەکدا کوژرا. کایو بۆ ئەوەی کە نەکەوێتە دەست نەیار و دوژمنانی، ساڵی (١٢٣پ.ز) خۆی کوشت. دوو کەسایەتیی دیاری مێژووی ڕۆما، کە بوونە بزوێنەری شۆڕشێکی مەزن بۆ بەرگری و پارێزگاری لە چینی وەرزێر و جووتیاران، کە بە هۆی دووهەم شەڕی پوونیک-ەوە [Punica] لە سەروبەندی هەڵوەشانەوە و تێداچووندا بوون. شۆڕشی ئەوان دژی کاریگەریە وێرانکەر و کارەسات هێنەرەکانی شەڕ بوو لە بواری کۆمەڵایەتی و سیاسیدا، کە دەوڵەت و حکومەتی ئۆلیگارشی هۆکاری بوو. بەڵام نالێهاتوویی و ناشیاویی ئەخلاقی و ئابووریی ئەو توێژەی ئەوان بە ئاوات ڕزگارکردنی بوون، بووە هۆی شکان و تێداچوونیان. شۆڕش بووە شەڕی ناوخۆیی و، بشێوی و ئاژاوە تەشەنەی کرد، تا لە ئاکامدا کۆماری ئازادیی ڕۆما کۆتایی پێ هات و حاکمیەتی سەربازیی چێساری جێی گرتەوە. ئـ.ئی.ئی.

٢. Giorgio Scali، لە سێپتەمبری (١٣٧٨ د.ز.) وەکوو ئەندامی حکومەتی فیرێنزێ هەڵبژێردرابوو. بۆ ماوەی سێ ساڵ یەک لە مەزنترین و سەرەکیترین کەسایەتییەکانی شار بووە. پێدەچێ سکالی بە هۆی دڵنیایی لە پێگەی خۆی، لەگەڵ ئەندامانی تردا دەمارگرژانە جووڵابێتەوە و زمانی لە ئاستیان نەپاراستبێ، بە جۆرێک کە لە ئاکامدا لە گرتووخانە بەندیان کرد و بە خواستی دەسەڵاتی خونکار لە (١٣ی ژانویەی ١٣٨٢) هەڵیانواسی و خنکاندیان؛ بێ ئەوەی کە لایەنگرانی بتوانن فریای کەون و ڕزگاری بکەن. ئـ.ئی.ئی.

٧ ئـەم جۆرە پادشـایانە کاتێک بـەرەو ڕووخان دەچـن کە دەیانەوێ لە شـالیاری مەدەنییـەوە ببن بە پادشـای ملهوڕ و پاوانخواز. چونکە ئەم شـالیارانە یان تەنیا بە هۆی خۆیانـەوە فەرمانڕەوایـی دەکـەن و فەرمـان دەدەن، یان لـە ڕێگای کاربەدەسـت و ئەنجومەنەکانەوە. لەم دۆخەدا، دەسەڵاتی شالیار زۆر لاوازە و دەسەڵاتی لە مەترسیدایە. چونکە بە تەواوی بەسـتراوە بە ئیرادەی ئەو هاووڵاتییانەوە کە کاربەدەسـتن و ئەندامی ئەنجومەنەکانن؛ ئەمانەش لە سەردەمە نەهات و هەستیارەکاندا دەتوانن دژایەتیی بکەن و بەگژیـدا بچنەوە، یان بەجێی بێڵن و گوێ نەدەنێ و بە ئاسـانی ببنە هۆی خسـتنی و دەسەڵاتی لێ بستێننەوە. هەروەها شالیاری ئاوا، لە کاتە هەستیار و مەترسیدارەکاندا بوار و کاتی ئەوەی نییە هەموو دەسەڵات لە دەستی خۆیدا پاوان بکا؛ چونکە هاووڵاتییان و ژێردەسـتەکانی بە فەرمانبەریی حکومەتی ئەنجومەنەکان ڕاهاتوون و لە کاتی هەستیار و پڕمەترسیدا ئامادە نین ملکەچی فەرمانەکانی شالیار بن. وەها شالیارێک لە سەردەمی دڕدۆنگـی و تووشـدا نازانێ متمانە بە کێ بـکا و لە دۆزینەوەی کەسـی جێی ئیتواردا تووشـی قاتوقڕی دەبـێ؛ چونکە ئەو ناتوانێ ئیتوار بە ئەوەی کە لە سـەردەمی ئارامیدا دەبینێ بکا، ئەو دەمە کە هاووڵاتییان پێویسـتیان بە دەوڵەت هەیە؛ چونکە لەم کاتانەدا، واتە کاتێک مردن دوورە، هەمووان ئامادەن لە پێناویدا بمرن، گشتی ئامادەیە بە هانایەوە بچێ و هەموو کەس پەیمان و بەڵێنی پێ دەدا؛ بەڵام لە کاتە نەهات و هەستیارەکاندا، کە بۆ پاراستنی دەسەڵاتی پێویسـتی بە هاووڵاتییانە، تەنیا کەمینەیەک بە هانایەوە دەچن و بەرگریی لێ دەکەن. ئەم ئەزموونە، کاتێک پڕمەترسیتر و ترسناکترە کە تەنیا جارێک ڕوو بدا و دووپاتبوونەوەی بۆ نەبێ. بەڵام شالیاری ژیر و بەڕاوتەگبیر دەبێ وەها بیر و ڕامانی کردبێ کە لە هەموو سەردەمەکاندا هاووڵاتییان پێویستیان بە دەسەڵاتی ئەم بێ؛ ئەوسایە کە بەردەوام وەفایان بۆی ڕوو لە زیاد بوونە و پشـتیوانی دەبن و لە کاتی تەنگانەدا پشتی بەرنادەن.

## ١٠. بە چ شێوەیەک دەبێ هێزی پادشاییەکان هەڵسەنگێندرێت؟

١ لە ڕاڤەکردنی چەندایەتیی دەسەڵات و توانایی شالیاردا بە باشی دەزانم ئاوڕ لە بوارێکی تری باسەکە بدەمەوە و بیر و ڕای خۆمی لە سەر دەرببڕم. ئەویش ئەوەیە کە ئاخۆ دەسەڵاتی شالیارێک ئەوەندە بەهێزە کە لە کاتی پێویستدا بتوانێ پشت ئەستوور بە هێزی خۆی ڕاوەستێ یان هەمیشە پەکی دەکەوێ و پێویستی بە ئەوانی ترە کە بە هانایەوە بێن و بەرگریی لێ بکەن. بە مەبەستی چاکتر ڕوونکردنەوەی ئەم بەشە لە باسەکەم دەپەرژێمە سەر ئەو شالیارانە کە دەتوانن تەنیا بە پشتبەستن بە هێزی خۆیی خۆیان ڕابگرن و پارێزگاری لە خۆیان بکەن. ئەوانە کە دەتوانن بە هۆی فراوانیی هێزی مرۆیی یان دارایی زۆرەوە سپایەکی گونجاو ساز بکەن و لە کاتی سەرهەڵدانی شەڕ و ئاژاوەدا پشت ئەستوور بە هێزی خۆیان لە مەیدانی شەڕدا بڕۆن بە گژ دوژمندا و بەرەنگاری ببنەوە. پاشان ڕاوبۆچوون و دادوەریی خۆم لەمەڕ ئەوانەش دەردەبڕم کە هەمیشە پێویستیان بە ئەوانی ترە کە بێن بە هانایانەوە و توانای ئەوەیان نییە کە لە مەیدانی شەڕدا بڕۆن بە گژ دوژمندا، بەڵکوو ناچارن لە پشت شوورە و دژەکانی شارەوە خۆیان حەشار بدەن و بەم شێوەیە بەرگری لە خۆیان بکەن. پێشتر حاڵەتی یەکەممان ڕاڤە کرد، ئەوەندەش پێویست بێ دواتر لەسەری دەدوێینەوە[١]. سەبارەت بە حاڵەتی دووهەم، تەنیا ئەتوانین بێژین وەها

١. بەشەکانی ١٢ و ١٤.

شـالیارانێک دەبێ ئاگادار بن کە پێویستە قەڵا و شوورەی قایم لە دەوری شار و باژێری ژێر دەسـەڵاتی خۆیاندا ساز بکەن؛ نابێ دڵ بە ئاوایی و ئاوەدانییەکانی دەورویەری شار خۆش بکەن و حەساویان لەسەر بکەن. ئەو کەسە کە شار و خاکی ژێر دەسەڵاتی خۆی چاک قایم دەکا و لە هەمبەر دەوڵەتانی دیکە و لەگەڵ هاووڵاتییان و بندەسـتەکانی بەو شێوەیە کە پێشتر گوترا و پاشتریش دەگوترێ دەجووڵێتەوە، ئەوسا ئەوانەی کە بیانهەوێ پەلامـاری بدەن زۆر بە وردی بیـری لێ دەکەنەوە؛ چونکە مـرۆڤ دوژمنی ئەو کار و چالاکییانەیە کە دژوار و تەژی لە ناهەمواری و ئاسـتەنگین. جا کەوایە، پەلاماردانی ئەو شار و هەرێمەی باش پارێزراوە و شالیاری نەکەوتووە بەر تووک و نەفرەتی گەل، کارێ گەلێ ئەستەمە و بە هیچ جۆرێ ئاسان نانوێنێ.

٢ وەک نموونە لەم بوارەوە دەکرێ ئاوڕ لە شـارەکانی ئاڵـمان بدەینەوە. ئەوان هەر زۆر ئازادانـە دەژین و ئاوەدانیـی زۆر کەم لە دەورویەریاندا هەیە. ئـەوان بە ئارەزووی خۆیان پەیڕەوی لە ئیمپراتۆر دەکەن و گوێبیسـتی دەبن؛ چونکە نە لە ئەو دەترسـن، نە لە هێز و دەسـەڵاتانی تری هاوکەوشـەنیان؛ ئەوان ئەوەندە قەڵا و شوورەی سەختیان بە دەوری شارەکانی خۆیاندا ساز کردووە کە ئەوەی کە کەوێتە بیری داگیرکردنیان دەزانێ کە ئەمە کارێکی پڕ دژوار و تاقەتپڕووکێن دەبێ. ئەوان بە دەوری هەموو شـارەکانیاندا قەڵا و دیوار و کەنداڵی گونجاویان دروسـت کردووە. بە ڕادەی پێویست تۆپیان هەیە، پتر لەمانە لە خێوەتی گەورە گەورەدا کە موڵکی گشـتییە، ڕێک بەشی ساڵێک تفاق و خـواردن و خواردنەوە و سـووتەمەنی ڕادەگرن. بۆ ڕاگرتنی ئاپۆڕە بە تێروتەسـەلی، بێ ئەوەی ئەنبارەکانی هەڵگرتنی تۆشـە و بژیوی گشـتی چۆڵ بکرێ، هەمیشە بۆ ماوەی یەک سـاڵ کاریان بۆ دابین دەکەن. بژێوی و پێداویسـتییەکانی ژیانی هاووڵاتییان لەم کارانـەوە و لە کارگەکانی پیشەسـازی و بەرهەمهێنانەوە دابین دەبێ و ئەمانە دەبنە هۆی بزاڤی ژین لە دەمارەکانی ژیانی شاردا؛ هەروەتر ئەوان هەمیشە هێزی چەکداریان ساز و ئامادە ڕادەگرن. دیارە بۆ سـاز و ئامادەڕاگرتنیان بە بەردەوامی گەلێک دوزەنە و داب و

دەستووری دیکەیان هەیە.

٣ جـا بۆیە شـالیارێک کە شـارێکی وەها چـاک ڕێکخـراو و ڕێکوپێکی هەبێ؛ ئەگەر کارێک نەکا کە بکەوێتە بەر تووک و نەفرەتی ژێردەسـتەکانی، ئەستەمە هێرش بکرێتە سەری. ئەگەریش کەسێ پەیدا ببێ و گەرەکی بێ هێرش بکاتە سەری، دەستی لـێ هەڵدەگرێ و بە سەرشـۆڕییەوە دەگەڕێتـەوە؛ چونکە کاروباری جیهـان بەردەوام لە گۆڕاندایە، بۆیە ئیمکانی نییە کەسـێک بە سـپاوە یەک سـاڵی ڕەبەق لە شـوێنێک بچەقێت و گەمارۆی بدا و دەسـت لە سەر دەست چاوەڕێ بێ. ئێستا ئەگەر کەسێک بخوازێ بەرسـڤی ئەمە بداتەوە کە: ئەگەر دارایی و سـووتەمەنیی خەڵک لە دەرەوەی قەڵا و شـوورەکانەوەیە و بـۆ درێژماوە خۆ لە هەمبەر گەمارۆ ڕاناگـرێ و خۆخوازی و خۆشەویسـتیی خۆی دەبێتە هۆی ئەوەی خۆشەویستیی شـالیار لە بیر بکا، لە وەڵامدا دەڵێم: شـالیاری ژیر و دوورەنوارِ هەمیشە بەسـەر ئەم کێشە و ئاستەنگانەدا زاڵ دەبێ و هومێدی ئەوە ئەداتە ژێردەستەکانی کە ئەم ڕۆژە سەختانە بەریان کورتە و زۆر ناخایەنن و، جارێک بە ترساندن لە دڕی و دڵڕەقیی دوژمن ئارام ڕایاندەگرێ، جارێک بە کارامەیی و وشـیاریی ئەوانـەی لای وایە زۆر بە گوڕ و تینن و بێباکـن دڵنیایان دەکا. پتر لەمەش دوژمنی ژیر و حەساوگەر هاوکات لەگەڵ گەیشتن و هەڵکوتانە سەر شار دەبێ ئەو شارە کاول بـکا و ئاگری تێبەربدا. بەڵام ئەو کاتە پیاوانی شـار ورەیان بەرزە و بە هەموو گوڕ و تینـەوە و لەوپەڕی لەخۆبردووییەوە بەرەنگاری دەکەن. بۆیە لەم بابەتەوە شـالیار نابێ ئەوەندە تووشـی دڕدۆنگی ببێ؛ چونکە دوای چەنـد ڕۆژێک، ئەو دەمەی گوڕ و تین و ورەی هێزەکانی بەرەو خاوبوونەوە دەڕۆن، ئیتر هەموو زەبرێک وەشێندراوە و هەموو خەسارێک دراوە. دوژمن هەرچەندێک وێرانکاریی پێ کرابێ ئەوە کردوویەتی و ئیتر چارە نییە و کار لە کار ترازاوە. ئێسـتا ئیتر دانیشـتووانی شار چونکە لایان وایە شالیار لە هەمبەر ئەوان بەرپرسـە و پاراستنی ئەوانی لە ئەستۆیە و بە هۆی بەرگریی ئەوەوە ماڵ و حاڵیان سووتاوە و هەموو سامانیان کاول و وێران کراوە، لە دەوری کۆ دەبنەوە و پەیمانی

لەگەڵ نـویێ دەکەنەوە. چونکە سروشـتی مرۆڤەکان وایە کە لە هەمبەر ئەو کەسـە کە چاکەیان دەرهەق دەکا خۆ بە بەرپرس و دەربەست دەزانن؛ ڕێک بە وێنەی ئەوانە کە لە کەسێکەوە چاکە و خێریان پێ دەگا. بەم پێیە و بە چاک لێکدانەوەی هەموو ئەمانە، بۆ شـالیاری ژیر و دوورەنوارِ، دژوار نییە پێش و پاش گەمارۆ، گیان و ورەی هاوولاتیان و ژێردەستەکان بە بەرزی ڕابگرێ؛ بە تایبەت ئەو کاتە کە نە قاتوقڕیی بژیوی ژیان هەیە، نە قاتوقڕیی ورە و هێزی بەرەنگاری.

## ١١. سەبارەت بە شالیاری مەسیحی

١ ئێستا کاتی ڕامان لەو شالیارانەیە کە لە لایەن کلیساوە لە سەر تەختی پادشایی شار یان مەڵبەندێک دادەنرێن، واتە شالیاری مەسیحی. گشت کێشە و گرفتارییەکانی پێوەندیدار بەم پادشاییانە هی پێش بە خاوەن بوونیانە. چونکە ئەم پادشاییانە یان بە هۆی هەڤیازی و ژێهاتییەوە یان بە هۆی یاری بەختەوە بە دەست دەهێنرێن؛ بەڵام بەبێ هەر کام لەمانە دەکرێ ڕابگیردرێن و بپارێزرێن. چونکە ئەو داب و دەستوورە ئایینییە کەڤنارە کە لە پشت ئەمانەوەیە ئەوەندە ڕەگ و ڕیشەدار و بەهێزە کە شالیار هەر جۆرێک فەرمانڕەوایی بکا و بژیت، ژێردەستەکان گوێبیستی دەبن و پشتیوانیی لێ دەکەن. ئەم شالیارانە تەنیا خاوەن دەوڵەتن و بەرگری لێ ناکەن، خاوەن ژێردەستە و فەرمانڕەواییان ناکەن. ئەم دەوڵەتانە، سەرەڕای ئەوەی کە بێدالّدەن لە چنگ شالیار دەرناهێنرێن. ژێردەستەکانیش، چونکە فەرمانڕەواییان بە سەردا ناکرێ، بایەخی ئەوتۆیان پێ نادەن و ناکەونە بیری ڕۆیشتن و جێهێشتنی هەرێمی ژێر دەسەڵاتی ئەمان. بۆیە تەنیا ئەم پادشایانە بەختەوەر، خۆشگوزەران و ئارامن؛ دیارە لە بەر ئەوەی کە هێز و هۆی سەرەوەی ئەمانەی ڕاگرتووە و ئاوەزی مرۆڤی پێ ڕاناگات، ئاخاوتن لەمەڕیان پشتگوێ دەخەم؛[1] چونکە

---

١. زمانی سەرجەم ئەم بەشە، سەرەڕای ئەوەی بە ڕواڵەت ڕێزدارانەیە، بەڵام لە ڕاستیدا زمانێکی تەشەرئامێز و پولیمیکی، مشتومڕانەیە. ئـ ئی. ڤ.

ئەمانە بە ئیرادەی یەزدان دامەزراون و ڕاوەستاون، بۆیە ئاخاوتن لەسەریان کاری مرۆڤی لەخۆباییە. بەڵام ئەگەر کەسێ لێم بپرسێ ئەوە چۆنە کە کلیسا لە دەسەڵاتی دنیاییدا بوو بە خاوەن ئەو دەسـەڵاتە مەزنە -بە جۆرێک کە وەک دەزانین گشـت دەسەڵاتدارانی وڵاتی ئیتالیا کە تا پێش ئەوەی ئەلێکساندری شەشەم ببێتە پاپا[1]، نەتەنیا ئەوانە کە خۆیان بە دەوڵەت و دەسـەڵاتدار دەزانی، تەنانەت هەر بارۆن و خان و دەرەبەگێ پایەنەوی و کەم دەسەڵاتیش، ترسیان لە دەسەڵاتی دنیایی کلیسا نەبوو، کەچی ئێستا پادشای فەڕانسە لێی دەترسـێ و کلیسـا توانی لە ئیتالیا دەریپەڕێنێ و بووە هۆی تێکشـان و لە بەریەک هەڵوەشـاندنی دەوڵەتی ڤێنێزییەکانیش[2]- ئەگەرچی ئەم شـتانە دیار و ئاشکران، بەڵام ئەگەر من بەشـێکی بەرچاو لە کارەکانی پاپا و کلیسـا وەبیر دێنمەوە، بەو مانایەیە کە بە زێدەبێژی و نەپێویستی نازانم.

٢ بەر لەوەی کارلۆی هەشـتەم، شـای فەڕانسـە، هێرش بکاتە سـەر ئیتالیا و بیکاتە گۆڕەپانی ڕمبازیی خۆی، ئەم وڵاتە لە ژێر دەسـەڵاتی پاپا، ڤێنێزییەکان، شـای ناپۆلی، دووکی میلانۆ و فیورێنتینییەکاندا بوو.[3] ئەوسـا ئەم زۆردارانە دەبوو ئاگادار و چاودێری دوو شتی سەرەکی بن: یەکەم ئەوەی کە هێزی بێگانە بە سپاوە هەڵنەکوتێتە سەر ئیتالیا؛ دووهـەم ئەوەی کـە هیچکام لە خۆیان هەوڵـی فراوانکردن و پـان و بەرینکردنەوەی دەسـەڵاتی خۆی نـەدا و چاو نەبڕێتە دەوڵەتانی هاوسـنووری.[4] ئەوانە کـە دەبوو زۆر

---

١. هەتا سەردەمانی ئەلێکساندری شەشەم (١٤٩٢-١٥٠٣) دەوڵەت و دەسەڵاتی کلیسا، بە بۆنەی لەتبوون و جیابوونەوەی مەزنی ڕۆژاواوە، بە قورسی لاواز ببوو. ئـ نی. ف.

٢. ئاماژەیە بە دوو شـەڕ کە جوولیوی دووهەم دژی ڤێنێزیا و فەڕانسـە بەرپای کردبوو. ڤێنێزیا دەسـەڵاتدارییی بە سـەر وشـکاییدا لە دەسـت دابوو (لە ١٥١٦ هەر هەمووی بە دەسـت هێنایەوە)، فەڕانسـەش لە ئیتالیا دەرکرابوو (هەتا شەڕی مارینیانو، Marignano، لە ١٥١٥ نەیتوانیبوو بگەڕێتەوە ئەم وڵاتە). ئـ نی. ف.

٣. بەر لە هاتنی کارلوی هەشتەم بۆ ئیتالیا لە ساڵی ١٤٩٤ ئەوانە پێنج «زۆرداری» ئیتالیای بوون. ئـ نی. ف.

٤. ئەم تێبینیـانە لە نووسراوەکانی ئەم سـەردەمەدا بەر چاو دەکەون، بۆ نموونە گویچاردینی لە *مێژووی فیورێنتینێ*دا (کە لە نێوان ١٥٠٨ هەتا ١٥١٢ نووسراوە) لە بەشـی ١١دا سـەبارەت بە هاتنی کارلوی هەشتەم، دەنووسێ: «ئاگر و تاعوونێک هاتبووە ئیتالیاوە کە نەتەنیا دەوڵەتانی گۆڕی، بەڵکوو شێوەی فەرمانڕەواییان و شێوەی شەڕیشی گۆڕی، چونکە ئیتالیا پێشتر بە گشـتی بە سـەر پێنج دەوڵەتدا دابەش ببوو، پاپا، ناپۆلی، ڤێنێزیا، میلانۆ و فیرێنزێ، هەموو خوێندنەوەیان ئەوە بوو کە شـتەکانی خۆیان بپارێزن. هەموو چاودێریی ئەوەیان دەکرد کە کەس ئەوەی ئەوی تریان داگیر نەکات و ئەوەندە گەشە

ئاگاداریان بێ پاپا و ڤێنێزییەکان بوون. بۆ بەرەنگاری لە فرەخوازیی ڤێنێزییەکان، هەموو ئەوانی تر دەبوو پێکەوە پێک بێن و یەکگرن؛ وەکچۆن بۆ پاراستنی فێرپارا وایان کرد. بە مەبەستی دروستکردن بەرهەڵست و لەمپەر بۆ پاپا، دەوڵەتانی ناوبراو کەڵکیان لە دەرەبەگەکانی ڕۆما وەردەگرت. ئەوانیش لە دوو بەرەوە پێک هاتبوون: واتە ئۆرسینی و کۆلۆنێسی. ئەم دوو بەرەیەش بەردەوام شەڕ و ئاژاوەیان لە نێواندا هەبوو؛ لە ڕۆما هەر دەم ساز و ئامادە و چەک بەدەست دەرگای بارەگای پاپایان چۆڵ نەدەکرد و ببوونە هۆی لاوازیی دەسەڵاتی کلیسا. ئەگەرچی هەندێک جار کەسانێکی چاونەترس لە وێنەی پاپا سیستۆی شەشەم[1] هەڵدەکەوتن، بەڵام بۆ خۆرزگارکردن لە دەست ئەم گرفت و سەرئێشانە تەنیا یاری بەخت و وشیاری بەس نەبوو. هەڵبەت هۆکاری سەرەکی کورتیی ژیانی پاپاکان بوو؛ چونکە تەمەنی دەسەڵاتداریی پاپاکان ئەوپەڕەکەی دەساڵی دەخایاند؛ دەی لەو ماوەیەدا فرە دژوار بوو کە بتوانێ یەکێک لەو لایەنانە بەزێنێ و کز و لاوازیان بکا. هەروەها ئەگەر پاپایەک هەوڵی دەدا ڕیشەی کولونێسییەکان لە بن دەربێنێ و دوایان ببڕێ، پاپایەکی تر دەگەیشتە دەسەڵات کە دوژمنی ئۆرسینییەکان بوو و دەبووە هۆی ژیانەوە و گەشانەوەی کولونێسییەکان؛ بەڵام ئەوندەش کاتی بە دەستەوە نەبوو کە بە تەواوی ئۆرسینییەکان دوابڕاو بکا و ڕەگ و ریشەیان کوێر بکاتەوە. ئەمانەش وایان کردبوو لە ئیتالیا بە چاوی سووک سەیری دەسەڵاتی دنیایی پاپا بکرێ و هێندە ڕێزی لێ نەگیردرێ. پاشان پاپا ئەلێکساندری شەشەم دەسەڵاتی گرتە دەست. ئەلێکساندری شەشەم هەر زوو سەڵماندی کە لە نێوان هەموو ئەوانەی کە تا ئەودەم ببوون بە پاپا، زۆر چاکتر دەیزانی بە قازانجی خۆی کەڵک لە دەسەڵات و دراو وەرگرێت و وەگەڕیان بخات. ئەلێکساندری شەشەم لە ڕێگەی ڤالێنتنۆی کوڕیەوە و بە قۆزتنەوەی بواری

نەکات کە هەموو لێی بترسن[...]. بەڵام ئێستا بە بۆنەی هاتنی فەڕانسەوییەکانەوە، وەک ئەوەی باهۆزێ هاتبێ، هەموو شتێ زێر و ژوور بوو، یەکێتیی ئیتالیا شکا و لەتوپەت بوو».

١. Sisto IV، لە ساڵی ١٤٧١ تا ١٤٨٤ پاپا بووە. لە ئاستێکی بەرینداپەرەی بە سیاسەتی خزم و خزمێنی داوە، هەر ئەمە بووە هۆی سەرهەڵدانی گەلێک شەڕ و ئاژاوە لە نێوان پادشایی و میرنشینەکانی ئیتالیا. ئـ.نی.نی.

هاتنی فەڕانسییەکان بۆ ئیتالیا، هەموو ئەوانەی کرد و بە ئەنجامی گەیاندن کە من پێشتر، لەو شـوێنە کە کار و چالاکییەکانی دووک فالێنتینۆم تاوتوێ کـرد، لێیان ڕامام و ڕافەم کردن. ئەگەرچی مەبەست و ئارمانجی پاپا مەزنکردنەوەی دەسەڵاتی دنیایی کلیسا نەبوو، بەڵام هەموو ئەوانەی کە دووک فالێنتینۆ بە ئەنجامی گەیاندن بە قازانجی گەورەبوونەوەی دەسەڵاتی کلیسا شکانەوە؛ چونکە هەر دوا بەدوای مەرگی پاپا و کوژانەوەی چرای ژینی دووکی کوڕی، کلیسا بوو بە میراتگر و خاوەنی هەموو ڕەنج و ماندووبوونی ئەوان. دوای ئەلێکسـاندر، جوولیوی دووهـەم جێگەی گرتەوە. جوولیوی دووهەم کەوت بەسـەر کلیسـای خاوەن دەسەڵات و دەوڵەمەندا. کلیسـا بوو بە خاوەن هەموو ڕومانیا. بارۆن و دەرەبەگەکانـی ڕۆما هەموو تێداچووبوون و ڕەگ و ڕیشـەیان کوێر ببۆوە. ئەو لایەن و دەستە و تاقمانە کە بەر لە ئەم هەبوون، پاپا ئەلێکساندر هەموویانی داپڵۆساندبوو و لاوازی کردبوون. جوولیو کە دیتی دەستی بۆ کۆوەکردنی پارەی زیاتر کراوەیە و ڕێگەی وەهای بۆ خۆش کراوە کە پێشتر ئەلێکسـاندر پێی لە سەر دانەناوە و کەڵکی لێ وەرنەگرتووە، نەتەنیا بەو ڕێگایەدا ڕۆیشت، بەڵکوو پەرەی پێدان و ئەم ڕێگانەی هەراو کردەوە؛ پاشان کەوتە بیری داگیرکردنی بولۆنیا و بنبڕکردن و هەڵوەشاندنەوەی دەسەڵاتی ڤێنێزییەکان و دەرکردنی فەڕانسەییەکان لە ئیتالیا. هەموو ئەم کار و چالاکیانەی سەرکەوتووانە جێبەجێ کرد؛ بەڵام جوولیو ئێستا ئیتر هەموو شتێکی لە پێناو زیاتر مەزنکردنی دەسەڵاتی کلیسا دەکرد. ئەم ئیتر مەبەسـتی بەرژەوەندیی تایبەتی خۆی نەبوو؛ تازە ئەم کار و چالاکییانە ببوونـە مایـەی پێداهەڵگوتنیشـی. جوولیـو، ئۆرسـینی و کولونێسـییەکانی هەر لەو بارودۆخەدا ڕاگرت کە کەوتبوو بەسـەریاندا. ئەگەرچی چەند سەرکردەیان تێدا بوو کە لێیان دەوەشایەوە ئاژاوە بنێنەوە، بەڵام ترس لە دوو بابەت جووڵەی لێ بڕیبوون: یەکەم، گەورەیی دەسەڵاتی کلیسا تووشی حەپەسانی کردبوون؛ دووهەم، ئەوەی کە کاردیناڵ و کەسێتیی مەزنیان لە نێو پلەدارەکانی کلیسادا نەبوو. لە ڕاستیدا هەموو ئەو شەڕ و ئاژاوانە کە لە نێوان ئەواندا ڕوویان دەدا، لە ژێر سـەری کاردیناڵ و مەزنەکانی کلیسادا بوو. ئەو

لایەن و دەســتە و تاقمانە، کاتێک کاردینالّیان هەیە قەت ئارام ناگرن. چونکە ئەمانە لە ڕۆما و دەوروبەریدا وزە و تینیان دەگەیاندە لایەن و بەرەکان و دەیانگەشـاندنەوە؛ بارۆن و بەگەکانیش ناچار بوون پشـتگیری و داکۆکییان لێ بکەن. بەم شـێوەیە لە بەرزەفڕی، لایەنگری و سەرپشککردن ناکۆکی و شەڕ دەکەوتە نێوان بارۆن و بەگەکان. لە کۆتاییدا دەڵێم: ئەگەر ئەوان بە سپاوە بوونە هۆی پەرەسەندن و مەزنیی دەسەڵاتی کلیسا، ئێستا کە پایەبەرز و بەڕێز پاپا لێونی دەیەم[1] کەوتووە بە سەر کلیسای فرە گەورە و مەزندا، هیواداری و چاوەڕوانیی ئەوەی لێ دەکرێ بە چاکە و خێری بێئەژماری خۆی، لە بواری ڕۆحانی و ئاسمانییەوە، ببێتە هۆی مەزنتربوونی.

---

١. Leoni X، نازنـاوي جوڤانــی دێ مێدیچی ـیە کە لە هەڵبژاردنــی ٢١ی فێبرای ١٥١٣دا بۆتە پاپــا. ڕێک ئەو دەم کە ماکیاڤێلی خەریکی نووسینی کتێبی شالیار بووە.

## ١٢. سەبارەت بە پێکهاتەی ملیشیا و سەربازانی بەکرێگیراو

١ دوای ئاخاوتـــن و ڕاڤەکردنی چڕ و پڕ ســـەبارەت بە تایبەتمەندی و چۆنایەتیی ئەو پادشـــاییانە کە لە ســـەرەتاوە مەبەســـتم بوو لێیان ڕامێنم و تاوتوێیان بکەم؛ دوای ئەوەی کە لە هەندێک شـــوێن سەرنجمدایە ســـەر ئەو هۆکارانەی پێوەندییان بە خێر و شەڕی ئەوانەوە هەبوو و لێکیانم دایەوە؛ دوای دەستنیشـــانکردنی ئەو شـــێوازانە کە زۆر کەس بۆ بەدەستهێنان و پاراستنی پادشـــایی کەڵکی لێ وەرگرتوون؛ ئێستا ئەوە ماوەتەوە قسە و باسێکی گشتی لە سەر شـــێوازەکانی پەلاماردان و بەرەنگارییان بکەم، ئەمەش ڕەنگە هەرکام لەو شالیارانە کە باسمان کردن لەگەڵی ڕوویەڕوو ببنەوە بەرۆکیان پێبگرێ.

٢ بەر لەمە باسی ئەوەمان کرد کە شـــالیاران بۆ پاراستنی دەوڵەتی خۆیان چۆن دەبێ خاوەن بنەڕەتی قورس و قایم بن، دەنا لە بەر تەوژم و زەبری دژەکاندا خۆیان پێ ڕاناگیرێ و بەشیان لەناوچوونە.[١] دیارە هەموو دەوڵەتان بنەڕەتی سەرەکییان پێویستە، لە نوێیەکانەوە بگرە هەتا لەمێژینەکان یان تێکەڵاوێک لە هەر دووکیان. دەســـتوور و یاســـای چاک و سپای چاک دوو پایەی سەرەکی و بنەڕەتین؛ چونکە لەو جێگایەی کە سپای چاک نییە، ناکرێ یاسا و دەســـتووری چاک ببێ و لەو جێگایەش کە سپای چاک هەیە گونجاو و شـــیاوە دەستوور و یاســـای چاک هەبێ. من لێرەدا ئاخاوتن لە دەستوور و یاسای چاک

١. بنوارە بەشی ٧، بە تایبەت پاراگرفی ٣، هەروەها بەشی ٩.

پشتگوێ دەخەم و باسی سپا دەکەم.

٣ بۆیە پێم وایە ئەو سپایە کە شالیار بۆ بەرگری و پاراستنی دەوڵەتی خۆی کەڵکی لێ وەردەگرێ یان هی خۆیەتی، یان بەکرێگیراوە یان سپای کۆمەکییە یان تێکەڵاوێکە لە هەر دووکیان.[1] بەکرێگیراو و کۆمەکی بێکەڵک و هاوکات جێگای مەترسین؛ ئەو کەسە کە دەوڵەتی لە سەر [سپای] بەکرێگیراو دامەزرێنێ، هەرگیز سەقامگیری و ئەرخایەنی بــە خۆیەوە نابینــێ، چونکە هیچیان یەکگرتوو نین و هەر کەس بە شــوێن بەرزەفڕی و بەرژەوەندیی خۆیەوەیە. ناتەکووز، بێسەروبەرە و بێ بیر و بڕوان و وەفایان بۆ کەس نییە. لە کاتی ئاشتی و لە نێو دۆستاندا دەبڕن، دەکوژن و کوشتوبڕ دەکەن، بەڵام لە کاتی شەڕ و ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ دوژمن خوێڕی، ترسنۆک و بەزیون: لە خوا نەترس و بێ ئیمانن و لە هەمبەر مرۆڤیش بێباوەڕ و بێوەفان؛ ئەمانە لە هەر حاڵەتێکدا دەبنە هۆکاری تێکشکان و ڕووخان. لە کاتی ئاشتی و ئاسایشدا ڕاوڕووتی ئەو کەسە دەکەن کە بە کرێی گرتوون، لە کاتی شەڕدا دەکەونە شرەخۆری و دوژمن تاڵان دەکەن. هۆکاری ئەمانەش ئاشکرایە، ڕاســتی ئەوەیە کە بێجگە لەو مووچەیەی کە لە تۆی وەردەگرن، هیچ خۆشەویســتی و ئەڤینێک ئەوان بە تۆوە نابەســتێتەوە؛ ئەمەش بە تەنیا بۆ ئەوە نابێ ویســتی ئەوەیان تێدا دروست بکات کە لە پێناو تۆدا خۆ بە کوشت بدەن؛ تا کاتێک لە شەڕدا نیت تۆیان دەوێ و بەپێی خۆشــییەوە بەکرێگیراوی تۆ دەبن. بەڵام لەگەڵ سەرهەڵدانی شەڕ دەیانهەوێ بە هەر جۆرێک بووە خۆیــان بدزنەوە و هەڵبێن و بە جێت بهێڵن. بە ئاوڕدانەوە لەوەی کە گوترا و و بڕواپێکردنی، باوەڕ ناکەم پێویست بکا پتر لەم بوارەوە خۆ ماندوو بکەین؛ چونکە نموونەی زیندوومان لە بەرچاوە. ڕاستی ئەوەیە کە هۆی کاولبوونی ئێستای ئیتالیا، تەنیا ئەوەیە کە ساڵانێکی زۆرە پشتی بە هێزی بەکرێگیراو بەستووە و بە هیوای ئەوانەوە سەری لە سەر سەرینی خاترجەمی داناوە. مەبەست لە سەرینی خاترجەمی، هەمان ئەو

---

١. هەروەها بڕوانە دیسکۆرسەکان ٢، ٢٠. ١: «ئەگەر لە کتێبێ ترمدا بە تەسەلی قسەم لە سەر بێکەڵکی سپای بەکرێگیراو و کۆمەکی و بەکەڵکی سپای خۆیی نەکردبا...».

سـپا بەکرێگیراوەیە کە کەسـانێک بە هۆیانە هێندێک پێشڕەوییان کرد. ئەو هێزەی کە لە شـەڕە ناوخۆییەکاندا وایان نواندبوو بەدەسـتوبرد و چاونەترسن، بەڵام کاتێک هێزی دەرەکی هات، ڕووی ڕاسـتیان دەرکەوت. بە جۆرێک کە کارلۆی هەشـتەم، پادشـای فەڕانسـە توانی بە گەچ ئیتالیا داگیر بکا[1]؛ کەس هەبوو دەیگوت هۆکاری پێشێلکردنی سـەروەریی ئیتالیا لە لایەن کارلۆ-وە، بێ ئیمانی و تاوانی ئیتالیاییەکان بووە[2]، ئەو ڕاستی دەگوت؛ بەڵام هۆی ئەوانـە نەبوون کە ئەو بڕوای پێیان هەبوو، بەڵکوو ئەمانەی کە من ئاماژەم پێکردن؛ ئەوە تاوانی ئێمەی ئیتالیایی نەبوو، بەڵکوو سووچ و تاوانی شالیارانمان بوو و هەر خۆشیان سزاکەیان چێشت.

٤ جا کەوایە، دەخوازم لێرە چاکتر ناکارامەیی ئەم سـپایانە نیشان بدەم. سپاسالارانی بەکرێگیراو یان کەسـانێکی هێژا و لێهاتوون یان وا نین. ئەگەر هێژا و لێهاتوو بن، ئەوە ناکرێ باوەڕیان پێ بکەی؛ چونکە هەمیشـە لە بیری بەرزەفڕی و گەورەیی خۆیاندان و لە پێناوی گەیشتن بە مەبەسـتەکانی خۆیاندا، یان خۆیان لە تۆ، کە خاوەن و باڵادەستی ئەوانی، نەبان دەکەن و بە سـەرتدا دەپەڕێنـەوە، یان ئەوانەی تر کە لە دژی فەرمانەکانی تۆ دەوەسـتنەوە لە دەرەوەی ئیرادەی تۆوەن؛ ئەگەریش سپاسـالار هێژا و لێهاتوو نەبێ و خوێڕی و ترسـنۆک بێ، هەر ئەمە بۆ تێکشکان و تێداچوونی تۆ بەسە. ئەگەر بۆ ئەم مژارە بەوە بەرسڤم بدرێتەوە کە لە ناو ئەمانەدا بەکرێگیراو بێ یان نا، هەر دەبێ کەسێک فەرماندەری سـپا بێ. لە وەڵامدا دەبێژم سـپا لە ژێر فەرمانی کێدایە، یان لە ژێر فەرمانی شـالیاردایە، یان لە ژێر فەرمانی دەسـەڵاتی کۆماریدایە. ئەگەر لە ژێر فەرمانی شالیاردا بێ، ئەوە خۆی دەبێ لەگەڵی بێ و ئەرکی سپاسـالاری وەسـتۆ بگـرێ[3]؛ ئەگەر لەژێر

---

١. مەبەستی ماکیاڤێلی ئەوەیە کە زۆر بە ئاسانی سپای فەڕانسە هاتۆتەوە ئیتالیاوە و لەگەڵ هیچ بەرەنگارییەک ڕووبەڕوو نەبۆوە. مەبەسـت لە بەکاربردنی گەچ، ئەو گەچانەیە کە سەرژمێرانی سپای فەڕانسە بۆ دیاریکردنی شوێنی جێگیربوونی هێزەکانیان و دیاریکردنی ماڵەکان بۆ نیشتەجێبوونیان کەڵکیان لێ وەرگرتووە. ئـ.ئی.ئی.

٢. ئاماژەیە بە گوتارەکانی قەشە ساڤۆنارۆڵا، بە تایبەت گوتاری ١ی نوڤەمبری ١٤٩٤. ئـ.ئی.ڤ.

٣. هەروەها لە دیسکۆرسـەکاندا ١، ٣٠. ١: «هەر شـالیارێ دەخوازێ خۆ لە ژینی پڕ لە دڕدۆنگی یان ناسپاسـی بپارێزێ، پێویسـتە خۆی لەگەڵ لەشکرکێشـییەکانی بکەوێ، وەکچۆن ئیمپراتۆرانی ڕۆما لە سـەرەتاوە وایـان دەکرد، وەکچۆن لە

فەرمانی کۆماردایە، ئەوە دەبێ لە شــارۆمەندانی خۆی لەگەڵ بنێرێ، ئەو کەســەش کە دەنێردرێ دەبێ شیاوی ئەرکی پێ ســپێردراو بێ؛ ئەگەریش نییە و ناشیاو و نابەرپرسە، پێویســتە دەمودەســت بگۆڕدرێت. کاتێکیش شیاوی ئەرکی پێ ســپێردراوە، دەبێ بە یاســا و دەستوور ســنووری دەســەڵاتەکەی دیاری بکرێ و ئیجازەی پێ نەدرێ ئەڤ ســنوورانە ببەزێنێ. بە ئاوڕدانەوە لە ئەزموونەکان، دەبینین تەنیا ئەو شالیار و کۆمارانە کە خاوەن سپای خۆیانن سەرکەوتنی مەزنیان وەدەست هێناوە؛ ئەوانەی کە پشتیان بە سپای بەکرێگیراوەوە داوە لە زەرەر و زیان بەو لاوە هیچیان پێ نەبڕاوە. بۆ کۆمارێک کە خاوەن ســپای خۆیەتی، زۆر دژوارە یەکێک لە شارۆمەندان بتوانێ دەسەڵاتی خۆی بەسەریدا بسەپێنێ؛ بەڵام ئەمە بۆ کۆمارێک کە پشتی بە سپای بێگانە بەستووە وا نییە.

٥ ڕۆمییەکان و سپارتەکان، بە پشتبەستن بە سپای خۆیان، چەند سەدە ئازاد و سەربەست ژیان. سویسییەکان هەر ئێگجار پڕ چەکن، بۆیە فرەیش ئازادانە دەژین[١]. نموونەی زەقی ئەوانە کە لە کۆندا پشتیان بە سپای بەکرێگیراو بەستووە کارتاجێنییەکانن؛ ئەوانەی کە لە ژێر گوشاری سەربازانی بەکرێگیراودا، بەر لەوەی شارۆمەندانی خۆیان ببن بە سپاسالار و سەرکردەی سپای خۆیان، لە یەکەم شەڕ لەگەڵ ڕۆمییەکان شکان. تێبایەکان[٢] لە دوای مەرگی ئێپامینودا[٣]، فیلیپی مەکدۆنییان[٤] وەک ســەرکردەی گەلــی خۆیان دیاری کرد، ئەمیش دوای سەرکەوتن، ئازادیی ئەوانی زەوت کرد.

سەردەمی ئێمەشدا سوڵتانی تورک وا دەکات و وەکچۆن ئەوانەی بەڕەوشت و ئازان وایان دەکرد و وا دەکەن».

١. ســەبارەت بە سویســیەکان لە دیسکۆرسەکان ١، ١٢. ٢ دەنووسێ: «ئەوەندەی پێوەندیی بە داب و دەستووری دینی و سەربازیی کۆن و ژیان بە تەرزی کەڤنارانەوە هەیە، لەم زەمانەدا، تەنیا سویســیەکان هەن».

٢. Tebe, Tebani، یەک لە شارە کەونارەکانی یۆنان. تێبانی مەبەست دانیشتووانی تێبێ‌یە.

3. Epaminoda

٤. Filippo، مەبەســت فلیپی دووهەم، باوکی ئەســکەندەری مەزنــە. لە (٣٥٩ تا ٣٣٦ پ.ز.) پادشــای مەکدۆنیــە بووە. تێبانیــەکان، پاش مەرگی ســەرکردە و ژنراڵی هێژا و لێهاتوویان ئێپامینۆدا (٣٦٢ی پ.ز.) لەگەڵ فلیپ بە دژی فۆچی‌یەکان پێکهاتبوون (٣٥٥-٣٥٣)؛ لە ٣٤٦دا پادشای مەکدۆنی لە کوتوپڕدا پەیمانی شکاندبوو و هەڵیکوتابووە سەر تێبێ و کاولی کردبوو. ئـ نی. نی.

٦ میلانۆیییەکان دوا بەدوای مەرگی دووک فیلیپۆ، فرانچسکۆ سفۆرزایان[١] بە کرێ گرت بۆ ئەوەی کە شەڕی ڤێنێزییەکانیان بۆ بکا؛ هەر ئەو کەسەی کە لە شەڕی کاراڤاجیۆدا[٢] دوژمنی شکاند و پاشان لەگەڵیان ڕێکەوت بۆ تێکشاندن و سەرکەوتن بە سەر خاوەنەکانی خۆیدا، واتە میلانۆییەکان. سفۆرزا[٣] و باوکی، هەر دووکیان بەکرێگیراوی شاژنی ناپۆلی، واتە جۆڤانا بوون، کەچی لە ناکاو پشتیان تێی کرد و شاژن بێ سپا مایەوە؛ ئەوسا بۆ ئەوەی تاج و تەختی لە دەست نەچێ، ناچار بوو ڕوو لە شای ڕاگۆنیان[٤] بخات و دەستەوداوێنی ببێ. ئەگەریش دەڵێن لە ڕابردوودا ڤێنێزییەکان و فیورێنتینییەکان، لە ڕێگەی سپای بەکرێگیراوەوە، پەرەیان بە دەوڵەت و دەسەڵاتی خۆیان داوە و سپاسالارەکانیش نەتەنیا نەبووگن بە شالیاریان و خۆیان بەسەردا نەسەپاندوون، بەڵکوو بەرگری و پارێزگارییان لێ کردوون؛ ئەوە من لە وەڵامدا دەڵێم کە فیورێنتینییەکان لەم بارەوە بەخت یاریان بووە؛ چونکە ئەو سپاسالارە لێهاتووانە کە دەبووا لێیان بترسن، هێندێکیان سەرکەوتوو نەبوون، هێندێکیان نەیاریان هەبوو، هێندێکیشان بۆ بەدیهێنانی ئاواتەکانیان چاویان لە شوێنی دیکە بڕیبوو. ئەوەی سەرکەوتوو نەبوو، جۆڤانی ئاوکوت بوو[٥]، هەر بەم بۆنەشەوە ناکرێ بیر و باوەری بزانرێ. بەڵام هەمووان بڕوایان وایە کە ئەگەر سەرکەوتبا، خۆی بە سەر فیورێنتینییەکاندا دەسەپاند. سفۆرزا هەمیشە لەگەڵ

---

١. Franceso Sforza، بڕوانە بەشی ٨. شەڕی کاراڤاجۆ لە ١٤ی سێپتەمبری ١٤٤٨دا ڕووی داوە. ئـ ئی. ئی.

٢. Caravaggi، شارێکە سەر بە پارێزگای بێرگامۆ، کە لە باکووری ئیتالیا و لە ناوچەی لومباردیا هەڵکەتووە.

٣. Sforza، نازناوی موورزۆ ئاتێندولۆـیە [Muzio Attendolo] (١٣٦٩-١٤٢٤). یەک لە سەردارە مەزنەکانی ئیتالیا بووە. کاتێک لە خزمەت شاژنی ناپۆلی جۆڤانا بووە، لە سالّی ١٤٢٠ بە شێوەیەکی چاوەڕوانەکراو و لە ناکاو پشت لە خاوەنی خۆی دەکا و پاڵ دەدا بە نەیارەکەیەوە، بە ناو لویجی سێهەمی دێ ئانجۆ، کە مری لە تەختی شایی خۆش کردبوو. بەڵام شکا و ناچار بوو لەگەڵ شاژن ئاشت ببێتەوە، کە هاوکات بە کێ دیکەی وەک میراتگری خۆی دیاری کردبوو، بە ناوی ئالفۆنسۆ دێ ئارگۆنا. ئـ ئی. ئی.

4. Ragona

٥. Giovanni Aucut، ناوی یۆهان هاوکود [Johan Hawkwood] کە لە ئاخاوتنی ئیتالیاییدا گۆڕدراوە. سپاسالارێکی ئینگلیسی بووە. لە (١٣٦٠ د.ز.)دا بە لەشکرەوە هاتووەتە ئیتالیا؛ لە یەکەم قۆناغی شەڕی نێوان فیورێنتینییەکان و جان گالێئازۆ ڤیسکۆتی لە (١٣٩٠-٩٢)، سەرکردایەتیی فیرێنزێییەکانی کردووە، بەڵام شەڕ بە ئاگربەست کۆتایی هاتووە. ئـ ئی.

براچێسکییەکان[1] کێشەی هەبوو و بەردەوام چاودێریی یەکتریان دەکرد. بەڵام فرانچسکۆ بۆ بەدیهێنانی بەرزەفڕی و ئاواتەکانی چاوی بڕیبووە لومباردیا؛ براچێسکیش دژی کلیسا و پادشایی ناپۆلی بوو.

٧ ئێستا با بێینە سەر ڕووداوەکانی ماوەیەک لەمەوبەر کە هێشتا زۆریان بەسەردا نەچووگە و نوێن. فیورێنتینییەکان پاولۆ ڤیتێلییان کردە کاپیتانی خۆیان؛ پیاوێک زۆر بە مشوور و ژیر و دوورنواڕ، کە بە هۆی بەختی خۆیەوە کاتێک شارۆمەندی ئاسایی بوو ناوبانگی زۆری پێکەوە نابوو. ئەگەر پاولۆ پەلاماری پیسای دابا، کەس گومانی لەوەدا نییە کە لە بەرژەوەندیی فیورێنتینییەکان بوو لەگەڵی بکەون؛ چونکە ئەگەر وەک سەربازێکی بەکرێگیراو ڕۆیشتبایە بەرەی دوژمنەوە، ئەمان چارەیان نەبوو. هەر بۆیە فیورێنتینییەکان ئەگەر دەیانویست بۆ خۆیانی ڕابگرن، دەبوو گوێبیستی بن. بە ئاوڕدانەوە لە کار و چالاکیە سەربازییەکانی ڤێنێزییەکان، دەبینین کاتێک پشتیان بە سپای خۆیان بەستووە، چ سەرکەوتوون و شانازییەکیان خوڵقاندووە، -هەڵبەت ئەمە پێوەندیی بەو سەردەمەوە هەیە کە هێشتا چاویان نەبڕیبووە سەر پەرەپێدانی دەسەڵاتی خۆیان بەسەر وشکاییەوە و فەرمانڕەوایی زەریاکانیان دەکرد- ئەو دەمانەی کە بە پیاوانی مەزن و بۆرەپیاوانی چەکدارەوە شەڕ و چالاکیی پڕ لە شانازی و شکۆیان بە ئەنجام دەگەیاند. بەڵام کاتێک دەستیان دایە شەڕ و چالاکی بە سەر وشکاییەوە، دەستبەرداری ژێهاتوویی و لێزانییەکانی خۆیان لەم بوارەوە بوون و کەوتنە شوێن ئەو داب و نەریتانە کە ئیتالیاییەکانی تر لە شەڕە نێوخۆییەکاندا پەیڕەویان دەکردن. جا چونکە لە سەرەتای پان و بەرینکردنی دەسەڵات و دەوڵەتی خۆیانەوە لە سەر وشکایی، خاوەنی دەوڵەت و میرایەتیی زۆر نەبوون و ناوبانگیان زۆر بوو، ترسێ وەهایان لە سپاسالار و لەشکرەکان نەبوو. بەڵام

١. Bracceschi، مەبەست سپای ئاندرێئا فۆرتێبڕاچی یە [Andera Fortebracci] کە بە بڕاچۆی مۆنتۆنێ [Braccio da Montone] ناسرابوو. براچۆ دوای ئەوەی سفۆرزا پشتی لە شاژن جۆڤانا وەرگێڕابوو، لە لایەن شاژنەوە بە کرێ گیرابوو. بەڵام دواتر لە کاتی سەرهەڵدانی کێشە لە نێوان جۆڤانا و ئالفۆنسۆدا پشتگیری و لایەنگریی لە ئالفۆنسۆ کرد. ئـ ئی. ئی.

کاتێک بە سەرکردایەتیی سەردار کارمینیولا[1] پەرەیان بە خاکی ژێر دەسەڵاتی خۆیان دا، ئەوسا زانیان چ هەڵەیەکیان کردووە؛ بەڵام هاوکات دەرسێکی زۆر چاک و ژیرانەیان لێ وەرگرت. ئەوان پاش شکانی دووکی میلانۆ بە سەرکردایەتیی سەردار کارمینیولا دیتیان کە بووەتە خاوەن شانازی و شکۆی زۆر، هاوکات دەیانزانی کە لە کاتی شەڕدا ساردوسڕ و کەم گوڕ و تین بووە. ئەوسا باش تێگەیشتن ئیتر ناکرێ بە سەرکردایەتیی ئەو سەرکەوتن وەدەست بێنن، چونکە نەیدەویست. ڤێنێزییەکان لە ترس ئەوەی کە دەسکەوتاکانیان لەدەست بچێ، نەیاندەویست لە کارەکەی دووری بخەنەوە؛ لە ئاکامدا بۆ ئەوەی لێی دڵنیا بین، ناچار بوون بیکوژن. پاشان بارتۆلۆمێئۆی بێرگامۆ، ڕوبێرتۆی سان سێڤێرینۆ و کۆنێ پیتیلیانۆ و کەسانی وەک ئەمانە، لە ناو خۆیاندا بوونە فەرماندەی لەشکر؛ بەڵام لەگەڵ ئەمانە هەردەم ترسی شکان و لەدەستچوونیان هەبوو تا ترس لە سەرکەوتن و داگیرکارییەکانیان. هەروەک دواتر ئەوەی لە ڤالیان[2] ڕووی دا و بینرا، گشت ئەوەی کە ڤێنێزییەکان لە ماوەی هەشتسەد ساڵدا[3]، بە ماندوویی زۆرەوە وەدەستیان هێنابوو، لە ڕۆژێکدا لە دەستیان چوو؛ چونکە لە ڕێگەی ئەم سپایانەوە درەنگ و خاوەخاو دەستکەوتی کەم بایەخ بە دەست دەهێنرێ، بەڵام دۆڕان و لەدەستچوونەکان لە ناکاو و حەپەسێنەرن.

٨ هەروەک دەزانین ساڵانێکی زۆرە ئیتالیا لە ڕێگای سپای بەکرێگیراوەوە فەرمانڕەوایی دەکرێ، مەبەستی منیش لە هێنانەوەی ئەم نموونانە لە دەسپێکی ئەم باسەدا، ئەوەیە کە ڕەوتی چۆنیەتیی چەکەرەکردن، بنجبەستن و گەشەکردنی ئەم داب و نەریتە لەم وڵاتەدا نیشان بدەم؛ بۆ ئەوەی کە بە چاکترین شێوە ئاوڕ لەم بوارە بدرێتەوە و

١. Carmignola، نازناوی فرانچسکو بووسۆنێ [Francesco Bussone] (١٣٨٠-١٤٣٢ د.ز.) بووە. ئـ نی. ئی.

٢. Valia، ئەم شەڕە مانگی مەی ١٥٠٤ ڕووی داوە.

٣. هەشتسەد ساڵ: تەقریبەن بەرانبەر بە هەموو تەمەنی کۆماری سان مارکۆ یان کۆماری ڤێنێزیاییە؛ مەبەست ئەوەیە کە ڤێنێزییەکان لە یەک ڕۆژدا هەموو ئەو ناو و ناوبانگەی لە ماوەی هەشتسەد ساڵدا بەدەستیان هێنابوو، لە دەستیان داوە. ئـ نی. ئی.

چاکسازیی بنەڕەتیی تێدا بکرێ.[١] دەبێ ئەوە بزانن چونکە لەم دواییانەدا دەستی ئیمپراتۆر لە ئیتالیا کورت کراوە و پاشەکشەی پێ کراوە[٢]، دەسەڵاتی دنیایی پاپا پەرەی سەندووە و ناوبانگی پتری دەرکردووە؛ ئیتالیاش دابەش بوو بەسەر دەوڵەت و میرنشینی جیا جیا. ئینجا لە زۆرێک لە شارە گەورەکاندا خەڵک دژی میر و مەزنەکانی خۆیان دەستیان دایە چەک؛ -هەر ئەو میر و مەزنانە کە پێشتر لە سایەی ئیمپراتۆرەوە دەیانچەوساندنەوە و زوڵم و زۆریان لێ دەکردن- کلیساش بۆ ئەوەی کە لە دەسەڵاتی دنیاییدا زۆرتر جێگە و پێگەی خۆی پتەو بکا و ناوبانگی زۆرتر ببێ پشتیوانیی دەکردن. هەر ئەمە بووە هۆی ئەوەی کە لە زۆرێک لە شارەکانی تردا شارۆمەندانی ئاسایی بە پلەی شالیاری بگەن. لە بارودۆخێکدا کە ئیتالیا کەوتبووە دەست کلیسا و هێندێک کۆماری تێدا دامەزرابوو؛ لە کاتێکدا پیاوانی کلیسا و شارۆمەندانی ئاسایی تازە بە دەسەڵات گەیشتوو تەرزی چۆنیەتیی بەکارهێنانی چەک و هێزی چەکداریان نەدەزانی، دەستیان دایە بەکرێگرتنی سپا و لەشکری بیانی. یەکەم کەس کە بووە هۆی ناوبانگ دەرکردنی شەڕڤان و لەشکری بەکرێگیراو، ئالبێریکۆ کوونۆی[٣] ڕۆمانیولی بوو. بڕاچۆ و سفۆڕزا و کەسانی تری وەک ئەمان، کە لە سەردەمی خۆیاندا لە ئیتالیا بڕیاردەر و ناوبژیوان بوون، لە فێرگەی شەڕڤانی و سەربازیی ئەمەوە هاتبوونە دەرەوە. پاش ئەم هێزە بەکرێگیراوانە، زۆرێکی تر سەریان هەڵدا و هاتنە ئاراوە، بە جۆرێک کە لە ئەنجامدا لە ڕۆژگاری ئێمە ئەوەی کە بەسەر ئیتالیا حکومڕانی دەکا سپای بەکرێگیراوە؛ لە سایەی سەری ئەمانەوە کارلۆی هەشتەم لە ئیتالیا ئوردووی خست، لویجی دوازدەیەم کردنی بە نێچیری خۆی، فێراندۆ پادشای ئیسپانیا دەستدرێژیی کردە سەر ئیتالیا و سویسییەکانیش پەلاماریان دا.[٤]

---

١. چاکسازی: مەبەست سەرلەنوێ ڕێکخستنەوەی سپای ئیتالیایە بەگشتی؛ ئەوەندەی هەڵگەڕێتەوە سەر سپا و لەشکری بەکرێگیراو دەبێ لە ئیتالیا نەمێنێ، نەک ئەوەی کە «چاکسازی»ی تێدا بکرێ. ئـ ئی. ئی.

٢. ئیمپراتۆر: لە دەورانی سەدەی پازدەی زایینیدا کاریگەریی سیاسیی ئیمپراتۆری ئاڵمان لە سەر ئیتالیا نامێنێ. ئـ ئی. ئی.

٣. Alberico کۆنتی کوونیۆ [Cunio] یەکەم هێزی شەڕڤانی بەکرێگیراوی ئیتالیایی دامەزراند، لە بەرەی پاپا و پاشایی ناپۆلیدا شەڕی کرد و لە ١٤٠٩دا مرد. ئـ ئی. ئی.

٤. کارلۆی هەشتەم، پادشای فەڕانسە، لە (١٤٩٤-٩٥) هاتووەتە ئیتالیاوە؛ لویجی دوازدەهەم لە (ئاگۆستی ١٤٩٩)دا،

٩ یەکێک لەو شـێوازانە کە ئـەم هێزە بەکرێگیراوانە ئەنجامیان ئـەدا ئەوە بوو کە لە بەر ناوبانگی خۆیان هێزی پیادەیان هەڵوەشـاندەوە؛ چونکە خۆیان خاوەن دەوڵەت و خاک نەبوون و بە داهاتی پیشەییانەوە بەرێوە دەچوون. بۆیە توانای ڕاگرتن، تێروتەسەل و پۆشـتەکردنی سپای بێئەژماریان نەبوو؛ هێزێکی پیادەی کەم ژماریش نەدەبووە هۆی ناوبانگ بۆیان. بۆیە بەم ئاکامە گەیشـتن کە ڕاگرتن و بەخێوکردنی ژمارەی گونجاوی هێزی سوارە چاکترە و ئەمەیان بە هۆکاری شانازی و شکۆ بۆ خۆیان دەزانی. لە ئاکامی ئەمەدا، لە سـپایەکی بیست هەزار کەسـیدا دوو هەزار هێزی پیادە دەست نەئەکەوت. بێجگـە لەمەش، ئـەوان هەموو ڕێگە و شـوێنێک دەگرنە بەر بۆ ئـەوەی کە خۆیان و سـەربازانیان لە ماندوویی و مەترسـی بپارێزن. لە کاتی شـەڕ و پێک هەڵپڕژاندا یەکتر ناکوژن، بەڵکوو یەکتر بە دیل دەگرن و دواتریش بەبێ بەرانبەر ئازادیان دەکەن. بە شەودا پەلاماری ئەو شارانەیان نەئەدا کە بە شوورە و قەڵا پارێزراو بوون؛ لەو لایشەوە پارێزەران و زێرەڤانانی شار پەلاماری ئوردووی ئەمانیان نەدەدا. بە دەوری ئوردووەکەیاندا خەندەقیان لێ نەدەدا و بەرهەڵسـتیان دروسـت نەدەکرد؛ لە زسـتاندا گەمارۆیان نەدەدا و مەیدانی شەڕیان بەجێ دەهێشت. هەموو ئەمانە کە باس کران لە نێو داب و دەستووری شەڕڤانی ئەواندا ڕێگاپێدراو بوون. هەروەک بەر لەمە گوترا، هێزە بەکرێگیراوەکان، بۆ خۆدزینەوە لە ماندوویی و مەترسیی ئەم ڕێگە و ڕەوشانەیان داهێنابوو. ئەوان بەم جۆرە ڕێگەیان بۆ دەستدرێژیکردنە سەر ئیتالیا خۆش کرد و بوونە هۆی ئەوەی کە تەوقی کۆیلەتی بخرێتە ملی.

---

ئیسپانیاییەکان (١٥٠١) و سویسییەکان لە (مەی ١٥١٢) ڕۆیشتوونە ئیتالیاوە. تـ.ئی.ئی.

## ١٣. سەبارەت بە سپای کۆمەکی، کۆمەکی و خۆیی پێکەوە، خۆیی بە تەنیا

١ یەکێکی تر لە سپا بێکەڵکەکان، ئەوەیە داوا لە زۆردارێک بکرێت بە سپای خۆیەوە بێتە هاناتەوە و بەرگری لە تۆ بکا؛ وەکچۆن ماوەیەک بەر لە ئێستا پاپا جوولیو، دوای ئەوەی کە لە هێرش بۆ داگیرکردنی فێرڕارا تاقیکردنەوەی ناخۆشی هێزە بەکرێگیراوەکانی ئەزموون کرد، پەنای بردە بەر لەشکری کۆمەکی و لەگەڵ فێراندۆ پادشای ئیسپانیا پێکهاتن کە بە سپای خۆیەوە بە هانایەوە بێت. ئەم سپایانە دەتوانن چاک و بەکەڵک بن بۆ خاوەنی خۆیان، بەڵام بۆ کەسێک کە بانگیان دەکا بۆ ئەوەی یارمەتی بکەن، هەمیشە زیانیان هەیە. چونکە ئەگەر لە شەڕدا بشکێت ئەوە لە بەریەک هەڵدەوەشێتەوە؛ ئەگەریش سەرکەوتوو بی ئەوە بە دەستی خۆت کۆت و بەندی ئەوانت لە دەست و پێی خۆت ئاڵاندووە. وێڕای ئەوەی کە مێژووی کەڤنار تەژییە لەم نموونانە، بەڵام من دەمەوێ لە نموونەی تازەی پاپا جوولیوی دووهەمەوە بڕۆمە نێو باسەکەمەوە. چونکە لام وایە نابێ بڕیارەکەی ئەم بە کەم بزانرێ و چاک تاوتوێ نەکرێ؛ ئەم کە لە پێناو بەدەستهێنانی فێرڕارا هەموو شتێکی خستە باوەشی هێزی دەرەکییەوە. هەڵبەت پاپا بەخت یاری بوو و لەو سەردەمەدا سێهەم شت سەری هەڵدا؛ هەر ئەمەش وای کرد کە پاپا میوەی ئەو بژاردەیە و بڕیارە هەڵەیەی هەڵنەگرێتەوە. چونکە لە لایەکەوە ئەو هێزە کە بۆ یارمەتی هاتبوو لە ڕاڤێننا شکا[1]؛ لە لایەکی دیکەشەوە، سویسییەکان ڕاپەڕین و

---

١. Ravenna، بڕوانە بەشی ٣ و ٢٦.

بەدەر لە ڕاوبۆچوونی پاپا و کەســانی تر، سەرکەوتووانیان دەرپەڕاند. ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە پاپا نەبێتە دیلی دوژمنانی و هێزی کۆمەکی نەتوانێ ویست و دەسەڵاتی خۆی بە ســەریدا بسەپێنێ؛ چونکە پاپا بە زەبری دەســت و چەکی کەسانی تر سەرکەوتنی بە دەســت هێنابوو، نەک بە یارمەتیی ســپای کۆمەکی. فیورێنتینییــەکان لە کاتێکدا کە بە تەواوی بێ سپا بوون، بۆ هەڵکوتانە سەر پیسا و داگیرکردنی دەهەزار فەڕانسەوییان هێنایە ئیتالیا؛ ئەمان بەم بڕیارە خۆیان خستە مەترسییەکەوە کە گەورەتر لە گشت مەترسییەکانی تا ئەوکات بوو. ئیمپراتۆری کونستانتینوپۆلی بۆ بەرەنگاری و دژایەتیکردنی هاوساکانی دەهەزار ســپای تورکی هێنایە یۆنان؛ کەچی دوای تەواوبوونی شــەڕ ئامادە نەبوون ئەم وڵاتە چــۆڵ بکەن؛ هەر ئەمەش بووە دەســپێکی کۆیلەتیی یۆنانییەکان لە ژێردەســت تورکەکاندا.[1]

٢ کەوابوو، ئەو کەســەی لای وایە لەو شــەڕەی بەدەســتییەوەیە ناتوانێ سەرکەوتوو بێ، پێویســتە خۆی لە هێنانی سپای کۆمەکی بپارێزێ؛ چونکە هەڕەشەی ئەمانە زۆر لە هەڕەشەی هێزی بەکرێگیراو زیاترە. هەروەها لە بەر ئەوەی کە سپای کۆمەکی بە هانایەوە هاتووە بڕیاری شــکان و ڕووخانی تۆ دراوە؛ ئەمانە هەموو یەکگرتوون و هەمیشە لە ژێر فەرمانی کەســانی تردان و پەیڕەوی لە ئەو دەکەن. بەڵام ســپای بەکرێگیراو، بۆ ئەوەی دوای سەرکەوتن زیانت لێ بدەن پێویستیان بە بوار و دەرفەتی زۆرتر و کاتی فرەتر هەیە؛ چونکــە هەموو یەکگرتوو نین و مووچەش لە تۆ وەردەگــرن. پتر لەمەش، لە نێو هێزی بەکرێگیراودا لایەنی سێهەم هەیە کە لە ژێر فەرمانی تۆدایە و ئامادە نییە هەر زوو فەرمان لەو کەسانە وەرگرێ کە بە تەمای زەبر وەشاندن لە تۆ و زیان پێگەیاندنتن. بە پوختەیی:

١. جۆڤانی شەشەم کانتاکوزێنۆ [Giovanni VI Cantacuzeno] (لە ساڵی ١٣٥٧-تا ١٣٥٥ بە سەر تەختی شاییەوە بووە)، لە شەڕ دژ بە هاوکار و هاوپایەی خۆی جۆڤانی پالێئۆلوگۆ [Giovanni Paleologo] داوای کۆمەکی لە سپای تورک کرد. لە ســاڵی ١٣٥٣دا، ئەمیری بیتنیا [Bitinia]، ئۆرکان، دەهەزار سواری بە سەرکردایەتیی کوڕەکەی خۆی، سلێمان، هەناردە کۆمەکی؛ دوای تەواوبوونی شەڕ و کاتێک جۆڤانی شەشەم وازی لە کورسیی دەسەڵات هێنا، تورکان خۆیان کرد بە خێوی گالیپۆلی، بە سەر گوێ ئەورووپای داردانێلی ـیەوە. ئـ نی. نی.

ئـــەوەی هێزی بەکرێگیـــراو دەکاتە هێزێ پڕ مەترســـی و هەڕەشـــەئامێز لێنەهاتوویی، ناکارامەیی و خوێڕیبوونە؛ ئەوەی هێزی کۆمەکی دەکاتە هەڕەشەئامێز و جێی مەترسی، لێهاتوویـــی و دلێریەتییە. جا کەوایە، شـــالیاری ژیر و زانا، هەمیشـــە خۆی لەم ســـپایانە دەبوێرێ و تەنیا پشـــت بە هێزی خۆی دەبەستێ؛ ئەم شکان و دۆڕان بە سپای خۆییەوە لە سەرکەفتن و بردنەوە بە هێزی ئەوانی ترەوە بە باشتر دەزانێ؛ شالیاری زانا سەرکەفتن و بردنەوە بە سپای ئەوانی ترەوە بە سەرکەفتن نازانێ.

٣ من لە هێنانەوەی نموونەی چێســـارێ بۆرجیا و شـــێوە کاری نـــە ماندوو دەبم و نە تووشی دڕدۆنگی. ئەم دووکە بە یارمەتیی سپای کۆمەکی ڕۆیشتە نێو ڕۆماوە، سپایەکی زۆری فەڕانسەیی بردە ئەو ناوەوە و لە ڕێگەی ئەوانەوە دەستی بە سەر ئیمۆلا و فوورلیدا گـــرت[1]، بەڵام چونکە دواتر لـــەو هێزە دڵنیا نەبوو، ئاوڕی لە هێـــزی بەکرێگیراو دایەوە. چێســـارێ بۆرجیا بڕوای وا بوو مەترســـیی ئەمانە کەمترە؛ بۆیە ئورسینی و ڤیتیلی بە کرێ گرت و پارەی پێ دەدان. بەڵام دوای ئەزموونکردنیان، گومانی لە ئەمەگدارییان هەبوو و بە مەترسیداری دەزانین، بۆیە لە بەریەک هەڵیوەشاندنەوە و سپای تایبەتی خۆی پێکهێنا. بـــە لەبەرچاوگرتن و لێکدانـــەوەی بارودۆخی دووک چێســـارێ و ناوبانگی لەوکاتەدا کە تەنیا ســـپای فەڕانســـەیی بوو؛ ئەودەم کە ئورسینی و ڤیتێلییەکانی هەبوو؛ کاتێک کە خاوەن سپای تایبەتی خۆی بوو و پشت ئەستوور بە هێزی خۆیی بوو؛ دەکرێ بە ئاسانی جیاوازیی نێوان ئەم دوو سپایە بزانرێ و ببینرێ: کاتێک بووە خاوەن سپای تایبەتی خۆی و بە هێزی خۆی پشـــت ئەستوور بوو، دەوڵەت و دەســـەڵاتی بەردەوام لە پەرەسەندن و گەشەکردندا بوو و لە هەموو کاتێکیش پتر جێی ڕێز و پەسەندی ئەوانی تر بوو.

٤ مـــن نامەوێ لە نموونـــە نوێیەکانی ئیتالیا دوور بکەومەوە. بـــەڵام وێڕای ئەمەش بە لەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە بەر لەمە باسی ئیرۆنێ سیراکوسیم کردووە[2]، دەمەوێ لێرەش

1. Imola, Furlì

٢. ئیێرۆنێ [Ierone] بڕوانە بەشی ٦. ئەوەی ماکیاڤێلی لێرە دەیگێڕێتەوە لە ٢٧٥ پـ.ز.دا ڕوویان داوە و مێژوونووسی یۆنانی پولیبیۆ [Polibio] گێڕاویەتییەوە «بە تێگەیشتن لەوەی لە کۆندا سپای بەکرێگیراو بێ ئەمەگ بوون و جێی متمانە نەبوون

ئاورێکـــی لێ بدەمەوە، حەز دەکەم پشـــتگوێ نەخرابێ. هەروەک پێشـــتر وتم چونکە سـەرکردایەتیی سـپای سیراکوسـییەکانی کردبوو، هەر زۆر زوو تێگەیشـتبوو سپای بەکرێگیراو بەو شێوە کە سەرۆکەکانیان وەکوو ئیتالییەکان خۆمان بین بێکەڵکن؛ بڕواشی ئـەوە بوو نابێ و نەگونجاوە هـەر ئاوا وازیان لێ بێنێ و لێیان بگەڕێ بڕۆن، بۆیە بڕیاری دابوو هەموویان قەڵاچۆ بکرێن؛ پاشان هیچکات بە سپای بێگانەوە شەڕی نەکردبوو و تەنیا پشـتی بە هێزی تایبەتی خۆیی بەستبوو. دیسـان هەر لەم بوارەوە دەمەوێ ئاوڕ لە کەسایەتییەکی ناو تەورات بدەمەوە و لە بیرگەدا بیژێنمەوە؛ ئەویش داودە کە بە ساول[1] دەڵێت ئامادەیە بڕواتە شـەڕی ڕکەبەری فەلەسـتینی بە ناو گولیان.[2] سـاول بۆ دنەدان و بەرزکردنەوەی ورەی زرێ و چەک و شیری خۆی پێ دابوو؛ بەڵام کاتێک داود چەک و ڕەخت و زرێیەکەی لە خۆ دابوو، هەر زۆر زوو لێی کردبۆوە و پێی دابۆوە و پێی گوتبوو: ئەم چەک و ڕەخت و زرێیە دەست و پێ گرن و ناهێڵن چوست و چالاک بم؛ دەخوازم بە چەقۆ و قەڵماسـکی خۆمەوە بڕۆمە شەڕی دوژمنەوە. ئاکام ئەوەیە کە چەک و زرێی ئەوانی تر یان بە بەر تۆ گوشادن و لێت دەکەون، یان قورس و دەست و پێ گرن، یان بە بەرت تەنگن و ئەتگوشن.

٥ کارلـوی حەوتـەم[3]، باوکی لویجـی یانزدەیەم کە بــە هەڤیــازی و هێژایی خۆی ئینگلیسـییەکانی لە فەڕانسە دەرپەڕاند و ئازادیی گەڕاندەوە بۆ ئەو وڵاتە، زۆر چاک لەم پێویستییە تێگەیشتبوو، واتە لەوەی کە دەبێ سپای تایبەتی خۆی هەبێ و خۆی پڕ چەک

---

و، خنەخنکەر و تەمبەڵ بوون. ئیێرۆنێ سپایەکی ساز کرد بۆ بەگژداچوونی بەربەرەکان کە مەسینایان [Messina] داگیر کردبوو، پاش تێکشانی هێرشی هێزی بەکرێگیراو، لێگەڕان کە بەربەرەکان دڕندانە بەرینە گیانی جەماوەر و دەستیان دایە کۆمەڵکوژی؛ ئـ.ئی.ئی.

1. Saul

2. Filisteo, Golia

٣. Carlo VII، لە ١٤٢٢ تا ١٤٦١ پادشـایی کردووە؛ بە تەواوەتی فەڕانسەی لە ئینگلیسی‌یەکان پاک کردەوە و پرۆسەی ئازادیی فەڕانســەی لە بندەستی ئینگلیس بە ئاکام گەیاند (شەڕی سەد ساڵە لە ١٤٥٢دا کۆتایی هات)؛ لە ١٤٤٥دا سپای سوارە و پیادە سەربازی دامەزراند و ساز و تەیاری کرد، لە سەرەتاوە هێزی سوارە نزام نزیک بە شەش هەزار دەبوون، هێزی پیادەش، کە ڕاهێنراو و ئامادەی کردبوون و لە کاتی پێویستدا پڕچەک دەکران، نزیک بە هەشت هەزار دەبوو. ئـ.ئی.ئی.

و تەیار بکا. بۆیە سپای سوارە و پیادەی خۆی دامەزراند و باش ساز و تەیاری کردن. بەڵام دواتر شا لویجی کوڕی، سپای پیادەی هەڵوەشاندەوە و دەستی دایە بەکرێگرتنی شەڕڤانی سویسی؛ واتە هەمان هەڵەی دووپات کردەوە کە کەسانی دیکە تاقییان کردبۆوە. هەروەک ئێستا بە کردەوە دەبینرێ هۆی هەڕەشە و مەترسیە هەنووکەییەکانی سەر ئەو پادشاییە هەر ئەمەیە.[1] لویجی بە پێداهەڵگوتن و ناوبانگدان بە سپای سویسی بووە هۆی لاوازیی خۆی و سپاکەی؛ چونکە بە تەواوی هێزی پیادەکەی لە نێو برد و سوارەکەشی بەند کرد بە لێهاتوویی ئەوانی ترەوە. سوارەی لویجی بە هۆی ڕاهاتن و خووگرتن بە شەڕ بە هاریکاری و هاوشانیی سویسییەکان، باوەڕیان بەوە نەمابوو کە ئەتوانن تەنیا بە پشتبەستن بە هێزی خۆیانەوە سەرکەوتن وەدەست بێنن. ئەوەی کە فەڕانسەییەکان بە تەنیا بە سویسییەکان ناوێرن و بەبێ سویسییەکانیش بە ئەوانی تر ناوێرن و ناڕۆنە شەڕیانەوە، ڕێک ئا لەمەوە کە ئاماژەم پێ کرد سەرچاوەی گرتووە. کەوابوو، سپای فەڕانسە بەشێکی بەکرێگیراو و بەشێکی خۆماڵییە؛ ئەم سپایە تێکڕا و پێکەوە زۆر چاکترە لە هێزی بەکرێگیراو یان کۆمەکی بە تەنیا؛ بەڵام، زۆر کەمتر و نزمتر لە سپای تەواو خۆییە. بۆ سەلماندنی ئەمە هەر ئەم نموونەیە بەسە: چونکە ئەگەر ئەو سپایەی کارلۆی حەوتەم سازی کردبوو گەشەی پێ درابا یان ڕاگیرابا، کەس نەیدەتوانی شان لە شانی فەڕانسە بدا و لە شکان نەدەهات. بەڵام بێ مشووری و دوورنەنواڕیی مرۆڤەکان لە جێگایەکەوە دەست پێدەکا کە لە خۆشیی بۆنی سەر گوڵدا ئاگاداری ئەو ژەهرە نییە کە لە ژێریەوە هەیە؛ هەروەک پێشتر لەمەڕ نەخۆشیی دەردە باریکە باسم کرد.

٦ جا بۆیە ئەو کەسەی کە لە پادشاییەکەیدا لە کاتی خۆیدا لە سەرهەڵدانی بیماری و شەڕ بێئاگایە و پێیان نازانێ، بەڕاستی ناکرێ بە کەسێکی ژیر و زانا دابنرێت؛ هەڵبەت وەها ژیری و زاناییەکیش بە دەگمەن کەسانێ دەدرێ. ئەگەر لە هۆی سەرەکیی

١. ئاماژەیە بە شکان لە شەڕی نوڤارا [Novara] لە (٦ی ژانویەی ١٥١٣) بە دژی سویسییەکان و شەڕی ئنگوینێگاتێ [Enguinegate] لە (١٦ی ئاگۆست) بە دژی ئینگلیسییەکان و ئیمپراتۆری؛ بە بڕوای کابۆد [Chabod] ئەم لاپەڕانە لە شالیار دەبێ چەند مانگ دوای ئەو ڕووداوانە نووسرابێتن. ئـ ئی. ئی.

ڕووخانی ئیمپراتۆریی ڕۆمییەکان ڕامێنین، دەبینین دەسپێکی لەوەیە کە ئەوان دەست دەکەنە بەکرێگرتنی گوتییەکان؛ چونکە ڕێک ئا لەو سەرەتایەوە هێزی ئیمپراتۆری بەرەو لاوازی دەڕوا و دەمارەکانی خاو دەبنەوە و هەموو هێز، هێزایی و ژیهاتی لە ئیمپراتۆری دەسێندرێتەوە و دەدرێتە هێزە بەکرێگیراوەکان.[1]

٧ بە کورتی لە کۆتایی ئەم باسەدا دەڵێم: بەبێ سپای تایبەتی خۆی هیچ پادشاییەک لە ئاسایشدا نابێ و ئەگەر بۆ خۆی خاوەن هێزێکی بە بیر و باوەڕ نەبێ کە لە کاتی تەنگانە و شالاوی دوژمندا بەرگریی لێ بکا و بیپارێزێ، ناچارە خۆی بسپێرێتە دەست چارەنووس. پیاوانی ژیر و زانا بەردەوام ئەم گوتەیان دووپات دەکردەوە و دەیانگوت: هیچ شتێک لەرزانتر، لەقتر و کاتیتر لە ناوبانگی ئەو دەوڵەتانە نییە کە پاڵیان داوە بە هێزی بەکرێگیراوەوە و پشت ئەستور بە هێزی خۆیی نین.[2] مەبەست لە سپای خۆیی ئەو سپایەیە کە لە ژێردەستان یان شارۆمەندانی خۆت یان ئەوانەی کە پێوەندیدار بە تۆوە پێکهاتوون. هەموو ئەوانی تر یان بەکرێگیراون یان کۆمەکی؛ ئەگەر بە وردبینیی تەواوەوە ئەم چوار نموونە کە من لێرە ئاماژەم پێ کردن[3] تاوتوێ بکرێن، بە ئاسانی دەکرێ شێوەی ساز و تەیارکردنی سپای خۆیی بدۆزرێتەوە. ئەوکات تێدەگەن چۆن فلیپ باوکی ئەسکەندەری مەزن و زۆر کۆمار و پادشای تر خۆیان پڕچەک دەکرد و سپای خۆیانیان ساز و تەیار کردبوو؛ ساز و تەیارکردنێک کە من هەموویانم بە تەواوی قبووڵە، پشتیان پێ دەبەستم و متمانەیان پێ دەکەم.

---

١. لە ساڵی ٣٧٦ ئیمپراتۆر ڤالێنتێی یەکەم، Valente، گوتییەکانی، goti، گرتە کرێ، بەڵام، بە تایبەت تێودوسیو، لە ٣٨٢، هەتا ٤٠٠٠٠ کەسی گوتیی لە سپای ڕۆما ڕێکخستبوو. ئەگەر شەڕی نێوخۆیی، هەر لە ئەوەی سەردەمی گراکییەکانەوە بگرە، بۆ ماکیاڤێلی سەرچاوەی ڕوو بە ڕووخانی ڕۆمان، سەرچاوەی ڕووخان لە گۆڕانی سیاسەتی سەربازیدا بینراوە، چونکە: «بنیاد و بناغەی دەوڵەتی ڕۆما لە سەر گەلی ڕۆما، هاوپەیمانە لاتینەکانیان، شارانی هاوپەیمانیان لە ئیتالیا و کولونیاکانیان دانرابوو: ڕۆمییەکان ئەوەندە سەربازیان لە ئەوانە وەردەگرت کە بۆ شەڕی دنیا و پاراستنی بەس بوون» (دیسکۆرسەکان ٢، ٤.٣٠).

٢. تاچیتو، Tacito، ساڵنامەکان ١٣، ١٩. نـ.نی.نی.

٣. «چوار نموونە»، [توێژەران] بە گشتی بەم چوار کەسەیان دەزانن: چێساری بورجیا، جێرۆنێ، کارلوی حەفتەم، داود. نـ.نی.ف.

## ١٤. چاوەڕوانی لە شالیاران سەبارەت بە سپا

١ ئەوەندەی پێوەندیی بە هونەری شەڕ و سازی و تەکووزیی ئەم بوارەوە هەبێ، شالیار دەبێ هەموو بیری خۆی بۆ تەرخان بکا و بێجگە لەم هونەرە نابێ هیچ ئامانجێکی تر بۆ خۆی دیاری بکا؛ چونکە تەنیا هونەرێک کە لەو کەسـەی فەرمانڕەوایی دەکا چاوەڕێ دەکرێ، هونەری شەڕە؛ ئەم هونەرە پێکهاتووە لە گەلێک هەڤیازی، لێهاتوویی و لێزانی کە نەتەنیا ئەو کەسانە بە سەر کورسیی دەسەڵاتەوە ڕادەگرێ کە وەک شالیار لە دایک بووگن و شازادەن، بەڵکوو زۆر جار شارۆمەندانی ئاساییش دەگەیەنێتە پادشایی. بە پێچەوانەی ئەمەوە، دەبینرێ ئەو دەمانە کە شـالیاران لە جیاتی گرینگیدان بە سپا، کەوتوونەتە بیری ڕابواردنی ژینی خۆش و ئاسوودە، دەوڵەت و دەسەڵاتیان لە دەست چووگە؛ یەکەم هۆی ئەم لەدەستچوونە پشتگوێخستنی ئەم هونەرە و گرینگی پێ نەدانییە؛ هۆی بەدەستهێنانی دەوڵەت و دەسـەڵاتیش پسـپۆڕی و لێزانیی تەواوە لەم هونەرەدا. فرانچێسـکۆ سفۆرزا چونکە خاوەن سـپا بوو لە شارۆمەندێ ئاساییەوە بوو بە دووک و دەسەڵاتداری میلانۆ. کەچی کوڕان و میراتگرانی بە هۆی خۆدزینەوە و خۆبواردن لە سپا و دەردیسەرییەکانی ئەم بوارە، لە دووک و فەرمانڕەواوە بوونە شارۆمەندی ئاسایی. بۆیە لە نێو هۆیەکانی تردا کە زیان بە شالیارێ دەگەیەنن، ئەمە یەک لەوانەیە کە شالیار دەبێ خۆی لە بیر و بۆچوونی

هەڵە بپارێزێ؛ هەڵبەت دواتر پتر لەم بارەیەوە دەدوێین.[١] چونکە لە نێوان خاوەن سـﮯپای پڕچەکدا و کەسی بێ سپادا هیچ هاوسەنگییەک لە ئارادا نییە: هیچ هۆیەک بۆ ئەوەی کە خاوەن سـﮯپا بە مەیلی خۆی مل بۆ کەسێک کەچ بکا کە بێ سپایە بوونی نییە؛ هەروەتر بۆ کەسێکی بێ سپا هەر فرە ئەستەمە کە بتوانێ لە نێو سپاسالارانی پڕچەکدا لە ئاسایشدا بژیت؛ چونکە لایەنی خاوەن سپا بە چاوی سووک و لەخۆباییەوە سەیری ئەوە دەکا کە بێ سپایە، ئەمیش بە دڕدۆنگی و گومانەوە لەو دەنوارێ، بۆیە ناکرێ و ئیمکانی نییە بتوانن پێکەوە کۆک بن و هاوکار بن. هەروەک باسیشـﮯم کرد، بۆ شالیارێک کە سەری لە سپا دەرناچێ و لێی نازانێ، لە نێوان نەگبەتی و نەهاتییەکانی دیکەدا نە سـﮯربازەکانی ڕێزی دەگرن و بە شان و شکۆیدا هەڵدەڵێن، نە ئەمیش دەتوانێ بڕوای بەوان بێ.

٢ کەوایە نابێ هەرگیز ئەم هونەرە لە بیر بکرێ؛ لە کاتی ئاشتی و ئاسایشدا دەبێ زۆرتر لە کاتی شـﮯڕ گرینگیی پێ بدرێ. پێویسـﮯتە بەردەوام ڕاهێنانی لەسـﮯر بکرێ، ئەمەش دەکرێ بە دوو شێوە ئەنجام بدرێ: یەکیان بە کردەوە و چالاکی، ئەوەی تر بە خوێندنەوە و ڕامـﮯان. ئەوەندەی کـﮯە پێوەندیی بە چالاکی و ڕاهێنانی مەیدانییـﮯەوە ببێ، بۆ ڕاگرتنی سـﮯپا بە ئامادەیی، دەبێ هەردەم بە ڕێگەی ڕاوەوە بێ؛ چونکە لەم ڕێیەوە جەستە لەگەڵ سـﮯختی ڕادێت. هاوکات سروشتی شوێن و دەشـﮯت و چیاکان دەناسی و دەزانی کێو و بەرزاییەکان چـﮯۆن هەڵکەوتوون، چۆم، دەربەند، خەرەنـﮯد، دۆڵ، قۆپی و دەراوەکان چۆن هەڵکەوتوون، پێدەشـﮯت و تەختاییەکان چۆن بۆی ڕاکشـﮯاون و لە سروشتی چەم و ڕووبـﮯار و زۆنگ و زەلکاوان تێدەگەی؛ ئەم ڕاهێنانە دەبێ بە کارامەیی و بایەخپێدانی تەواوە ئەنجام بدرێ. قازانجی وەها ناسـﮯینێ لـﮯەم دوو بوارەوەیە: یەکەم وڵات و خاکی خۆیان دەناسن و لە بارەیەوە زانیارییان دەبێ، بەم چەشنە دەتوانن چاکتر لە شێوازەکانی بەرگریکردن لە وڵات تێبگەن؛ دووهەم، لە ڕێگەی ناسـﮯین و هەڵسووڕان لەم شوێنانەدا بە ئاسـﮯانی لە سروشـﮯتی ئەو شـﮯوێنە نوێیانەی کە دەبێ بیانناسـﮯن تێدەگەن. چونکە، بۆ

---

١. بە تایبەتی بەشی ١٩.

نموونە، ئەو تەپۆڵکە و بەرزایی، دەربەند، دۆڵ، چەم، ڕووبار و زۆنگ و زەلکاوانە کە لە تۆسکانادا هەن، گەلێ لێکچوونیان لەگەڵ ئەوانەی دەڤەر و مەڵبەندەکانی دیکەدا هەیە؛ بە جۆرێک کە بە ناسینی دەشــت و چیا و شوێنەکانی ناوچەیەک دەکرێ بە ئاسانی لە پێکهاتە و چۆنیەتیی شوێن و هەڵکەوتەکانی ناوچەیەکی دیکە تێبگەی. هەر شالیارێ خاوەنی ئەم ئەزموون و لێهاتووییانە نەبێ، خاوەن ئەو بنەڕەت و بەشە سەرەکییە نییە کە بۆ هەر سەرداریێ پێویستە؛ چونکە ئەم ڕاهێنان و ئامادەییەیە کە فێرت دەکەن چۆن شوێنپێی دوژمن هەڵگری؛ چۆن و لە کوێ ئۆردوو لێ بدەی، چۆن پێشــڕەوی بە ســپای خۆت بکەی؛ چۆن لە مەیدانی شــەڕدا بە جۆرێک دابمەزرێی کــە لە بەرژەوەندیی تۆدا بێ و چۆن شارەکان گەمارۆ بدەی.

۳ شــای ئاکییەکان، فیلۆپۆمینێ[1] لە نێو ئەو شانازی و ستایشــانە کە نووسەران بۆیان هۆنیوەتــەوە، یەکیان ئەوەیە لە کاتی ئاشــتی و ئارامیدا تەنیا و تەنیــا بیری لە تەرزەکانی شــەڕ کردۆتەوە؛ کاتێک لەگەڵ دۆســتانی لە دەشــت و چیا بووگن بەردەوام ڕاوستاون و لــەم بوارەوە گفتوگۆ و ڕاوێژیان کردووە: «ئەگەر دوژمن بەســەر ئەو تەپۆڵکەوە بێ و ئێمەش بە سپاوە لەم شوێنەی خۆمان بین، شەڕ لە بەرژەوەندیی کێدا دەشکێتەوە؟ چۆن دەکرێ پەلاماری بدەیت و پێشڕەوی بکەی، بێ ئەوەی ڕیز و تەکووزیی سپا تێکچێ؟ ئەگەر ئێمە بمانەوێ پاشەکشــە بکەین و هێزەکانمان بکێشینە دواوە، دەبێ چ بکەین؟ ئەگەر ئەوان بکشــێنەوە، چۆن دەبێ وەشوێنیان کەوین؟»[2] بەم شێوەیە و بە دەم ڕێگاوە هەموو ئەو گریمانە و ئەگەرانە کە دەتوانن بۆ سپای شەڕڤان ڕوو بدەن دەیهێنانە ئاراوە و ئاراستەی هەڤالانی دەکرد و گوێبیستی بۆچوونەکانیان دەبوو، بیروڕای خۆی دەردەبڕی و بە ڕامانی خۆی پەسەندی دەکردن و بڕیاری لە سەر دەدان؛ بە جۆرێک کە بە هۆی ئەم ڕامان و لێکدانەوانەوە گەیشتبووە ئاستێک لە زانستی سەربازی کە لە کاتی ڕێبەریکردنی

۱. Filopemene da Megalopoli، فیلۆپیمێنــێ-ی مێگالۆپۆلی (۲۵۲-۱۸٤ پ.ز.) ســتراتیژ و پلاندارێژی هاوپەیمانی ئاکێئا کە سەرکردایەتیی چەند شەڕی پەیتا پەیتای دژی سپارتەکان کردووە. ئـ نی.ئی.

۲. ماکیاڤێلی، لەم بوارەوە پشتی بە نووسراوەکانی مێژوونووسی ڕۆمی تیتو لیڤیۆ بەستووە. ئـ نی.ئی.

سپادا هەرگیز دەستەوەستان نەبووە؛ بۆ هەر ڕووداوێک کە بەرۆکیان پێ گرتبا ڕێگەی چارەی خۆی هەبووە.

٤ ئەوەنـدەی کە پێوەندیی بە خوێندنەوە و ڕامانەوە هەبێ پێویستە شالیار دیرۆک وەخوێنێ و لەوێدا تێبینیی کار و کـردەوەی پیاوانی مەزن بدا و بزانێ چۆن فەرماندەیی شـەڕەکانیان کردووە؛ لە هۆکاری سەرکەوتنەکان و شـکانەکانیان بکۆڵێتەوە، بۆ ئەوەی بتوانێ خۆی لە شـکان ببوێرێ و سـەرکەوتنەکان بکاتە نموونە بۆ دووپاتەکردنەوە. بە تایبـەت دەبێ وەک هەندێـک لە پیاوانی مەزنی ڕابردوو هەڵسـوکەوت بکا، ئەوانە کە دەسـتیان دابووە لاساییکردنەوەی کەسـانێک کە پێش ئەمان ببوونە خاوەن ناوبانگ و شانازی و شکۆ؛ دەبێ بە بەردەوامی پەڕاوی کار و کردەوە و چالاکی و ژیان و بەسەرهاتی ئەوانـی لە بەر دەسـتدا بـێ. وەک دەگوترێ ئەسـکەندەری مەزن لاسـایی ئەکیلی[1] کردۆتەوە؛ چێسـارێ لاسایی ئەسـەکەندەری کردۆتەوە، شـیپیۆنێ[2] کورشی کردبووە نموونە بۆ خۆی. هەر کەسێک ژیاننامەی کورش کە گەزنفۆن نووسیویە وەخوێنێ پاشان بە ڕوانین لە ژیانی شـیپیۆنێ بۆی دەردەکەوێ کە چۆن ئەم لاساییکردنەوە بووەتە هۆی شـانازی و شکۆی؛ تێدەگا کە شیپیۆنێ لە خۆپارێزی، ڕێزگرتن و ڕێزداری، ئینسانبوون و ئازادیخوازیدا، چەندە خۆی لەگەڵ ئاکار و کردەوەکانی کورشـدا، کە گەزنفۆن باسی کردوون، گونجاندووە؛ شـالیاری ژیر و زانا دەبێ لە شێوەی هاوچەشن ڕامێنێ و ڕاڤەیان بکا. لە کاتی ئاشـتی و ئارامیدا هەرگیز نابێ ئاسـوودە و بێ خەم و خەیاڵ پاڵ بداتەوە، بەڵکوو پێویسـتە زۆر لێهاتووانـە و زیرەکانە بیانکاتە ئەزموون و سـەرمایەی خۆی، بۆ ئەوەی کە لە ڕۆژی تەنگانە و نەهاتدا، کاتێک بەخت پشتی تێدەکا، پشتیان پێ ببەستێ و ئامادەیی خۆڕاگری و پاراستنی خۆی هەبێ.

---

١. Achille ، ئەکیل، ئەشیل، قارەمانی بەناوبانگ و ئەفسانەیی یۆنانی کە لە شەڕی ترۆیا کوژرا.

٢. شیپیۆنێ ئافریقایی، Scipione africano، نازناوی ژنراڵ و سپاسالاری بەناوبانگ پووبلیۆ کورنێلیۆ شیپیۆنێ [Publio Cornelio Scipione] (٢٣٥-١٨٣پ.ز) بووە.

## ١٥. سەبارەت بەو شتانە کە دەبنە هۆی ستایش و پەسەند یان گلەیی و گازندە لە مرۆڤ، بە تایبەت شالیاران

١ ئێستا کاتی ئەوەیە کە بزانین شالیار لە هەڵسوکەوت لەگەڵ دۆستان و حکومڕانی بەسەر ژێردەستەکانیدا دەبێ پەیڕەوی لە کام شێواز بکا. من دەزانم زۆر کەس[1] لەم بوارەوە نووسیویانە، منیش کە دەنووسم، گومانم هەیە کە بە لەخۆبایی دانەنرێم؛ بە تایبەت وەختێک لە ئاخاوتن و لێکدانەوەی ئەم بابەتەدا بە تەواوی لە میتۆدی ئەوانی تر دوور دەکەومەوە و لە ڕوانگەیەکی ترەوە بۆ بابەتەکە دەڕوانم. بەڵام چونکە مەبەستی من نووسینە لە بەرژەوەندیی ئەوانە کە لێم تێدەگەن، وام بە باش زانی ڕاستەوخۆ بڕۆمە سەر چۆنیەتیی ڕاستیی ڕووداوەکان لە واقیعدا، تاکوو بە هێنانە پێش چاو و وێناکردنیان لە خەیاڵدا بابەتەکە پوختەتر بکەم. زۆر کەس حکومەتی کۆماری و شالیارییان لە زەین و خەیاڵی خۆیاندا وێنا کردووە، بەڵام لە ڕاستیدا بوونیان نییە و هەرگیز نە بینراون، نە ناسراون؛ چونکە مەودای نێوان ئەوەی چۆن دەژین و ئەوەی چۆن دەبێ بژین گەلێک زۆرە و ئەو کەسە کە واز لەوە دەهێنێ کە دەیکا، بۆ ئەوەی کە دەبێ و پێویستە بیکا، لە جیاتی

---

١. ماکیاڤێلی بە ئەنقەست دیاری ناکات مەبەستی کێیە - هێندێ کەس دەبێژن مەبەست چیچێرۆنێیە - بەڵام هەر لە نووسینەکەیدا دەردەکەوێ کە مەبەست گشت ئەو نووسراوانەیە کە بەر لە ئەم سەبارەت بە سیاسەت ئوتوپیایی، خەیاڵی نووسراون. ئـ ئی. ئی.

خۆپاراستن، فێری کاولکردنی خۆی دەبێ. چونکە بۆ پیاوێک کە دەخوازێ لە هەموو جێگە و دەرفەتێکەوە چاک هەڵسوکەت بکا، لە نێوان هەموو ئەوانی تردا کە چاک نین، شکان و ڕووخانی حەتمی و چارهەڵنەگرە. کەوایە شالیارێک گەرەکی بێ خۆ بپارێزێ، دەبێ فێر ببێ لەوێ کە پێویستە چاک نەبێ و بزانێ کەڵک لەم چاکنەبوونەی خۆی وەرگرێ، دیارە تەنیا کاتێک کەڵکی لێ وەربگرێ کە ناچاری لێی دەخوازێ.

٢ بۆیە ئێمە ئەو شتانە دەنێینە لاوە کە سەبارەت بە شالیاری خەیاڵی گوتراون و شتە ڕاست و هەقیقییەکان ئەدەینە بەر باس و ڕاڤەیان دەکەین. جا بۆیە ئێستا من دەبێژم کاتێک باسی مرۆڤ دەکرێ، هەموو مرۆڤێک، بە تایبەت شالیار و خونکار بە هۆی بەرزیی پلە و پایەیانەوە، ئاکار و کرداریان دەبێتە پێوەر بۆ دادوەریکردن و هەڵسەنگاندنیان؛ ئەوان یان دەکەونە بەر گلەیی و گازندە یان دەبنە جێی پەسەند و ستایش. هەر بەم بۆنەوەیە کە هێندێک بە دڵاڤا و دلۆڤان دادەنرێن، هێندێک بە ڕژد و دەسقووچاو. -من لێرەدا وشەی تۆسکانی هەرێمی خۆمان بە کار دێنم، چونکە ماڵپەرست لە زمانی ئیتالیدا بەو کەسە دەوترێ کە بە دزی و ڕووتاندنەوەی خەڵک گەرەکیە ماڵ لە سەر یەک دانێ، بەڵام ڕژد و دەسقووچاو بەو کەسە دەڵێن کە کەڵک لەوەی هەیەتی وەرناگرێ- هێندێک بە بەخشندە و دڵفراوان دادەنرێن، هێندێک بە تاڵانکەر و ماڵ خەڵکخۆر، هێندێک دڵڕەق، هێندێک بە بەزەیی و هێندێک دڕندە؛ یەکێک پەیمانشکێنە، یەکێک سوور لە سەر وادە و بەڵێنە؛ یەکێک بێسفەت و خوێڕی و ترسنۆکە، ئەوی تر چاونەترس و بە دەست و بردە؛ یەکێک ئینسانە و ئەوی تر سەرسەری و هیچ و پووچە؛ یەکێک بێپەروایە و ئەوی تر بەپارێزە؛ یەکێک سادق و ڕووڕاستە، ئەوی تر زیرەک و فێڵەزانە؛ یەکێک چەق و ڕەقە، ئەوی تر ساکار و دەڵرفێنە؛ یەکێک لە سەر بڕیاری قورس ڕادەوستێ، ئەوی تر لەرزان و ڕاڕاییە؛ یەکێک بەباوەڕە، ئەوی تر بێ دین و ئیمانە و هتد... من دەزانم هەموو کەس باوەڕی وایە کە فرە جێی پەسەند و ستایش دەبێ کە ئەگەر شایەکت هەبێ کە لە ناو هەموو ئەو تایبەتمەندییانە کە لە سەرەوە وتران، ئەم چاکەکانیانی هەبێ. بەڵام چونکە

ناکرێ هەموویانت ببێ و هەموو لە بەرچاو بگری، چونکە بارودۆخ و دۆزی مرۆڤ ئەو دەرفەتە نارەخسێنێ، پێویستە فرە وریا و بەپارێز بی و بزانی خۆ لەو بەدناوی و گەندەڵییانە دوور بگری کە دەبنە هۆی لەدەستچوونی دەوڵەت؛ ئەگەریش بلوێ و بکرێ خۆ لەوانە بپارێزی کە نابنە هۆی لەدەستچوونی؛ بەڵام ئەگەر نەکرا و ئیمکانی نەبوو، دەکرێ بەبێ دڵەڕاوکێـــی زۆر لێیان گەڕێی و گوێیان پێ نەدەی. بۆ خۆبـــواردن لە بەدناوی، نابێ خۆ بپارێزی لـــە پەنابردنە بەر ئەو بەدئـــاکاری و بەدکارییانە کە بەبێ ئـــەوان، ڕزگارکردن و پاراستنی دەوڵەت فرە ئەستەم دەبێ؛ چونکە ئەگەر هەموو شتێک بە چاک بزانی، ئاخری هەر شتێک خۆ دەنوێنێ کە چاکەی دەزانی و ئەگەر پەیڕەوی بکەی و لە سەری بڕۆی ڕووخان و تێداچوونی دەوڵەتی تۆی لێ دەکەوێتەوە؛ هێندێک شتی تر خۆ دەنوێنن کە بە بەدئاکاری و بەدکاری دێتە بەرچاو، بەڵام پەیڕەوکردن و لەســـەرچوونیان دەبێتە هۆی ئاسایش و ئەرخەیانیی شالیار.

## ١٦. سەبارەت بە دڵاڤایی وماڵداری

١ بە ئاوڕدانەوە لە یەکەم تایبەتمەندی کە لە سەرەوە باس کرا، ئێستا باسی ئەوە دەکەم کە چۆن چاک وایە بە دڵفراوان دابنرێی و سەرباری دڵفراوانی، ئەگەر بە جۆرێک وەکاری بخەی و کەڵکی لێ وەرگری کە بەڕاست بە دڵفراوان دابنرێی زیانی بۆت دەبێ. چونکە ئەگەر تۆ بێ غەل و غەش و نەجیبانە کەڵکی لێ وەرگری و کرداریی بکەیتەوە، هەڵبەت بەو چەشنە کە دەبێ کرداری بکرێتەوە و کەڵکی لێ وەربگیرێ قەدری نازانرێ و بە دڵفراوانت نازانن؛ هەروەها نابێتە هۆ بۆ ئەوەی بەدناویی ڕژدی لە تۆ دوور بخاتەوە. بۆ ئەوەی کە لە نێو خەڵکدا بە دڵفراوان ناوبانگ دەرکەی، پێویستە هیچ تایبەتمەندییەکی مرۆڤێ هێژا و دلۆڤان پشتگوێ نەخەی. ئەو شالیارە کە بە دڵفراوان ناوی دەرکردووە، هەمیشە هەموو سامانی تایبەتی خۆی لەم بوارەدا سەرف دەکا؛ لە ئاکامدا ئەگەر بیهەوێ ناوبانگی دڵفراوانی بپارێزێ، ناچارە قورسایی خۆی بخاتە سەر گەل و بە ڕووتاندنەوە و سەرانە لێسەندن هەراسانی بکا و ماڵ و داراییان لێ داماڵێ؛ دەست دەدا بە هەموو ئەو کارانە کە بۆ بەدەستهێنانی دراو دەکرێ. ئەمەش دەبێتە هۆ بۆ ئەوەی بکەوێتە بەر نەفرەت و تووکی ژێردەستەکانی، یان بە هۆی هەژاربوونی بەردەوامی زۆرینەیانەوە ستایش و پەسەندی ڕوو لە کەمی دەکا. بە جۆرێک کە ئاکامی ئەم دڵفراوانییە دەبێتە سووکایەتی و بێڕێزی بە زۆرینەی ژێردەستەکانی و خەڵات و پێشکەشدان بە کەمینەی فرە بچووک.

جا کــە وایە، کارتێکەریــی هەموو شــڵەژان و ئاژاوەیەکی بچووک هەســت پێدەکا و یەکەم هەرەشــە و مەترسییەکان پایەی دەسەڵاتی دەلەرزێنن. ئەگەریش پاش ئاگاداری لە بارودۆخ گەرەکی بێ دەســتبەرداری دڵفراوانی بێ، ئەوە هەر زۆر زوو وەکوو ڕژد و چرووک ناوبانگی دەڕوا. بۆیە شالیار، بێ ئەوە کە زیانی پێ بگا، ناتوانێ ئەم تایبەتمەندییە دڵفراوانییە پەیڕەو بکا. ئەگەر بیهەوێ بایەخــی دڵفراوانیی بزانرێ و بە دڵفراوان بناسرێ دەبێ دوورەنواڕ و بەمشــوور بێ و ترسی ئەوەی نەبێ کە بە ڕژد و چرووک ناوی ببرێ. چونکە لــە ڕێڕەوی زەماندا هەردەم و هێدی هێــدی دەتوانێ دڵفراوانیی خۆی بنوێنێ. شــالیارێک کە بە دەســت پێوەگری و ماڵداری و داهاتی ئاسایی ڕازی دەبێ و لە کاتی شــاڵاوی دوژمندا هەر بەوەندە دەتوانێ کاری شەڕەکانی خۆی بەڕێوە بەرێ و بەرگری لە خۆی بکا، بێ ئەوەی کە قورسایی زیاتر بخاتە سەر گەل، ئەوە بەم شێوەیە دڵفراوانیی خۆی بەو کەسانە دەنوێنێ کە ماڵ و داراییان لێ وەرناگرێت، دیارە ئەمانەش بێئەژمارن. لە ڕوانگەی هەموو ئەوانەشەوە کە تەخشان و پەخشانیان بۆ ناکا و پێیان نادا ڕژد و چرووک دەنوێنێ، دیارە کە ژمارەی ئەمانەش فرە کەمە.

٢ لە ڕۆژگاری ئێمەدا تەنیا ئەو کەسانە کاری گەورەیان بە ئەنجام گەیاندووە کە بە ڕژد و چــرووک ناویان دەرکردووە. بە پێچەوانەوە، بە چاوی خۆمان بینیمان ئەوانی تر چۆن تێداچوون. پاپا جوولیوی دووهەم، وێڕای ئەوەی کە بە کەڵک وەرگرتن لە بانگەشــەی دڵاڤایی و بەخشــندەیی خۆی گەیاندە پلەی پاپا، دواتر بۆ ئەوەی بتوانێ شەڕەکانی بباتە پێشەوە، بیری لەوە نەدەکردەوە کە پێویستە ئەو بەڵێنانەی دابوونی بەجێیان بێنێ. پادشای ئێســتای فەڕانســە[1]، بێ ئەوەی کە ناچار بێ پیتاکی زیاتر بخاتە ئەستۆی ژێردەستەکانی شــەڕی زۆری بە ئەنجام گەیاند؛ تەنیا لە بەر ئەوەی کە خۆی لە تەخشــان و پەخشــان بواردبوو و بە دوورەنواڕی و دەســت پێوەگرییەوە پاشەکەوتی کردبوو. پادشای ئێستای

١. مەبەســت لویجی دووزادەهەمە کە پێشتر ئاماژەی پێ درا؛ لە ٣١ دێسەمبری ١٥١٤ دا مردووە؛ ئەم پەیڤانە بە شێوەیک حەشا هەڵنەگر کات نووسین و بڵاوکردنەوەی شالیاری م. دەسەڵمێنن. ئـ ئی. ئی.

ئیســـپانیا[١]، ئەگەر دڵاڤایی و بەخشندەیی نواندبا، نە دەیتوانی ئەو هەموو شەڕە بە ئەنجام بگەیەنێ و نە سەرکەوتنی بە دەست دەهێنا. کەوابێ شالیار –بۆ ئەوەی کە ماڵ و دارایی ژێردەســتەکانی داگیــر نەکا، بۆ ئەوەی کــە بتوانێ بەرگری لە خۆی بــکا، بۆ ئەوەی کە نەکەوێتە پیسی و نەداری و ســووک نەبێ، بۆ ئەوەی کە ناچار نەبێ دەستدرێژی بکاتە سەر ماڵ و حاڵی خەڵک– نابێ ترسی لە ئەوە بێ کە بە دەسقووچاو و ڕژد ناوی ببرێ. هەروەها ئەگەر هێندێک کەس دەیانگوت کە چێزســارێ بە هۆی دڵاڤایی و تەخشــان و پەخشــانەوە بووە بە ئیمپراتۆر و زۆر کەســی تر هەر بە هۆی ئەوەی دڵفراوان بوون و بۆ ئەوەی کە بە بەخشــندە دەناسران، گەیشــتن بە پلە و پایەی فرە بەرز؛ من بەم شێوەیە بەرســڤیان ئەدەمەوە: تۆ یان شالیاری یان لە ڕێگەی بەدەســتهێنانی شالیاری و تەختی شــاییدای؛ لە حاڵەتی یەکەمدا، ئەم دڵفراوانییە بە زیانە؛ لە حاڵەتی دووهەمدا، پێویســتە و دەبێ وەک کەســێکی دڵفراوان و بەخشندە بناسرێیت. زۆر چاکە، دەی چێسارێیش یەکێک لەوانە بوو لە ڕێگەی بوون بە شــالیارەوە بوو و دەیەویست لە سەر تەختی شای ڕۆما دانیشێ. بەڵام دوای بوون بە شالیار، ئەگەر مەرگ مەودای دابا و هەر وا درێژەی بە تەخشــان و پەخشان و هەڵەخەرجی دابا و دەست پێوەگری و ماڵداریی پەیڕەو نەکردبا، دەبووە هۆی ڕووخان و تێکشانی ئەو ئیمپراتۆرییە.

٣ دیسانیش ئەگەر کەسانێک ئا بەم شێوەیە بەرسڤی من بدەنەوە کە: زۆر کەس شالیار بوون و بە سپای خۆیانەوە کاری مەزنیان بە ئەنجام گەیاند، ئاوا وەڵامیان دەدەمەوە: شالیار یان لە سامان و دارایی خۆی خەرج دەکا، یان لەوەی ژێردەستەکانی یان لەوەی ئەوانی تر. لەحاڵەتی یەکەمدا، دەبێ دەست پێوەگر بێ و هەڵەخەرجی نەکا؛ لە حاڵەتی دووهەمدا، نابێ بە هیچ جۆرێک بە ســەر ماڵ و دارایی ژێردەستەکانیەوە تەخشان و پەخشان بکا و دڵاڤایی بنوێنێ. ئەو شــالیارەش کە لەگەڵ سپایە دەبێ و بە تاڵان و شڕەخۆری و بەسەر ماڵی ئەوانی ترەوە دەلەوەڕێ، دەبێ وەها تەخشــان و پەخشــانێک بکات و دڵفراوانی

---

١. مەبەست فێردیناندۆ ناسراو بە کاتۆلیک-ە [Ferdinando il Cattolico] لە ٢٣ ژانویەی ١٥١٦ دا مردووە. ئـ ئی. ئی.

بنوێنێ؛ چونکە ئەگەر وا نەکا سەرباز و سپای شوێن ناکەون و گوێبیستی نابن. لەو ماڵ و داراییەی هی خۆت و ژێردەستەکانی تۆ نییە، دەکرێ بە پانایی و فراوانی زۆرترەوە دڵاڤایی و بەخشـــندەیی بنوێنی، وەکچۆن کورش، چێساری و ئەسکەندەری مەزن وایان دەکرد. چونکە دڵاڤایی و بەخشـــین لە ماڵ و دارایی ئەوانی تر نەتەنیا نابێتە هۆی کەمبوونەوە و ســـەندنەوەی ناوبانگی تۆ، بەڵکوو پەرەی پێ دەدا؛ تەنیا خەرجکردنی ئەوەی خۆتە کە زیانت پێ دەگەیەنێ؛ هیچ شـــتێک وەکوو دڵاڤایی و تەخشـــان و پەخشان نابێتە هۆی توانەوە و سووتانی خودی خۆی. ئەمە جۆرێکە کە هەرچی زۆرتر بەکاری دەبەی زیاتر شێوەی دروست بەکارهێنانیت لە دەست دەردەچێ. لە ئاکامدا هەژار و نەدار و سووک و ڕیسوا دەبی و بۆ دەربازبوون لەم هەژارییەش پەنا دەبەیتە بەر دەستدرێژیکردن؛ ئەمەش دەبێتە هۆی ڕق و نەفرەت لە تۆ. لە نێوان هەموو ئەو شتانەی کە شالیار دەبێ خۆی لێیان بوێرێ ســـووکبوون و کەوتنە بەر تووک و نەفرەتە؛ دڵاڤایی و تەخشـــان و پەخشـــانیش ئەم دووانەی بە شـــوێنەوەیە. کەوایە ژیرانە و زانایانە ئەوەیە کە بە ڕژد و دەسقووچاو ناو دەرکەی کە بەدناویی بێ تووک و نەفرەتی بە شوێنەوەیە، تا ئەوەی کە لە پێناو دەرکردنی ناوبانگی دڵاڤا و بەخشـــندەدا، ناچار بی پەنا بەریتە بەر دەستدرێژی بۆ سەر ماڵ و حاڵی خەڵک، کە بەدناویی وێڕای تووک و نەفرەتی بە شوێنەوەیە.

## ١٧. سەبارەت بە دڵڕەقی و بەزەیی، ئاخۆ بۆ شالیار چاک وایە خۆشیان بوێ یان لێی بترسن، یان باشتر وایە بترسن لێی تا خۆشیان بوێ؟

١ ئێستا دەپەرژێینە سەر یەکێکی تر لەو تایبەتمەندییانە کە لە سەرەوە ڕیزمان کردن.[١] لەم بوارەوە من دەبێژم: بۆ هەموو شالیارێک چاکتر وایە بە بەزەیی و دلۆڤان بناسرێ تا دڵڕەق و بێبەزەیی. هەڵبەت هاوکات دەبێ وشیار بێ کە خراپ کەڵک لەم بەزەیی و دلۆڤانییە وەرنەگرێ. چێساری بۆرجیا بە دڵڕەق و بێبەزەیی دەناسرا[٢]؛ بەڵام ئەم دڵڕەقی و توندئاژۆییەی بووە هۆی سەروساماندان بە ڕومانیا و یەکگرتوویی، ئاشتی و ئاسایشی بۆ گەڕاندبۆوە و دانیشتووانی ئەمەگداریی خۆیانیان بۆی نواند. ئەگەر بە وردی ئەمە لێک بدەینەوە دەبینین چێساری گەلێک بەبەزەیی و دلۆڤانترە بووە لە فیورێنتینییەکان کە بۆ ئەوەی تاوانی دڵڕەقی و دڕندەییان نەدرێتە پاڵ لێگەڕان کە پیستۆیا وێران بکرێ.[٣] کەوابێ شالیار بۆ ڕاگرتنی ژێردەستەکانی بە یەکگرتوویی و ئەمەگداری نابێ ترسی لەوە بێ کە بە دڵڕەق و بێبەزەیی ناوی ببرێ. دەتوانێ بە چەند نموونەی کەم لە دڵڕەقی نواندن، لە

---

١. ئاماژەیە بە بەشی پازدە، ٢.

٢. سەبارەت بە کارەکانی چێساریٚ بورجیا بڕوانە بەشی ٧.

٣. Pistoia [بازێرێکە لە مەڵبەندی تۆسکانە لە ناوەندی ئیتالیا هەڵکەوتوو] لە ١٣٢٨-٣١ لە بندەستی فیرێنزییەکاندا بووە. کۆماری فیرێنزێ لە ڕەوتی ڕووداوەکانی ئەو ماوەیەدا، بۆ ئەوەی کە چاکتر بە سەریدا زاڵ بێ، لە هەمبەر شەڕی بەرە و لایەنەکان جۆرێک لە بێهەڵوێستی گرتبووە پێش و شەڕی نێوخۆیی بووە هۆی وێرانبوونی ئەم شارە. ت ئی. نی.

زۆرێک لەو کەسانە کە بە هۆی نەرم و نیانی و بەزەیی زۆرەوە دەبنە هۆی سەرهەڵدانی کوشتوبڕ و تاڵان و ڕاوڕووت، بەبەزییتر و دلۆڤانتر بناسرێ: چونکە ئەمانە بە نەرم و نیانی نواندنی زۆر دەبنە هۆی زیانگەیاندن بە زۆرینەوە و گشتێتی، لە کاتێکدا دڵرەقیی ئەو تەنیا کەمینەیەک دەکاتە ئامانج و زیانیانی پێ دەگەیەنێ. لە نێو گشت شالیاراندا، بۆ شالیاری نوێ، نالوێ و ناشێ خۆی لەوەی کە ناوی بە دڵرەق و بێبەزەیی بڕوا ببوێرێ؛ چونکە دەوڵەتە نوێیەکەی تەژییە لە هەڕەشە و مەترسی. بۆیە ڤێرجیلیۆ[1] بە زمان دیدۆنێ[2]وە ئاوا دەئاخڤێ: «هەلومەرجی دژواری تاج و تەختی نوێ، بۆ پاراستنی هەموو سنوورەکانی جێگەی مەبەستم، پاڵم پێوە دەنێ پشت بەم ڕێگە و ڕەوشانە ببەستم».[3] سەرەڕای ئەمەش شالیار دەبێ لە باوەڕکردن بە هەڕەشەکان و کاردانەوە بەرانبەریان وشیار و بەپارێز بێ و، لە هیچ و خۆڕایی نەبێتە زەندەقبەر و ترسێنەر؛ پێویستە لە پێشڕەوییەکانیدا پەیڕەوی هاوسەنگی نێوان بەپارێزبوون و مرۆڤبوون بکا. زۆر متمانە بە خۆی نابێ ببێتە هۆی دەست نەپارێزی و بێباکی، بێ متمانەیی و بێ بڕوایی زۆریش نابێ بگاتە ئاستێ کە کەس پشتی پێ نەبەستی.

٢ لەم مشتومڕانەوە[4] ئەم باسە هاتووەتە ئاراوە کە ئاخۆ چاک وایە شالیاریان خۆش بوێ یان لێی بترسن یان بە پێچەوانەوە. من لە وەڵامدا دەڵێم: هەر دووی ئەمان پێوستن و دەبێ

---

١. Vergilio یا Virgilio Marone (٧٠-١٩ پ.ز): هۆزانڤان و شایەری بەناوبانگی لاتینە. لە سەدەکانی ناڤیندا هۆنراوە و هۆزانەکانی لە ئاستێکی بەریندا ڕوونووسی و پەخش و بڵاو دەکرانەوە. ڤێرجیلیۆ لە فەرهەنگ و کولتووری لاتینی سەدەکانی نێوەڕاستدا، جگە لە هۆزانڤانی، وەکوو دیرۆکنووس، پەیامهێنەری ژیر و زانا و تەنانەت جادووگەریش ناسراوە. خۆشەویست بووە و گاڵتە و شۆخیشی پێ کراوە. ئێنیادێ [Eneide] کە لە (٢٩-١٩ پ.ز.) هۆنراوەتەوە، بە هۆی مەرگی هۆزانڤانەوە بە ناتەواوی ماوەتەوە. ئەم هۆنراوە درێژە، پێکهاتوو لە دوازدە پەڕاو، کە لە پەڕاوی (١-٦) بەسەرهاتەکانی ئێنێئا [Enea] پاش ڕووخان و کاولبوونی ترۆیا و ئاوارەبوونی و گەڕان بە شوێن خاکی وادەپێدراو، تاکوو گەیشتن بە ئیتالیا دەگێڕێتەوە. پەڕاوی (٧-١٢) چیرۆکی شەڕەکانی ئێنێئا بۆ داگیرکردنی لازیۆ دەگێڕێتەوە و دەیکاتە نێوئاخنی هۆنراوەکەی.

2. Didone

٣. ئەم پەیڤانە بە زاری دیدۆنێ بە ئلیۆنێ دەبێژرێ، کە سکاڵا و گلەیی لە پێشوازیی دوژمنکارانەی کارتاجێنێیەکان دەکات لە هەڵاتووان و پەرتەوازەبووانی ترۆیا. ئـ ئی. ئی.

٤. مشتومڕانەوە: مەبەست ئەو باس و مشتومڕانەیە کە تا ئەوکات و پێشتریش سەبارەت بە شالیار و شێوەی هەڵسوکەتی لە ئارادا بووگن. زۆر لەو کەسانە کە ئاوڕیان لەم باسە داوەتەوە، ڕایان وا بووە کە چاکتر وایە خۆشتیان بوێ. ئـ ئی. ئی.

خاوەن هــەر دوو تایبەتمەندی بێ. بەڵام چونکە ئاشــتکردنەوە و کۆککردنیان پێکەوە دژوارە، ئەگەر بڕیار وایە لە یەکیان چاوپۆشی بکەی و ئەوی تر هەڵبژێری، دڵنیایی زۆرتر لەوەدایە لێت بترســن تا ئەوەی کە خۆشتیان بوێ. چونکە سەبارەت بە مرۆڤ بە گشتی دەکرێ ئاوا بوترێ: ناسپاس و قەدرنەزانن، لە هەڵکشان و داکشان و گۆڕانی بەردەوامدان، دووڕوو و ڕیــاکارن و بــەردەوام دەمامک دەگۆڕن؛ خۆ لە مەترســی دەبوێرن و لە ماڵ کۆوەکردندا باشار نەهاتوون. تا کاتێک چاکەی بۆ دەکەی بە تەواوی خۆ بە دەربەست دەزانن و خەزمەتت دەکەن و لە پێناوی تۆدا خوێن، دارایی و ژیان و ڕۆڵەکانیان بەخت دەکەن، هەڵبەت وەک پێشتر گوتم، کاتێک مەترسییەکان هێمان دوورن. بەڵام کاتێک مەترســی نزیک دەبێتەوە، ڕادەپەڕن و ڕووت لێ وەردەگێڕن و پشتت چۆڵ دەکەن. ئەو شــالیارە کە پشت بە بەڵێن و قسەی ئەوان ببەســتێ لە تەنگانەدا نائامادە و دەستەوەستان دەبێ و شکان و ڕووخانی حاشاهەڵنەگرە. چونکە ئەو دۆستایەتی و پێوەندییە کە لە سەر هۆگریی بەرانبەر و بەرزی و بلیمەتیی گیان دانەمەزرابێ بەڵکوو کڕدرابێ و نرخی درابێ، دۆستایەتییەک نییە کە لێی خاترجەم بی و حەساوی لە سەر بکەی و هەر وەخت بتەوێ پشتی پێ ببەستی. مرۆڤەکان ئاســان و بێنیگەرانی بێڕێزی بەو کەسانە دەکەن و زیانیان پێدەگەیەنن کە خۆی لایان خۆشەویســت کردووە و خۆشیان دەوێ تا ئەو کەسەی کە ترساندوونی و لێی دەترسن. چونکە ئەو خۆشەویستییە بەرهەمی چاکەکردن و خزمەتێکە کە پێیان کراوە. مرۆڤ چونکە بەدزاتە هەر ئەوەندە کە دەرفەتێکی لەبارتری بۆ ڕەخسا، کە بەرژەوەندیی خۆی لەوێدا ببینێتەوە، پێوەندی دەپچڕێنێ و پەیمان دەشکێنێ. بەڵام هەوێنی ڕاگرتنی ســام و ترس، ترسە لە ســزایەکە کە هەرگیز لە کۆڵ نابێتەوە. سەرەڕای ئەمانەش، ترسێنەری و سامی شــالیار دەبێ بە جۆرێک بێ کە ئەگەر خۆشەویستیی بۆ دەستبەر ناکا، لانیکەم نەفرەت و بێزاریی لێ دوور کاتەوە و نەبێتە هۆی هەڵگیرسانی ڕق و قیــن و تووڕەیی دژ بە ئەو. چونکە زۆر چاکە کە ئەم دوو شــتەت پێکەوە هەبێ، واتە هاوکات کە لێت دەترســن، ڕق و نەفرەتیان لە تــۆ نەبێ؛ ئەمەش کاتێک دێتە ئاراوە کە

شالیار خۆی لە دستدرێژیکردن بۆ سەر ماڵ و دارایی و ژنی شارۆمەندان و ژێردەستەکانی بپارێزێ. کاتێکیش گەرەکیە کەسێک بە مەرگ مەحکووم بکا و گیانی لێ بستێنێ، دەبێ بەڵگە و پاساوی گونجاوی بە دەستەوە بێ و هۆکار ئاشکرا و ڕوون بێ. بە تایبەتی پێویستە کە خۆ لە داگیرکردنی ماڵ و دارایی خەڵک بپارێزێ؛ چونکە مرۆڤ مەرگی باوک ئاسانتر فەرامۆش دەکا تا دەستگرتن بە سەر ماڵ و دارایید‌ا. هەروەها چونکە هۆ و بیانوو بۆ داگیرکردنی ماڵی خەڵک هەر دوایی نایێ؛ چونکە ئەوەی بە داگیرکردن و دەستگرتن بەسەر ماڵ و دارایی خەڵکدا ژیان دەباتە سەر، هەمیشە پاساو و بیانوویەک بۆ داگیرکردنی ماڵ و دارایی ئەوانی تر دەدۆزێتەوە. بەڵام بە پێچەوانەوە، گیان ئەستاندن و بڕیاری کوشتن دەگمەنن و ناتوانێ بەردەوام بێ و لە کورتماوەدا کۆتایی پێدێت.[1]

٣ بەڵام کاتێک شالیار لەگەڵ سپادایە و ڕێبەریی شەڕڤانی زۆر دەکا، نابێ بە هیچ جۆرێک خۆی لەوە کە پێی بگوترێ دڕ و دڵڕەق ببوێرێ؛ چونکە بەبێ وەها ناوبانگێ هەرگیز یەکڕیزی و یەکگرتوویی سپای بۆ دەستەبەر ناکرێ و ناتوانێ هیچ چالاکییەکی سەربازی بە ئەنجام بگەیەنێ. لە نێوان چالاکییە پڕ لە سەروەری و شانازییەکانی ئانیبالدا[2] ئەم خاڵە هەر ئێگجار زەقە؛ ئەو خاوەن سپایەکی مەزن، پێکهاتوو لە پیاوانێ سەر بە تیرە و هۆز و ڕەگەزی زۆر جیاواز بوو، بەوەیشەوە توانیبووی بە مەبەستی ئەنجامدانی چالاکیی سەربازی لە خاکێکی نامۆدا ڕێبەرییان بکا، بێ ئەوەی لە نێوان خۆیاندا تووشی ناکۆکی و گێرە و کێشە بن یان نافەرمانیی شالیار بکەن و دەردیسەری بۆ دروست بکەن؛ ئەمە هەم لە کاتی دژواری و نەهاتیدا و هەم لە کاتی هات و بەختیاریدا وا بوو؛ سەرچاوەکەشی جگە لە دڕی و دەڵڕەقیی نامرۆڤانەی ئانیباڵ هیچی تر نەبوو. دڵڕەقییەک، کە وێڕای لێهاتوویی

---

١. مەبەست ئەوەیە کە پاش سەقامگیری و قورس و قایمکردنی پایەکانی دەوڵەت و دەسەڵات ئیتر پێویست بە کوشتوبڕ ناکا.

٢. Annibale، بەناوبانگترین سپاسالاری کارتاجێنسیەکان کە لە (٢٢١ تا ٢٢٢ پ.ز.) دژی ڕۆمیەکان جەنگیوە؛ ئەم فەرماندە سەربازیە سپا و لەشکری خۆی تا پشت شوورەی شاری نەیارانی هێنابوو، بەڵام لە ئاکامدا شکا و ناچار بوو بڕواتە تاراڤگە؛ ئاخری لە ١٨٣پ.ز.، بە خۆکوژی کۆتایی بە ژیانی هێناوە. ئـنی.نی.

و لێوەشـاوەییە بێ ژمارە سـەربازییەکانی، لە بەرچاو سەربازان و سـپاکەی کردبوویانە کەسـێکی بەسـام و تۆقێنەر. دیارە کە بەبـێ ئەم تایبەتمەندییە، بۆ ئـەوەی کە ئەوەندە کاریگـەر و بەبڕش بێ، لێهاتوویی و هەڤیازییەکانی دیکەی بە تەنیا بەس نەبوون. بەڵام نووسەران نە وردبین و نە تیژ، لە لایەکەوە سەرسامی کار و چالاکییەکانی ئەو بووگن، لە لایەکی ترەوە تانە و تەشەریان لە هۆیە سەرەکییەکەی داوە.

٤ سەلماندنی ئەو ڕاستییە کە ژێهاتی و هەڤیازییەکانی تری بەس نەبوون،لە شیپیۆنێدا بە چاکی دەردەکەوێ. ئەم پیاوێکی دەگمەن و هەڵکەوتوو بوو، نەتەنیا لە ڕۆژگاری خۆیدا بەڵکوو ئەوەندەی کە مێژوو لە بیریە. بەڵام سـەرەڕای بلیمەتی، لە ئیسپانیا سپاکەی لێی هەڵگەڕایەوە و دژی وەستایەوە: هۆ و سەرچاوەی ئەمەش، جگە لە نەرم و نیانیی شیپیۆنێ هیچی تر نەبوو؛ ئەو زێدەتر لەوە لەگەڵ دەسـتوور و تەکووزیی سەربازیدا گونجاو بێ، بەری بۆ سـەربازانی شـل کردبوو و ئازادیی پێ دابوون. ئەم شـێوە هەڵسـوکەوتەی لە سێناتوی ڕۆما لە لایەن فابیۆ ماسیمۆ-وە[1] درابووە بەر تانە و تەشەر و ڕەخنەی لێ گیرابوو. فابیۆ شیپیۆنێی بە گەندەڵکەرەوەی سپای ڕۆما ناوزەد کردبوو، چونکە خەڵکی لۆکری[2] هەموو بە دەسـتی یەکێک لە سـەردارانی قەڵاچۆ کرابوون، بەڵام شیپیونێ نە تۆڵەیانی سەندبۆوە، نە لە سەرداری گەندەڵی پرسیبۆوە؛ سەرچاوەی هەموو ئەمانەش نەرم و نیانیی سروشتی ئەم بوو. هەر بۆیە کاتێک لە سێناتۆدا ویستبووی داوای لێبووردن بکا، یەکێک پێی گوتبوو: پیاوانێ زۆر بوون کە وایان بە چاک دەزانی خۆ لە هەڵە و کاری ناپەسـەند بپارێزن، تاکوو ئەوەی کە هەوڵی ڕاسـتکردنەوەی هەڵەکانیان بدەن. ئەگەر شیپیۆنێ لە بەڕێوەبردنی ئەرکەکانی خۆیدا، لە پاراسـتنی ئەم خوو و ڕەوشـتەی بـەردەوام ببووا، بە دڵنیاییەوە دەبوو بە هۆی نەویکردنەوەی شـانازی و شکۆی خۆی. بەڵام چونکە لە ژێر فەرمانی سێناتۆدا کارەکانی بەڕێوە دەبرد، ئەم تایبەتمەندییە زیانهێنەرەی نەتەنیا زیانی بۆ

---

١. Fabio Massimo، (٢٧٥-٢٠٣ پ.ز.) ژنراڵی ڕۆمی کە بە هۆی ستراتژی و تاکتیکە بڕستبڕەکانی دژی ئانیباڵ ناوبانگی دەرکردبوو. ـ ئی. ئی.

٢. Locri Epizefirii، شارێ لە مەڵبەندی کالابریا، لە باشووری ئیتالیا.

نەبوو، بەڵکوو ببووە هۆی شانازی و شکۆی.

٥ بە گەڕانەوە بۆ سەر ئەو پرسە کە ئاخۆ چاک وایە خۆشەویست بی یان لێت بترسن، کۆتایی بەم باســە دێنم و دەڵێم: مرۆڤەکان بە ویست و حەزی خۆیان خۆشتیان گەرەکە و ڕێزت دەگرن و بە ویســـت و ئیرادەی شـــالیار لێی دەترسن. بۆیە شـــالیاری ژیر و زانا دەبێ ئەوە بکاتە بنەڕەت و بناخەی لە ســـەر دانێ کە خۆی خاوەنیەتی، نەک پشـــت بە خاوەنداریی ئەوانی تر ببەستێ. وەک پێشتر وتم، ئەو تەنیا دەبێ باش وریای ئەوە بێ کە بێزراوی گەل نەبێ و خۆی لە کەوتنە بەر تووک و نەفرەتی ژێردەستەکانی بپوێرێ.

## ١٨. شالیاران چۆن دەبێ پابەندی گفت و پەیمانیان بن؟

١ ئەوەی کە شالیارێک سوور بێ لە سەر وادە و بەڵێنی و بە دروستی تەواوەوە بژیت و پەنا نەباتە بەر فرت و فێڵ و زیرەکی و گزی گشـت کەسێک دەزانێ چەندە جێگەی پەسند و ستایشتە. بەڵام سەرەڕای ئەمانە، لە ڕۆژگاری خۆماندا شالیارانێک دەبینرێن کە بێ ئەوەی گرینگییەکی ئەوتۆ بە ڕاگرتنی پەیمان و بەڵێنی دراویان دابێ و لە سەر گفت و پەیمان سوور بووبێتن کاری گەورەیان بە ئەنجام گەیاندووە. شالیارانێک کە بە فێڵەزانی و زیرەکی زانیویانە خەڵک فریو بدەن لە ئاکامدا لەو شالیارانە کە بناخەی خۆیانیان لە سەر هەقیقەت و ڕاستی داناوە تێپەڕیون.[١]

٢ کەوابوو دەبێ ئەوەش بزانین کە دوو شێوە بۆ شەڕ و پێشڕەوی هەیە: یەکێک لە ڕێی یاساوەیە، ئەوەی تر لە ڕێگەی هێزەوەیە. ئەوەی یەکەم تایبەت بە مرۆڤە، ئەوەی دووهەم تایبەتــە بە ئاژەڵ. بەڵام چونکە ئەوەی یەکەم زۆر جــار بەس نییە، چاک وایە پەنا ببرێتە بەر ئەوەی دووهەم[٢]؛ بۆیە بۆ شــالیار پێویستە بزانێت باش کەڵک لە سروشتی ئاژەڵانە و مرۆڤانە وەرگرێ. ئەم ئامۆژگارییە لە کۆنەوە لە لایەن نووسەرانەوە لە ژێر ناوی ئەفسانەدا

---

١. بە ئەگەری فرە ئاماژەیە بە فرانچێسکۆ سفۆرزا، چێساریێ بۆرجیا و فێردیناردی کاتولیک، شای ئیسپانیا. ئی. ئی. ڤ.

٢. لەگەڵ چیچێرۆنێ *سەبارەت بە ئەرکەکان* ١، ٣٤ بەراورد بکرێ، لەوێ کە دەنووسێ: «شێوەکانی جەنگین دووانن، یەک لە ڕێی باس و گفتوگۆوە، ئەوی تر لە ڕێی هێزەوە، ئەوەی یەکەم تایبەت بە مرۆڤە، ئەمەی دووهەم تایبەت بە ئاژەڵان: ئەگەر ئەوەی یەکەم بەس نەبوو ناچاری پەنای بیەیتە بەر ئەوەی دووهەم». ئـ ئی. ڤ.

بە شـــالیاران دەگوترایەوە. نووسەران باسی ئەوە دەکەن کە چۆن سێنتاور کیرۆن[١] ئەکیل و گەلێکی تر لە شـــالیارانی کەڤناری پێگەیاندبوو و بەپێی ڕێساکانی خۆی پەروەردەی کردبوون. ئەوەی کە پەروەردەڤان و ڕاهێنەرێکت هەبێ کە نیوە ئاژەڵ و نیوە مرۆڤ بێ، تەنیا بەو مانایەیە کە بۆ شالیار کەڵکوەرگرتن لە سروشتی هەر دوو پێویستە؛ چونکە تەنیا بە یەک لەوانە و بێ ئەوەی -تریان بەردەوام و پایەدار نابێ.[٢] بۆیە پێویســـتە شـــالیارێک بە باشـــی سروشتی ئاژەڵ بە کار بێنێ، لە ناو ئاژەڵانیشـــدا دەبێ ڕێوی و شێر هەڵبژێرێ: چونکە شێر ناتوانێ بەرەنگاری داو و تەڵە ببێتەوە، ڕێویش لە هەمبەر گورگ ترسنۆک و بێدەســـەڵاتە. کەوابوو دەبێ ڕێوی بیت و داوەکان بناسی، شێر بی و گورگەکان بتۆقێنی؛ ئەوانەی کە تەنیا پشـــت بە تەرزی شێرانە دەبەستن، لە کاکڵەی شتەکان تێنەگەیشتوون. بۆیە مەزنێکی دوورەنواڕ و بەمشوور کاتێک سووربوون لە سەر پەیمان و بەڵێنێ بە زیانی دەشکێتەوە نابێ ســـوور بێ لە سەر ڕاگرتنی؛ بە تایبەت کاتێک ئەو هۆیانە کە هۆکاری وەها پەیمان و بەڵێنێک بووگن ئێستا ئیتر لە ئارادا نەماون. ئەگەر مرۆڤەکان هەموو چاک بیووان ئەوە ئەم ئامۆژگارییە چاک نەبوو، بەڵام چونکە مرۆڤ شەڕەنگێزە و بەڵێنێک کە بە تۆی داوە بەڕێوەی نابا، ئەتۆش نابێ سوور بی لە سەر گفت و پەیمانێک کە بە ئەوانت داوە؛ هەڵبەت شالیاریش هیچکات بۆ دۆزینەوەی بیانوو بۆ پەیمانشکێنی دانامێنێ. لەم بـــوارەوە دەکرێ نموونەی بێئەژمار بێنیتەوە کە زۆریان بە ســـەردا نەڕۆیشـــتووە و نوێ و سەردەمیانەن و نیشانی بدەین چەنێ پەیمانی ئاشتی و ڕێککەوتن، بە هۆی پەیمانشکێنی و پابەندنەبوونی شـــالیارانەوە هەڵوەشـــاونەتەوە و بێبایەخ کراون. ئەوانە کە سەرکەوتن و دەســـکەوتی زۆرتریان بەدەست هێناوە، ئەوانەن کە چاکتر زانیویانە کەڵک لە سروشتی

---

١. کیرۆنێ، بە ئیتالیایی Chirone، ســێنتاورا Centauro: کیرۆنی ژیر و زانا، کوڕی فیلیریا و یەزدان کرۆنۆوە (کرۆنێ بۆ بەدەســتهێنانی فیلیریا بیچم و شێوەی ئەســـپی گرتبووە خۆی)؛ وەک دەزانرێ لە میتۆلۆژیی یۆناندا سێنتاورەکان دێون: لە باڵ و ســـینەوە بەرەو ژوور مرۆڤن و لەوەو خواریان ئەسپە. کیرۆنێ بە تایبەت پسپۆڕ و زانای بواری دەوا و دەرمان بووە. ـ ئی.ئی.

٢. چ بەردەوام و پایەدار نابێ؟ ئاشـــکرایە مەبەســـت ئەوەیە ئەگەر شـــالیار پەیڕەویی سروشتی ئاژەڵ و مرۆڤ تێکڕا نەکا، دەوڵەت و دەسەڵاتی پایەدار و بەردەوام نابێ.

ڕێوی وەرگرن. بەڵام زۆر پێویستە بزانی باش ئەم سروشتە لە پشت دەمامکەوە بشاریتەوە و دووڕوویەکـی مەزن و لێهاتوو بی. مرۆڤەکان هەر زۆر سـاویلکەن و پەیڕەوی شـتی دەمودەستی و هەنووکەیین، ئەو کەسەی کاری فریودانە هەمیشە کەسانێ پەیدا دەکا کە شوێنی بەڵێنی درۆ دەکەون و ئامادەی فریوخواردنن.

٣ لە نێـو نموونە نوێ و سـەردەمیانەکەدا دەمەوێ ئاوڕ لە یەکێکیـان بدەمەوە، واتە ئەلێکساندری شەشـەم، ئەم هەموو کار و ڕامانی بووە بیرکردنەوە لە فریودانی خەڵک، هەمیشەیش مرۆڤی ئامادە هەبوون فریوی بخۆن و بکەونە داویەوە. تا ئێستا کەس پەیدا نەبووە هێندەی ئەلێکساندری شەشەم زمانی قانعکردنی ئەوەندە بەبڕشت و کارا بووبێ؛ هێندەی ئەمیش پێداگریی لەسەر پەیمان و بەڵێنی کردبێ، بەڵام دواتر گوێی پێ نەدابێ و پەیمان و بەڵێنی دراوی شکاندبێ. سەرەڕای ئەمەش بەردەوام فریودانەکانی دەگەیشتنە ئەنجام و بە مرازی دڵ ئامانجی دەپێکا؛ چونکە زۆر چاک ئەم بەشە لە جیهانی دەناسی.[1]

٤ کەوابوو، پێویست ناکا کە شالیار بێ ئەملاولا دەبێ خاوەن هەموو ئەو تایبەتمەندییانە بێ کە لە سەرەوە ئاماژەیان پێکرا، بەڵام پێویستە و دەبێ وا بنوێنێ هەموویانی هەیە[2]؛ پتر لەمـەش دەڕۆم و دەڵێم کە: ئەگەر هەموویانی هەیە و بەردەوام کەڵکیان لێ وەردەگرێ ئەوە زیانی بـۆی دەبێ، بەڵام ئەگەر وا بنوێنێ کە ئـەو تایبەتمەندییانەی و دەیانزانێ بە قازانجیە. دەبێ وا بنوێنی کە کەسێک جێی متمانە و ڕاگری بەڵێن و پەیمانە، مرۆڤە، پوختە و تەواوە و دیندار و بەئیمانە، بەڵام پێویسـت ناکا بە دڵ و لە ڕاسـتیدا وا بێ: دەبێ بتوانێ و بزانـێ بە پێچەوانەی هەموو ئەوانە بجووڵێتەوە کە دەیانوێنێ. دەبێ چاک سـەرنجی ئەمە بدەین کە شـالیار و بە تایبەت شالیاری نوێ، ناتوانێ پەیڕەوی هەموو ئەو شتانە بێ کە مرۆڤی پێ خۆشـناو دەبێ و بە مرۆڤی چاک دەناسرێ. چونکە بۆ پاراستنی دەوڵەت زۆر جار ناچارە دژی پەیمان و بەڵێن، دژی خێر و چاکە، دژی مرۆڤایەتی و دژی ئایین

---

١. بێ گومان مەبەست گیان و سروشتی بەشەری ئەم دنیاییە.

٢. هەروەها لە دیسـکۆرسەکاندا ١، ٢٥: «چونکە زۆرینەی مرۆڤ بژیو لەوە وەردەگرن کە دەیبینن تا ئەوەی کە لە ڕاستیدا هەیە، یان باشتر بێژین زۆر جار ئەوەی دەنوێنێ زیاتر دەیبزوێنێ تا ئەوەی کە لە ڕاستیدا هەیە».

بجووڵێتەوە.[١] بۆیە شـــالیار دەبێ خاوەن گیان و دڵێک بێت کە بەپێی شـــنەبای بەخت و گۆڕانی ئەو شـــتانە کە ئاقاری بۆ دیاری دەکەن خۆی بگۆڕێ؛ هەروەک بەر لەمە باسم کرد، ئەگەر بکرێ، نابێ لە چاکــە دوور بکەوێتەوە، بەڵام ئەگەر ناچاری پاڵی پێوەبنێ، دەبێ بزانێ کەڵک لە شەڕەنگێزی و خراپی وەرگرێ.

٥ جا بۆیە شالیار دەبێ زۆر زۆر وریا بێ هیچکات شتێکی لە زار دەرنەچێ کە تەژی نەبێ لەو پێنج تایبەتمەندییە کە تاوێ لەمەوبەر باس کران؛ دەبێ کاتێک گوێی بۆ ڕادێرن و لە پێش چاوە، تەواو بە بەزەیی و دلۆڤان، بە بەڵێن و پەیمان، مرۆڤێکی تەواو، کەسێکی بە ئیمان و دیندار بنوێنێ؛ هیچ شـــتێک هێندەی ئەوەی وا بنوێنێ کە کەسێکی دیندارە گرینگ نییە. مرۆڤ بە گشـــتی زۆرتر لەسەر بنەمای ئەوەی کە دەبینێ دادوەری دەکا تا ئەوەی بە ڕاســـت هەســـتی پێدەکا؛ هەمووان دەتوانن ببینن و تەنیا کەمینەیەک دەتوانێ بە ڕاست هەســـتی پێبکا. هەمووان ئەوەی کە شالیار دەنوێنێ دەبینن، بەڵام کەمنیەیەک هەســـت بەوەی کە لە ڕاســـتیدا هەیە دەکەن. ئەو کەمینەیەش ناوێرن دژی ڕاوبۆچوونی زۆرینە بوەستنەوە، ئەویش زۆرینەیەک کە دەوڵەت بە گەورەیی خۆیەوە بەرگرییان لێ دەکا و دەیانپارێزێ. لە کار و هەڵسوکەوتی مرۆڤدا بە گشتی و لە هی شالیاردا بە تایبەتی، لەوێ کە دادگایەک نییە دادی بۆ ببەی خەڵک چاو دەبڕنە ئاکام.

٦ بۆیە شالیار دەبێ کارێک بکا ســـەرکەوتنی خۆی دەستەبەر بکا و دەوڵەتی خۆی بپارێزێ: ئەوسا هەمیشە ئامرازەکانی بە گونجاو و شیاو دەزانرێن و هەموو کەس پەسەندی دەکا و پێیـــدا هەڵدەڵێ؛ چونکە ئاپۆڕەی خەڵک سەرســـامی ڕەوتی ڕووداوەکان و ئەو شتانە کە دەیانبینێ دەبێ و ملیان پێ دەدا[٢]: لە جیهانیشدا ئاپۆڕە زۆرینەیە، لەو جێگایەش

---

١. هەروەها لە دیـــسکۆرسەکاندا ٣، ٤١: «لەوێ کە بڕیار لە سەر مان و نەمانی نیشتمانە، نابێ تێبینیی دروست و نادروست، بەزەیی و دڵڕەقی، سەرشـــۆڕی و سەربەرزی بکرێ، بە پێچەوانەوە، هەموو تێبینییەکانی تر دەبێ هەڵپەسێردرێ و پەیڕەوی بڕیارێ بکرێ کە ژیان و مانی نیشتمان ڕزگار دەکا و ئازاد ژیانی دەپارێزێ».

٢. ئـــەم ڕســـتەیە شـــیکردنەوەی جیا جیا و شرۆڤەی دژ بـــە یەکی بۆ کراوە. کابـــود، Chabod، پێی وایـــە: «ئەم کەمینەیە (ڕەوشتداران بەپێی ئەندێشەی ماکیاڤێلی)، دەتوانن هێز بە دەست بێنن و دڵنیایی دابین بکەن و فەرمانڕەوایی بکەن، کاتێ ئاپـــۆڕە بنەڕەتێکـــی هەیە بۆ ئەوەی کە لێ دڵنیا بێ و لە ئەنجامدا بۆ ئەوەی کە پشـــتیوانیان لێ بکا: ئەوســـا بۆ ئەوانەی کە

که زۆرینه پشـــتیوانه، شوێنێک بۆ کەمینه نامێنێتەوە. یەکێک لە شالیارانی ئەم سەردەمە، کە بە چاکی دەزانم ناوی نەبەم[1]، ســەر و بنی زمانی دووپاتەکردنەوەی ئاشتی و ڕاگرتنی گفــت و پەیمانە، کەچی بە تەواوی دوژمنی هەر دووکیانە؛ چونکە ئەگەر بە هەرکام لەو دوو جمکــە پابەند ببووا ئــەو زۆر جار دەبووە هۆی ئەوەی کــە ناوبانگ و دەوڵەتی لە دەست بچێ.

«دەبینن و هەستی ناکەن» ئەم بنەڕەتە» و «ڕەوتی ڕووداوەکان» بەسە. کەوابوو، یەکێک دەبێ بکۆشێ هەمیشە بگاتە «ئاکام» و ئەنجامی چاک لە کاری خۆی وەرگرێ، ئەوسا، تەنیا ئەوسا دەتوانێ «شوێنی ببێ»». دوتی، Dotti، لە لایەن خۆیەوە پێ وایە: «ئەو کەمینەیەی کە تەنانەت مەبەســتی شاراوە دەبینن، هیچیان لە دەست نایەت («شوێنێ بۆ کەمینە بەدی ناکرێ»)، ئەویش کاتێ زۆرینە، ئەگەرچی کوێریش، شــالیار لایەنگریە». ئینگلێســی تێبینی ئــەوە دەکات کە: «ئەگەر خەڵک لە ناوتوریتەی شالیاردا خاڵێک بدۆزێتەوە بۆ ئەوەی کە پشتی بگرێ، گەورەکان ئیمکانی پێشڕەوی و سەرکەوتنیان نیە». بۆ ئینگلێسی ئەم لێکدانەوە پێوەندە بە «دوکتورینی بەشی نۆوە». ڕایموندی، Raimondi، بە پێچەوانەوە، پێی وایە: «دادوەریی کەمینەیــەک و ڕەنگــەی ئەوانەی تێدەگەن، کاتێک زۆرینەی دەتوانێ لە ســەر «ڕووداو» بنیــاد دانێ، کاریگەری نابێ و گرینگیش نیە ئەگەر «پتر بە چاو دادوەری دەکەن یان بە دەســت»». ئەمن مەیلم بە پەسەندکردنی ئەم دوایین شیکردنەوە هەیە و پێم وایە لەگەڵ دەنگی دلێری ڕستەی: «لە جیهانیشدا ئاپۆڕە زۆرینەیە، لەویش کە زۆرینە پشتیوانە، شوێنێ بۆ کەمینە بەدی ناکرێ» ســازگار و تەبایە. بە بڕوای من ئەوانی تر تێبینی پۆزێتیڤیان هەیە کە لەگەڵ کۆپلەی – ســەرنج بدرێ – کە نموونەی شالیارێکی ڕیاکار و فریودەر نێوئاخنیەتی نامۆیە. هەروەها دەبێ تێبینی ئەوە بکرێ کە ئەگەر پێویست بکا دەبێ سەرجەم ئەم دەقە لەگەڵ *دیسکورسەکان* ٣، ٤٢، وەخوێندرێ، کە بە ئاماژەیەکی ڕوون بەم بەشە کۆتایی دێ. ئـ نی. ف.

١. بە دڵنیاییەوە ئاماژەیە بە فێردیناردی کاتولیک، شای ئیسپانیا. ئـ نی. ف.

## ١٩. چــۆن دەکــرێ خۆ لە کەوتنە بــەر تووک و نەفرەت و ســووک و چرووکبوون بپوێری؟

١ ســەبارەت بــەو تایبەتمەندییانــە کە لەمەوبــەر ئاماژەیــان پێکرا[١] پێشــتر لە هەرە گرینگەکانیان ڕامام و قسەم لەسەر کردن، ئێستا دەمەوێ بە کورتی لە سەر ئەوانی تریش بدوێم. بە مەبەســتی چوونە نێو باسەکەشەوە بە پەیڤی گشتی دەست پێدەکەم و دەڵێم؛ شالیار دەبێ بیر لەوە بکاتەوە خۆی لەو شتانە کە دەبنە هۆی کەوتنە بەر تووک و نەفرەت و سووک و چرووکبوونی بپوێرێ؛ وەک پێشتر بە کورتی ئاماژەم پێی کرد[٢]، هەرجارەش خۆی لەم ڕیسـوایی و بەر نەفــرەت کەوتنە دەبوێرێ، ئەوســا لە کاتی هەڵســوکەوتی ناوزڕێنەر و شکۆشکێنەردا لەگەڵ مەترســی ڕووبەڕوو نابێ. هەروەک وتم، ئەوەی کە زۆرتر دەبێتە هۆی ڕیسوایی و بەر تووک و نەفرەت کەوتنی شالیارێک دەستدرێژیکردنە بۆ سەر ماڵ و دارایی و ژنی ژێردەستەکانی و داگیرکردنیان لە لایەن ئەمەوە؛ دەبێ خۆی لەمانە بپوێرێ. هەرکاتیش دەســتدرێژی نەکرێتە ســەر ماڵ و دارایی زۆرینە و شکۆی نەشــکێندرێ شــاد و ئاســوودە دەژی؛ ئەوســا تەنیا دەبێ بڕواتە شــەڕی فرەخوازی و سەربزێویی کەمینەوە، ئەمەش ئاسانە و بە زۆر شێواز دەکرێ بەرپەرچ بدرێتەوە. سووک

---

١. ئاماژەیە بەوانە کە لە بەشی ١٥ ڕیزی کردن.

٢. بەشی ١٦.١. و بەشی ٣.١٧.

و چرووكبوون دەبێتە هۆی ڕاڕاییبوون و نەسەقامگیریی كەسێتیی شالیار؛ دەیكەن بە كەسێكی كەلـلەڕەق و پێچەقێن، ژنانی، خوێڕی و ترسنۆك دەبێ و ناشیاو لە بڕیاردان و كردنەوەی گرێ و دۆزینەوەی ڕێگاچارە. هەر وەكچۆن گەمیەڤان خۆ لە گابەرد دەبوێرێ، شالیاریش دەبێ خۆی لەم ڕەوشت و ئاكارە دزێوانە ببوێرێ و بیری لە پێناو ئەوەدا وەگەڕ بخات كە لە كار و چالاكی و هەڵسووڕانیدا ژێهاتی، بەڕەوشتی، سەنگینی و كۆڵنەدانی خۆی بنوێنێ و بەم تایبەتمەندییانەوە بناسرێت. سەبارەت بە ئەو بڕیارانە كە پێوەندییان بە كاروباری ژێردەستەكانیەوە هەیە، پێویستە شالیار بە جۆرێك هەڵسوكەوت بكا كە قسە لە سەر قسەی نەكرێ و بڕیارەكانی گەڕانەوەیان بۆ نەبێ؛ دەبێ بیر و بڕوایەك لە خۆی بدا بەدەستەوە كەس بیر لە فریودان و بەلاڕێدابردنی نەكاتەوە.

٢ ئەو شالیارە كە ئەم جۆرە بیر و باوڕە سەبارەت بە خۆی بڵاو دەكاتەوە و ئاوا ناو دەردەكا، دەبێتە خاوەن ناوبانگی زۆر، ئەو كەسەش كە بووە خاوەن وەها ناوبانگێك، پیلانگێڕی بە دژی و پەلاماردانی فرە دژوارە؛ چونكە دیارە كەسێكی هێژا و جێی ڕێز و ستایشی ژێردەستەكانی خۆیەتی. شالیار دەبێ هەردەم ترسی لە دوو شت هەبێ: یەكێك ناوەكی و لە لایەن ژێردەستەكانیەوە، ئەوەی تر دەرەكی و لە لایەن هێزی دەرەكییەوە. بۆ بەرگری لە هێزی دەرەكی پێویستی بە سپای چاك و دۆست و هاوپەیمانی چاك و قورس ڕاوەستاو هەیە؛ ئارامی و سەقامگیریی ناوەكییش لە گرەو ئارامی و سەقامگیریی دەرەكیدایە؛ هەڵبەت ئەگەر پیلانگێڕی نەبێتە هۆی هەڵخڕان و ئاژاوەنانەوە.[1] هەروەتر لە ئەگەری جموجۆڵ و پەلاماری دەرەكیدا، هەروەك لە بارەی نابیدێ سپارتییەوە باسم كرد[2]، ئەگەر شالیار بەم جۆرەی باسم كرد ژیابێ و ساز و تەیار بێ، ئەگەر هیوابڕاو نەبێ و دەست لە خۆی بەرنەدا، دەتوانێ بەرەنگاری بكا و بەرگەی هەموو تەوژمێك بگرێ.

٣ بەڵام سەبارەت بە ژێردەستەكان، لە كاتێكدا جموجۆڵی دەرەكی لە ئارادا نییە، دەبێ

---

١. سەبارەت بە پیلانگێڕی، بڕوانە *دیسكۆرسەكان* ٣، ٦.

٢. بڕوانە بەشی ٩.

له پیلانگێڕیی نهێنی بترسـی و وشیاریان بێ. چارەی ئەمەش ئەوەیە کە شالیار خۆی لە کەوتنە بەر تووک و نەفرەتی ژێردەسـتەکانی ببوێرێ و کارێک بکا گەل لێی ڕازی بێ؛ وەک پێشتریش باسم کرد، پێویستە بەردەوام و پێداگرانە لە هەوڵی ڕێزگرتن لە زۆرینەوە و ڕاگرتنـی دڵیدا بێ. یەکێک لە بەهێزترین ڕێگاچارەکان بۆ پێشـگرتن لە پیلانگێڕی، کە شـالیار دەتوانێ پشتی پێ ببەستێ، ئەوەیە کە نەکەوێتە بەر تووک و نەفرەتی گشتی؛ چونکە ئەو کەسە کە دەست ئەداتە پیلانگێڕی لەو بڕوایەدایە مەرگی شالیار دەبێتە هۆی وەدیهاتنی ئاواتی گشـتی و هۆی ڕازیبوونی گەل. بـەڵام کاتێک تێدەگات تەنیا زیانی پێدەگەیەنێ،ناوێرێ توخنی وەها کەینوبەینێک بکەوێ؛چونکە ئەو گرفتانە کە پیلانگێڕان لەگەڵیان ڕووبەڕوو دەبنەوە بێنەژمارن. بە ئاوڕدانەوە لە ئەزموونەکانیش، دەبینین گەلێک پیلانگێڕی کراوە، بەڵام کەمیان مەبەستیان پێکاوە و ئاکامی چاکی لێ کەوتۆتەوە. چونکە کەس بە تاق و تەنیا ناتوانێ دەست بداتە پیلانگێڕی، وەکوو هاودەستی پیلانیش، بێجگە لەو کەسانە کە لایان وایە ناڕازی و ڕەنجاون، ناتوانێ کەس بە دۆست و هاوڕێ بگرێ و لەگەڵیان ڕێککەوێ. ئەتۆش کاتێک بە وشیاریی خۆتەوە لە ناڕەزایەتی و دڵ ئێشاویی کەسێک ئاگادار دەبیەوە، هەل و دەرفەت بۆ ڕازیکردنی دەڕەخسێنی، ئەوکات ئەویش دەزانێ ئەگەر ئاماژە بە بوونی پیلان بکات و ئاشکرای بکا سەرپشک دەکرێ و قازانجی دەسـت دەکەوێ. بەم جۆرە کاتێک دەبینێت قازانجی لە لایەن تۆوە دەسـتەبەرە و لێی دڵنیایە، بەڵام کە دەنواڕێ بۆ ئەو لایەن و دەبینێ هەموو شـتێ بە گومانەوە بەندە و گەلێ مەترسی لە سەر ڕێگەیدایە، وا بە چاک دەزانێ لە نێوان ئەو کەسەی کە جاروبار دۆست و ئاواڵە و ئەو کەسـەی دوژمنی بەردەوام و سـوێندخواردووی شـالیارە، پشـتی شالیار بگرێ و ئەمەگی بۆ ئەنوێنێ. بە کورتی بۆ ئەوەی پوختەی شتەکان لە چەند وشەدا باس بکەم، دەبێژم کە لە لایەن پێلانگێڕانەوە تەنیا ترس و دڵەڕاوکێ و گومان و ترس لە سـزا و ئەشـکەنجە چاوەڕێ دەکا و دەبێتە هۆی تۆقاندنی، بەڵام لە لایەن شالیارەوە گەورەیی دەوڵەت هەیە، یاسـا و دەستوور هەیە، بەرگری لە دۆسـت و ئاواڵان هەیە: دەوڵەتێک

هەیــە کە بەرگریی لێ دەکا و دەیپارێزێ. هەر بۆیە ئەگەر جێگە و پێگەی کۆمەڵایەتی و خۆشــناوی بخرێتە سەر ئەم شــتانە، ئیمکانی ئەوە نییە کەسێک بدۆزرێتەوە ئەوەندە چاونەترس و بێباک بێ کە دەست بداتە پیلانگێڕی و پلانی ڕووخانت دارێژێ؛ چونکە لە بارودۆخی ئاساییدا، پیلانگێڕ بەر لە ئەنجامدان و جێبەجێکردنی نیەتی پیلانی پیسی، ترســی لە زۆر شت هەیە. هەروەتر کاتێک شالیار خاوەن جێگە و پێگەی جەماوەری و خۆشەویستی گەل بێ، تەنانەت پاش پیلانیش، پیلانگێڕ ناتوانێ دڵ بە گەل خۆش بکا و بە دالدەدەری خۆی بزانێ.

٤ لەم بوارەوە دەکرێ نموونەی بێئەژمار بهێنینەوە، بەڵام من تەنیا ئاماژە بە نموونەیەک دەکەم کە لە ڕۆژگاری باوکانی خۆماندا ڕووی داوە و بیرەوەرییەکانی هێمان لە بیرەگەی ئەواندا زیندووە. مێسێر ئانیبال بێتیڤولی[1] شالیاری بلۆنیا، باوای ئەم مێسێر ئانیبالەی ئێستا، کاتێک بە دەستی پیلانگێڕانی کانێسکی کوژرا، تەنیا مێسێر جوڤانی لێ بە جێ مابوو، ئەمیش زۆر منداڵ بوو. بەڵام دوای سەرکەوتنی پیلانگێڕان، فرەی پێ نەچوو خەڵک لە کانێسکییەکان ڕاپەڕین و نەیانهێشتبوو کەسیان دەرباز بێ و گشتیانیان قەڵاچۆ کردبوو. دیارە کە هۆی ڕاپەڕینی گەل خۆشەویســتی و پێگەی قایمــی کۆمەڵایەتیی بنەماڵەی بێنتیڤۆلی لە بلۆنیای ئەو ســەردەمەدا بوو. ئەم پشــتیوانییە کۆمەڵایەتییە لە ئاستێکدا بوو کــە خەڵکی ئەو مەڵبەندە دوای مەرگی ئانیباڵ کەســیان لە بلۆنیا بەدی نەکردبوو کە بە شــیاوی ئەوەی بزانن کورسیی دەســەڵاتی پێ بســپێرن. لە ئاکامدا بلۆنییەکان هەواڵی ئەوەیان زانیبوو لە فیرێنزێ کوڕی کابرایەکی ئاسنگەر هەیە و لە تۆرەمەی بێتیڤولییەکانە؛ ڕۆیشــتبوون هێنابوویان و کردبوویانە دەســەڵاتداری خۆیان و دەســەڵاتی شاریان پێ ســپاردبوو، ئەویش تا کاتێک مێسێر جوڤانی گەیشــتە تەمەنی گونجاوی دەوڵەتداری حوکمی ئەو شارەی وەستۆ گرتبوو.

٥ لە کۆتاییدا دەڵێم: کاتێک شــالیار خــاوەن پێگەی قایم و پتــەوی جەماوەرییە و

1. Messere Annibale Bentivogli

خەڵک دەیانەوێ، نابێ هێندە ترسی لە پیلانگێڕی ببێ، بەڵام کاتێک بێزراوی گەلە و کەوتۆتە بەر تووک و نەفرەتی گەل، دەبێ لە هەموو شت و هەموو کەسێک بترسێ. شالیارانی ژیر و زانا لە دەوڵەتی چاک سەروسامان پێدراو و قورس و قایم ڕێکخراودا، باش بیر لەوە دەکەنەوە کە ئاغاکان هیوابڕاو نەکەن و گەلیش ڕازی ڕابگرن؛ چونکە ئەمە یەکێک لە گرینگترین ئەرکەکانی شالیار پێکدێنێ.

٦ لە ڕۆژگاری خۆماندا، لە نێو ئەو پادشاییانە کە چاک سەر و ساماندراو، دامەزراون و چاک فەرمانڕەوایی دەکرێن پادشایی فەڕانسەیە، لەو پادشاییەدا دەزگا و دامەزراوەی زۆر هەن کە ئازادی و ئاسایشی شا بەمانەوە بەندە؛ یەکەم دامەزراوە پەرلەمان و ئاوتوریتەکەی، دەسەڵاتەکەیە. ئەو کەسە کە پادشایی فەڕانسەی دامەزراندووە چاک ئاگاداری فرەخوازی و هوگری بە ملهوڕیی دەسەڵاتداران بووە، بۆیە وای بە باش زانیوە بۆ ڕاگرتن لەسەر ڕێگە و ڕاستکردنەوەی چەوتی و هەڵەکانی جڵەوێکی بۆ دابنێ. لە لایەکی دیکەشەوە، نەفرەت و قینی گشتی دژی ئاغاکانی ناسیوە کە بناخەی لە سەر ترس و تۆقان دانراوە، بۆیە ویستوویە لێیان دڵنیا ببێ؛ جا چونکە نەیویستووە ئەم بەرپرسایەتی و ئەرکە تایبەتە لە ئەستۆی پادشا بێ، دەسەڵاتی ئەوەی لێسەندۆتەوە کە بە پشتیوانی و چاکەکردن دەرهەق گشتی ڕق و قینی ئاغاکان هەڵخڕێنێ، یان بە پێچەوانە بە چاکەکردن دەرهەق ئاغاکان ڕەق و قین و نەفرەتی گشتی هەڵگرسێنێ. هەر بۆیە لایەنی سێهەمی وەکوو دادوەری سەربەخۆ دامەزراندووە بۆ ئەوەی کە بەرپرسایەتیی سزادانی ئاغاکان و داڵدەدان بێ خەڵک وەستۆ بگرێ. سەندنەوەی ئەم بەرپرسایەتی و دەسەڵاتە لە پادشا بۆ دابینکردن و دەستەبەرکردنی ئاسایشی شا و پادشایی و دانانی پەرلەمان، وەکوو باڵاترین دەسەڵات، چاکترین دامەزراوەیە کە بە وریایی و دوورەنواڕیی تەواوەوە دامەزراوە. بۆیە هەر بەم هۆیەوە دەکرێ بە ئاکامێکی زەقتر بگەین؛ ئەویش ئەوەیە کە شالیار دەبێ بڕیاردان لەسەر ئەو شتانە کە دەبنە هۆی هەڵخڕاندنی ڕق و نەفرەت بخاتە ئەستۆی ئەوانی تر و خۆی ئەو بڕیارانە لە ئەستۆ بگرێ کە هێمای دلۆڤانین و دەبنە هۆی دڵخۆشی

و ڕازیبوونی گشتی. دیسانەوە لە کۆتاییدا دەڵێم کە: پێوستە شالیار دڵی ئاغاکان ڕابگرێ و لــە خۆی نەیانڕەنجێنێ، بەڵام نابێ کارێک بکا بەر تــووک و نەفرەتی گەل بکەوێ و بێزراوی گەل بێ.

٧ ڕەنگە بە لێکدانەوە و ئاوڕدانــەوە لە ژیان و مەرگی هێندێک ئیمپراتۆری ڕۆمی و سەرنجدان بەوەی کە هێندێک لەوان سەرەڕای ئەوەی کە زۆر بە هێژایی، ڕێز و قەدرەوە ژیاون، کەچی ســەرباری ئەمەش دەوڵەت و دەســەڵاتیان لە دەست چووە؛ یان دەست و پێوەند و کەســانی دەوروپشــتیان پیلانیان بــە دژ گێڕاون و گیانیان لێ ئەســتاندوون. ئەگەر کەســانێک بیانەوێ لەم بوارەوە بەرپەرچی بۆچوونەکانــی من بدەنەوە؛ ئەزیش بۆ بەرســڤدانەوەی تێبینی و ڕەخنانەکانی ئەوان ئاوڕ لە ژیان و بەسەرهاتی هێندێک لە ئیمپراتۆرانی ڕۆمی ئەدەمەوە و بە تاوتوێکردنیان دەیســەلمێنم کە هۆکاری تێشــکانی ئــەوان لەگەڵ ئەوەی من -بەر لەمــە وەک نموونە هێنامنەوە و ڕاڤــەم کردن- ناکۆکی و جیاوازییــان نییە. مــن لێرەدا ئەو کار و چالاکییانە ڕاڤە دەکــەم کە هەر کەس مێژوو و ڕووداوەکانــی ئەو ســەردەمانە بخوێنێتەوە بە چاکــی ئاگاداریانە و دەیانناســێ. بۆ ئەم باسەشــم دەمەوێ لە مارکۆ ئاوریلی فیلۆســۆفەوە تاکوو ماسیمینۆ، کە لە سەر کورسیی ئیمپراتۆری دانیشــتووە تاوتوێ بکەم؛ ناوی ئەوانە کە ئاوڕ لە بەسەرهاتیان دەدەمەوە بەم شــێوەیەیە: مارکۆ ئاوریل، کۆمۆدۆ کوڕی مارکۆ، پێرتیناس، جوولیانۆ، سێڤێرۆ، ئانتۆنیۆ کارانکالا و کوڕەکەی، ماکرینۆ، ئلاگابالۆ، ئالێکســاندر و ماســیمینۆ.[1] یەکەم شــت کە پێویستە سەرنج بدرێ ئەمەیە؛ لە کاتێکدا لە پادشایی و شانیشینەکانی دیکەدا تەنیا دەبوو بەرپەرچــی فرەخوازی و ســەربزیویی ئاغاکان و ڕاپەڕین و خرۆشــانی گەل بدرێتەوە،

---

١. مارکــۆ ئاوریل ئانتۆنیــۆ، Marco Aurelio Antonio، (١٦٢-١٨٠ د.ز.)؛ کۆمۆدۆ ئانتۆنیــۆ، Commodo Antonio، (١٨٠-١٩٢)؛ پووبلیــۆ ئێلڤیــۆ پێرتینــاس، Publio Elvio Pertinace، (ژانویە تا مارســی ١٩٣)؛ مارکــۆ دیدیۆ جوولیانۆ، Marco Didio Giuliano، (مارس تا ژوئنی ١٩٣)؛ سیتیمیۆ سێڤێرۆ، Settimio Severo، (١٩٣-٢١١)؛ ئانتۆنیۆ کاراکالا، Antonzo Caracalla، (٢١١-٢١٧)؛ ئۆپیلیۆ ماکرینــۆ، Opilio Macrino، (٢١٧-٢١٨)؛ ئلاگابالۆ، Elagabalo، (٢١٨-٢٢٢)؛ سێڤێرۆ ئالێکساندر، Severo Alessanrdo، (٢٢٢-٢٣٥)؛ ماسیمینۆ تراچێ، Massimino il Trace، (٢٣٥-٢٣٨). ئـ نی. نی.

ئیمپراتۆرانی ڕۆما کێشەی سێهەمیشان هەبوو، ئەوەیش ئەوەیە کە دەبووا لە هەمبەر دڕی و دڵڕەقی و چاوچنۆکیی سەربازانی سپاوە بەرگری لە خۆیان بکەن. ئەمەش کارێکی ئەستەم و هۆکاری شکان و ڕووخانی زۆرێک لەوان بوو؛ چونکە قانع ڕاگرتنی هاوکاتی سەربازانی سپا و گەل کارێکی ئەستەم بوو؛ چونکە گەل لایەنگری ئارامی بوو، بۆیە شالیارانی ئاشتیخوازی لا بەڕێز و جێی پەسەند بوو، بەڵام سەربازان و سپا شالیارانی شەڕانی و داپڵۆسێنەر و دڕ و دڵڕەق و داگیرکەریان بە باش دەزانی و خۆشیان ئەویستن. سپا خوازیاری ئەوە بوو شالیار لەگەڵ خەڵکدا نەرم و نیانی نەنوێنی و دڵڕەقانە لەگەڵی بجووڵێتەوە و ڕەحم بە ماڵ و دارایی کەس نەکا؛ بۆ ئەوەی کە ئەمان مووچەی دوو قاتیان دەست کەوێ و دڵڕەقی و چاوچنۆکیی خۆیان بەتاڵ بکەنەوە و بە شەڕەخۆری، باشار نەهاتوویی و فرەخوازیی خۆیان تێر بکەن. ئەم شتانە وایان کردبوو ئەو ئیمپراتۆرانە کە بە هۆی سروشت یان هونەر و لێزانییەوە خاوەن ناوبانگێکی ئەوتۆ نەبوون کە بتوانن و پێیان بکرێ لەو ڕێگەیەوە سپا و گەل ڕابگرن و ملکەچی خۆیانیان بکەن، هەمیشە بەشیان تێکشکان و تێداچوون بوو. بۆیە زۆرێک لەوان، بە تایبەتی ئەوانەیان کە لە شارۆمەندی ئاساییەوە بە دەسەڵات دەگەیشتن، وێڕای زانیاری و ناسینی دژوارەییەکانی کۆککردن و ئاشتدانەوەی ئەم دوو مەیل و مەزاجە جیاوازە، هەوڵیان دەدا سپا ڕازی ڕابگرن و بایەخی زۆریان بە هەڵگەڕانەوەی گەل و خرۆشانی جەماوەری نەئەدا. ئەم جۆرە بڕیارانە بۆ ئەوان پێویست بوون؛ چونکە دەبێ و پێویستە شالیاران خۆیان لە تووک و نەفرەتی توێژە کومەڵایەتییەکان ببوێرن. بۆیە دەبێ هەموو هەوڵی خۆیان بخەنە گەڕ بۆ ئەوەی بەر تووک و نەفرەتی گشتی و زۆرینە نەکەون. بەڵام کاتێک ئەمەیان پێ جێبەجێ ناکرێ، بە هەموو شێوەیەک دەبێ خۆیان لە تووک و نەفرەت و کینەی ئەو زۆرینەیە ببوێرن کە بەهێزترە. هەر بۆیە ئەو ئیمپراتۆرانە کە بە هۆی تازە بە دەسەڵات گەیشتنیانەوە پێویستیان بە هێزی تایبەتی هەبوو، لە جیاتی نزیک کەوتنەوە لە گەل و ئاوڕدانەوە لە خەڵک، دەخزانە پاڵ سپاوە. هەڵبەت ئاخۆ هەر ئەمەش بە قازانجی ئەوان بوو یان نا، پێوەندیی

بە ئەوەوە هەبوو کە داخۆ ئیمپراتۆر دەیتوانی سـپا ملکەچی خۆی بکا و کارێ بکا ببێتە جێی ڕێز و ستایشی.

٨ هەر بەو هۆیانە کە لە سەرەوە باس کران، وا بووە کە مارکۆ، پێرتیناس و ئەلێکساندر و هەموو ئەوانە کە بە خاکەساری ژیان و ئەڤینداری داد و مرۆڤ و خێرخوازی، نەیاری ملهوڕی و دڵڕەقی بوون، هەر هەموویان کۆتاییەکی ناخۆش و پڕ لە خەم و کەسـەریان هەبوو. لە نێو ئەمانەدا تەنیا ژیانی مارکۆ پڕ لە شانازی بوو و شکۆدارانەش مرد. ئەوەیش بۆ ئەوەی کە تاج و تەختی ئیمپراتۆریی بە میرات پێگەیشتبوو و خۆی بە قەرزداری سپا و گەل نەدەزانی؛ هەروەتر ئەو خاوەن گەلێک هەڤیازی و ژێهاتیی تر بوو، کە کردبوویانە جێی پەسـەند و ستایشـی هەمووان و لە ماوەی ژیانیدا زۆر چاک توانیبووی هەر دوو لایەن بە ڕێکوپێکی و سـامان پێدراوی بپارێزێ و لە چوارچێوەی سنووری دەسەڵاتی خۆیدا هەرگیز بەر تووک و نەفرەت نەکەوت و سـووک و ڕیسوا نەبوو. بەڵام پێرتیناس بە پێچەوانەی خواستی سپا ئیمپراتۆریی خۆی دامەزراندبوو[١]، -ئەو سەربازانە کە لە ژێر فەرمانی کۆمۆدۆدا خوویان بە بێسەروبەری و شڕەخۆری گرتبوو و ئامادە نەبوون ئەو ژیانە خاکەسارانە قبووڵ بکەن کە پێرتیناس دەیویست بە سەریانیدا بسەپێنێ- بۆیە ڕق و کینە و نەفرەت لە پێرتیناس گەشەی کرد و بە هۆی بەساڵاچوویییەوە سپا سووک و ڕیسوای کرد و هەر لە بەرەبەیانی بە دەسـەڵات گەیشتن و لە یەکەم ڕۆژانی دەسەڵاتدارییەوە تووشی تێکشـکان و ڕووخان بوو. لێرەدا دەبێ سەرنجی ئەوەش بدەین کە هۆکاری کەوتنە بەر تووک و نەفرەتی پێرتیناس چاکەکردن و خێر بووە، ڕێک چەشـنی شەڕ و خراپەکردن. هەڵبەت هەروەک بەر لەمە گوتم، ئەگەر شـالیارێک بیهەوێ دەوڵەتی خۆی بپارێزێ، زۆر جار ناچارە چاک نەبێ. چونکە کاتێک زۆرینە، جا گەل بێ یان سـپا یان ئاغاکان، ئەگـەر گەندەڵن و تۆ لات وایە بۆ پاراسـتنی دەوڵەتی خۆت پێویسـتن و بەرژەوەندی دەخوازێ تێریان بکەی و ڕازی ڕایانبگری، ئەوسـا ئەنجامدانی کار و کرداری چاک و

١. لە ڕاستیدا لە لایەن سێناتووە هەڵبژێرابوو. ئـ نی. ف.

چاکەکردن بە زیانی تۆ دەشکێتەوە، دەبێتە دوژمنی سەر و هۆی تێداچوونت.

٩ ئێستا با بێینە سەر ئەلێکساندەر، ئەو کەسەی کە زۆر زۆر باسی چاکەی کراوە و پێیدا هەڵگوتراوە، زەقتر لە هەموو ئەو ئاکار و ڕەوشتە چاکانەی وەپاڵی دراوە، دەکرێ باسی ئەوە بکەین لە ماوەی ئەو چواردە ساڵەی ئەلێکساندەر لە سەر کورسیی ئیمپراتۆری بووە، تەنیا یەک کەس بەبێ دادگایی و لێپرسینەوە نەکوژرابوو، بەڵام سەرەڕای ئەمە ڕاوبۆچوونەکان دەربارەی ئەو چاک نەبوون و وەکوو کەسێکی ژن سفەت و لاواز سەیر دەکرا؛ پیاوێک کە ئیجازەی دابوو دایکی فەمانڕەوایی بکا و بڕیارەکانی بۆ بدا. هەر بەم بۆنەوە سووک و ڕیسوا بوو و لە ئاکامدا سپاکەی لە پیلانێکدا کوشتیان.

١٠ ئێستا ئاوڕ لە لایەنی بەرانبەر دەدەینەوە و دەپەرژێینە سەر تایبەتمەندییەکانی کۆمۆدۆ، سێڤێرۆ، ئانتۆنیۆ کاراکاڵا و ماسیمینۆ؛ دەبینین ئەمانە هەر زۆر زۆر دڕ، دڵڕەق، ملهوڕ و داگیرکەر و هەڵۆی چنگ بە خوێن بووگن. ئەمانە بۆ ڕازیکردن و ڕاگرتنی دڵی سپا سڵیان لە هیچ دڕندەیی، دڵڕەقی و بەدفەڕییەک بۆ ڕاوڕووتکردن و چەوساندنەوەی گەل نەئەکرد، کەچی بێجگە لە سێڤێرۆ، هەموویان کۆتاییەکی ناخۆش و پڕ کەسەریان هەبوو و ئاخرشەڕ بوون. ئەویش لە بەر ئەوەی کە سێڤێرۆ خاوەن گەلێک ڕەوشت و ژێهاتیی تر بوو و بەر لەوەی گەل لە دەست بێدادی و چەوسانەوە وەزاڵە بێ، توانیبووی سپا بکاتە دۆستی خۆی و وەفادار بە خۆی ڕایگرێ؛ ئەو بەم جۆرە توانی بە شادییەوە فەرمانڕەوایی بکا. هۆکارەکەش ئەمە بوو کە ژێهاتی و هەڤیازیی سێڤێرۆ، ئەمیان کردبووە جێی ڕێز و ستایشی تێکڕای سپا و گەل؛ بە لێهاتوویی و لێزانیی خۆی سپا و گەلی سەرسام کردبوو و هەموانی ڕازی و دڵخۆش ڕاگرتبوو. جا بۆ ئەوەی کار و چالاکییەکانی سێڤێرۆ، وەکوو شالیارێکی نوێ بە دەسەڵات گەیشتوو، گەلێک مەزن و دیار بووگن، من لێرەدا بە پوختەیی دەمەوێ نیشانی بدەم کە چۆن زانیبووی چاک کەڵک لە کەسێتی و سروشتی شێر و ڕێوی وەرگرێ، کە بەر لەمە ئاماژەم پێکرد و گوتم شالیار ناچارە و دەبێ لاساییان بکاتەوە.

١١ سێڤێرۆ بە ئاگاداربوون لە بێئیرادەیی و خوێڕیەتیی ئیمپراتۆر جوولیانۆ، سپای ژێر فەرمانی خۆی لە سلاڤۆنیا قانیع کردبوو کە بەرژەوەندی لەوەدایە بڕوا بۆ ڕۆما و تۆڵەی ئیمپراتۆر پێرتیناس -کە بە دەست سەربازانی پارێزگاری کوژرابوو- بستێنێتەوە. ئەو بەم بیانووە بێ ئەوەی کە ئاواتی بۆ چوونە سەر کورسیی ئیمپراتۆری دەربخا، سپای دژی ڕۆما جووڵاندبوو و تا نەگەیشتبووە ئیتالیا، کەس ئاگاداری وەڕێکەوتن و هاتنی نەبوو؛ کە گەیشتبووە ڕۆما، سێناتۆ تۆقاو و ترساو، سێڤێرۆی وەکوو ئیمپراتۆر هەڵبژاردبوو و بڕیاری مەرگی جوولیانوی دابوو. پاش ئەم ئەنجامە سەرەتاییە، دوو بەرهەڵستکار لە سەر ڕێگەی سێڤێرۆدا مابوون؛ یەکیان لە ئاسیا بوو؛ لەوێ کە نیگرۆ[1] سەرکردەی لەشکرەکانی ئاسیا خۆی وەک ئیمپراتۆر ڕاگەیاندبوو؛ ئەوی تر لە پۆنێنتێدا بوو؛ ئالبینۆ[2] لەوێوە چاوی بڕیبووە کورسیی ئیمپراتۆری. سێڤێرۆ، کە زانیبووی پەلاماردانی هاوکاتی هەر دوو لا پڕمەترسییە، بڕیاری دابوو پەلاماری نێگرۆ بدا و ئالبینۆ فریو بدا. نامەیەکی بۆ ئالبینۆ ناردبوو و بۆی نووسیبوو: چونکە سێناتۆ ئەمی وەک ئیمپراتۆر هەڵبژاردووە، ئەمیش گەرەکیە ئەو لەم شانازییەدا بەشی هەبێ و سەرناوی قەیسەری بۆ ناردبوو و بە بڕیاری سێناتۆ کردبوویە شەریک بەشی دەسەڵات و ئیمپراتۆریی لەگەڵ بەش کردبوو. ئالبینۆیش ئەم شتانەی بە ڕاست زانیبوو و قبووڵی کردبوو. بەڵام سێڤێرۆ دوای ئەوەی لە شەڕ لەگەڵ نێگرۆ سەرکەوتنی بە دەست هێنابوو و نێگرۆی کوشتبوو و کۆتایی بە ئاژاوە و پشێویی رۆژهەڵات هێنابوو و ئارامیی لەو مەلبەندە سەقامگیر کردبوو، گەڕابۆوە ڕۆما و لە لای سێناتۆ سکاڵای دژی ئالبینۆ بەرز کردبۆوە. باسی ئەوەی کردبوو کە چۆن ئالبینۆ ناسپاسی کردووە و سەرەڕای ئەو چاکانە کە دەرهەقی کراوە، بێبەزەییانە هەوڵی کوشتنی داوە؛ هەر بۆیە پێویستە بڕۆینە سەری و بە هۆی ناسپاسییەوە تەمبێی

١. گایۆ پێشنیۆ نیگرۆ، Gaio Pescennio Nigro، سەرکردەی سپای ڕۆما لە سووریا. نێگرۆ پاش شکان لە بەر گورزی سپای سێڤێرۆدا لە ساڵی ١٩٤ د.ز. کوژراوە.

٢. دێچیمۆ کلۆدیۆ ئالبینۆ، Decimo Clodio Albino، مەکۆی لە بریتانیا، Britannia، [باشووری فەڕانسە]بووە. سێڤێرۆ لە سەرەتاوە بانگهێشتی کردووە بۆ بەشداربوون لە دەسەڵاتدا و ئیمپراتۆریی لەگەڵ دابەش کردووە، پاشان هەر بە دەستی سێڤێرۆ شکا و لە نۆزدەی فێبرای (١٩٧ د.ز.) لە لیۆن کوژراوە.

بکەین. پاشـان ڕۆیشتبوو لە فەڕانسە گیری هێنابوو و دەوڵەت، دەسەڵات و ژیانیشی لێ سـەندبۆوە. ئەو کەسە کە بە وردی سـەرنجی کار و چالاکییەکانی سێڤێرۆ بدا و لێکیان بداتەوە تێدەگا شێرێکی دڕندە و ڕێوییەکی فرە فێڵەزان و زیرەک بووە. هەروەها تێدەگا هەموو لایەک لێی ترساون و ڕێزیان گرتووە؛ بەمانەشەوە نەکەوتۆتە بەر تووک و نەفرەتی سـپا. پتر لەمەش، ئەوەی کە ئەم، وەکوو شـالیارێکی تازە بە دەسەڵات گەیشتوو، چۆن توانیبووی بۆ ماوەیەکی زۆر دەوڵەت و دەسەڵاتی خۆی ڕابگرێ، تووشی سەرسووڕمانی ناکا؛ هۆکارەکەش ئەوە بووە کە سـێڤێرۆ ناوبانگی زۆری دەرکردبوو، هەر ئەمەش وای کردبوو نەکەوێتە بەر تووک و نەفرەت؛ هەروەها هەر ئەمەش وای کردبوو خەڵک خۆ لە داگیرکاری و دەستدرێژییەکانی نەبان بکا.

١٢ بـەڵام ئانتۆنیۆی کوڕی، خـاوەن تایبەتمەندی و ژێهاتوویی زۆرتـر بوو، هەر ئەو تایبەتمەندییانەش ئەمیان کردبووە جێی ستایش و پەسندی گەلان و ڕێزی سپا؛ چونکە پیاوێکی سـەربازی بـوو، هەر بەم بۆنەشـەوە لە هەمبەر هەموو ڕەنج و سـەختییەکەوە خۆڕاگریی دەکرد و گاڵتەی بە خواردنی شـاهانە و هەموو چەشـنە خـۆش ڕابواردن و خۆشـگوزەرانییەک دەکرد؛ هەر ئەمانەش ئەمیان کردبوو بە خۆشەویستی سپا. بەڵام بە هۆی ئـەوەی کە لە چەند بۆنەی تایبەتدا، زۆرینەی خەڵکی ڕۆما و ئەسـکەندەرییەی ڕەشەکوژ کردبوو و دڕندەیی و دڵڕەقییەکی بێ وێنەی لە خۆ نواندبوو، کەوتبووە بەر تووک و نەفرەتی گشـتی؛ تا ڕادەیەک کە دەست و پێوەندەکانی لێی دەترسان و لێی تۆقابوون. لە ئاکامدا کاتێک لە نێو چەقی سـپاکەیدا ببوو بە دسـت یەکێک لە فەرماندەکانی سپا کوژرابوو. بە سەرنجدانی ئەم حاڵەتە، دەبێ بزانین کە هۆی ئەم جۆرە مردنانە دڵی پڕ لە قین و کینەیە و شالیار ناتوانێ خۆی لێیان ببوێرێ؛ چونکە ئەو کەسەی گیانبازی دەکا، باکی لە مردن نییە و ئەتوانێ دەسـتی خۆی بوەشێنێ و زیانی خۆی بگەیەنێ. هەڵبەت شالیار نابێ زۆر لەمە بترسـێ، چونکە ئەم حاڵەتانە بە دگمـەن ڕوو ئەدەن. بەڵام دەبێ ئاگاردار بێ سـووکایەتیی گەورە بەو کەسـانە نەکا کە لە خزمەتیدان و بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری

پادشایی لە دەوری خۆی کۆی کردوونەتەوە؛ وەک ئەوەی کە ئانتۆنیۆ کردبووی. ئانتۆنیۆ بە شێوەیەکی زۆر دڵڕەقانە شان و شکۆی برای ئەو سەرگوردەی شکاندبوو و پاشان کوشتبووی. کەچی سەرەڕای ئەمەش سەرگوردی کردبووە زێڕەڤانی جەستەی خۆی و هەموو ڕۆژێک هەڕەشە و گوڕەشەی لێ کردبوو و بە هاودەستی براکەی تاوانباری کردبوو؛ ئەمەش بڕیار و یارییەکی بیرلێنەکراوە و لێکنەدراوە بوو، کە لە ئاکامدا بووە هۆی تێداچوونی.

١٣ ئێستا با بێینە سەر کۆمۆدۆ. کۆمۆدۆ کوڕی مارکۆ بوو؛ چونکە کورسیی ئیمپراتۆریی بە میرات پێگەیشتبوو، هەر ئەوەندە بەس بوو ڕێچکەی باوکی بەرنەدا و لە سەری بڕوا. هەر ئەمەش دەبووە هۆی ڕازی ڕاگرتنی سپا و گەل و بە ئاسانی دەیتوانی بەردەوام بێ لە دەسەڵات و حکومڕانیکردن. بەڵام چونکە دڕندەخوو و وەحشی بوو، بۆ ئەوەی کە بتوانێ دەست بداتە تاڵان و دەستدرێژیکردنە سەر ماڵ و دارایی خەڵک، لەگەڵ سپا پێکهاتبوو و بواری بۆ هەموو سەرەڕۆیی و بێسەروبەرەییەک ڕەخساندبوو. لە لایەکی ترەوە ئاگاداری شان و شەوکەتی خۆی نەبوو و تاو نا تاوێ دڕۆیشتە مەیدانی زۆرانبازی لەگەڵ گلادیاتۆران. هەروەها گەلێک ئاکار و ڕەوشتی قێزەونی تری هەبوو کە شیاوی پایە و شان و شکۆی ئیمپراتۆر نەبوون؛ ئەمانە ئەویان لە پێش چاوی سپای سووک و بێبایەخ کردبوو؛ لە ئاکامدا چونکە لە لایەکەوە کەوتبووە بەر ڕق و قین و نەفرەت، لەو لاشەوە بە چاوی سووک سەیر دەکرا و ڕسوا ببوو، لە کەینوبەینێکدا کوژرا.

١٤ ئێستا ماوەتەوە باسی تایبەتمەندییەکانی ماسیمینۆ بکەین. ماسیمینۆ پیاوێکی فرە شەڕانی و شەڕانخواز بوو. سپا بۆ ئەوەی بە دەست تەمبەڵیی ئالێکساندرەوە، ئەوەی پێشتر باسم کرد، وەڕەز و ماندوو ببوو کوشتبوویان و ماسیمینۆیان وەک ئیمپراتۆر هەڵبژاردبوو و لە جێگەی دایاننابوو. بەڵام زۆر بە سەر کورسیی ئیمپراتۆرییەوە نەمایەوە؛ چونکە دوو شت بوونە هۆی ڕسوایی و سووکبوون و بەر تووک و نەفرەت کەوتنی؛ یەکەم، بۆ ئەوەی

کە ئەم بە ڕەچەڵەک نانەجیب و پێشــتر لە تراچا[1] شوانی ڕانەمەڕ ببوو، هەمووان بەمەیان زانیبوو و هەر ئەمە بووە هۆی سووک و چرووک بوونی لای هەمووان. لە لایەکی ترەوە، هەر لە ســەرەتای بوونی بە ئیمپراتۆرەوە، ڕۆیشتنی خۆی بۆ ڕۆما و چوونە سەر کورسیی ئیمپراتۆریی وەدرەنگ خستبوو و بە هۆی وەزیر و نوێنەرانیەوە لە ڕۆما و هەموو سووچ و قوژبنێکی ئیمپراتۆریدا وێنەیەکی زۆر دڵڕەقانە و داپڵۆسێنەرانەی لە خۆی نیشان دابوو. کار گەیشتبووە ئەوەی کە بە هۆی نانەجیبیی خوێن و ڕق و قین لە دڕندەیی و دەڵڕەقیی، عالەمی لێ عاســی ببوو. لە ئاکامدا لە پێشــدا ئافریقا و دواتر ســێناتۆ و هەموو خەڵکی ڕۆما و گشــت ئیتالیا یەکگرتووانە دژی ڕاپەڕیبوون. سپاکەشــی کە لەو کاتەدا شــاری ئاکویلێیانی[2] گەمــارۆ دابوو و لەگەڵ بەرەنگارییەکی قورس ڕووبەڕوو ببۆوە، لە لایەکی تریشەوە، دڵڕەقی و ملهوڕیی ماسیمینۆوە بێ هیوا و هەراسانیانی کردبوو، کە ئاگاداربوون هەموو دنیا دژی خرۆشاوە و کەسی لەگەڵ نەماوە، ترسیان لێ ڕەویبۆوە و کوشتبوویان.

١٥ من چیتر نامەوێ لە سەر ئێلاگابالۆ و ماکرینۆ و جوولیانۆ ڕاوەستم و تاوتوێیان بکەم؛ ئەمانە بە هۆی ڕیسوایی و سووک و چرووک بوونیانەوە، هێندە لە سەر کورسیی دەسەڵات نەمانەوە و هەر زۆر زوو چرای ژینیان کوژایەوە. کەوایە، لە کۆتایی ئەم باســەدا دەتوانم بڵێم: شــالیارانی ڕۆژگاری ئێمە کەمتر لەگەڵ ئەو کێشە و گرفتانە ڕووبەڕوو دەبنەوە کە ناچار بن لە ڕێی ناڕەوا و بەدەر لە یاســا هەوڵی ڕازی ڕاگرتنی سپای ژێر فەرمانی خۆیان بدەن؛ هەڵبەت ئەمەش بەم مانایە نییە ئاگاداری سپا نەبی و چاوی لێ داخەی. بەڵام ئەگەر گیر و گرفت ســەر هەڵبدا، زوو و بە ئاســانی چار دەکرێن؛ چونکە ڕێک وەک ســپای ئیمپراتۆرانی ڕۆما، هیچکەس لەم شالیارانە سپای زۆر پێکەوە نانێن؛ بە هۆی ئەوەی کە لە دێرزەمانەوە خاوەن دەوڵەتی مەدەنی و سپای ناوچەیین؛ بەڵام ئەگەر ئەوسا پێویست بوو زیاتر هەوڵی ڕازی ڕاگرتنی ســپا بدرێ تا گەل، بۆ ئەوە بوو کە هێزی سپا لە هێزی گەل

---

1. Tracia
2. Aquileia

پتر بوو. بەڵام ئێستا، بێجگە لە سوڵتانی تورک[1] و پادشای میسر، پێویستە هەموو شالیاران لە نێوان گەل و سـپا، هەوڵی ڕازی ڕاگرتنی گەل بدەن؛ چونکە لەم سـەردەمەدا هێز پتر لە دەسـت گەلدایە تا سپا. هۆی هەڵاواردنی سـوڵتانی تورکیش ئەوەیە کە ئەو هەمیشە شازدە هەزار هێزی پیادە و پازدە هەزار سوارەی ساز و گوێ بە فەرمان و ئامادە ڕادەگرێ و، ئاسایشـی پادشـاییەکەی بەوانەوە بەستراوە؛ لە ڕاستیدا ئەوە سـپایە کە پادشایی ئەو دەپارێزێ. بۆیە ئەو ئاغایە ناچارە بێ گوێدان بە ڕێزگرتن و ڕاگرتنی دڵی گەل، دڵی سپا ڕابگرێ و وەک دۆستی خۆی لەگەڵی بجووڵێتەوە. پادشای میسریش هەر وایە، چونکە سپا هەموو شتێکی پاوان کردووە، پادشا بێ ڕێزدانان بۆ گەل و پاراستنی شان و شەوکەتی خەڵک بەرژەوەندیی خۆی لەوەدا دەبینێ کە سـپا وەک دۆسـتی خـۆ ڕابگرێ. دەبێ سەرنجی ئەوەش بدەن کە دەوڵەت و دەسەڵاتی ئەم سوڵتانە لەگەڵ هەموو پادشاییەکانی تردا جیاوازە. ئەم زۆرتر هاوشـێوەی دەسەڵاتی پاپا و کلیسایە؛ نە دەکرێ وەک پادشایی کەلەپووری ناوی ببەی، نە وەک پادشایی نوێ؛ چونکە ئەوە کوڕانی شالیاری کۆن نین کە لە دەڕۆنە سەر کورسیی دەسەڵات و جێگەی باوک دەگرنەوە، بەڵکوو جێگرەوەکەی لە لایەن ئاغاکان و خاوەن دەسـەڵاتانەوە هەڵدەبژێردرێ و لەسـەر کورسیی دەسەڵات دادەنرێ. کەوابوو، چونکە ئەم داب و نەریتە کەڤنارە، ناکرێ بە پادشـایی نوێ دابنرێ؛ هەروەها چونکە هیچکام لەو ئاستەنگ و دژوارییانە کە لە پادشایی نوێدا سەر هەڵدەدەن و بەرۆکی شالیاری تازە بە دەسەڵات گەیشتوو دەگرنەوە، لێرەدا بوونیان نییە. پتر لەمەش، ئەگەرچی شالیار نوێیە، بەڵام داب و دەستوور و دامەزراوەکان کۆن و جێکەوتوون؛ بۆیە کاتێک فەرمانڕەوایی ئەم پادشـاییانە بە کەسـێک دەگا، وەک ئەوە وایە بە میرات پێی گەیشتبێ.

١٦ بەڵام با بگەڕێینەوە سەر باسەکەی خۆمان. لەسەر ئەم بابەتە پێم وایە هەرکەس باش ئـاوڕ لەم باس و لێکدانەوەی سـەرەوە بداتەوە، دەبینێ بەر تـووک و نەفرەت کەوتن و

---

١. سوڵتانی ئەوکاتی تورکان، سوڵتان سەلیمی یەکەم بووە (١٥١٢-١٥٢٠). ـ ئی.ئی.

ســـووک و چرووکبوون هۆی سەرەکیی ڕووخان و تێداچوونی ئەو ئیمپراتۆرانە بووە کە نێومان بردن. هەروەها تێدەگا وێڕای ئەوەی کە هەرکام لەوان بە ئاقارێکدا ڕۆیشتوون و ئەســپی خۆیان تاو داوە و سەرەڕای ڕۆیشتن بە ئاقاری دژ بەیەکدا، تەنیا یەکێک لەوان شاد ژیاوە و ســەری ناوەتەوە؛ ئەوانی تر ناشاد و بە دەرد و کەسەرەوە ژیاون و ئاخرشەڕ بووگن. دیارە ئەلێکساندر و پێرتیناس چونکە شالیاری نوێ و تازە بە دەسەڵات گەیشتوو بووگن، هەوڵدانیان بۆ لاساییکردنەوەی مارکۆ و فەرمانڕەواییکردن بە شێوەی ئەم کارێکی بێهــوودە بووە؛ چونکــە مارکۆ ئاوریلو، تاج و تەختی بە میرات پێگەیشــتبوو. هەروەها تێدەگا بۆچی لاســاییکردنەوەی ســێڤێرۆ بە زیانی کاراکاڵا و کۆمۆدۆ و ماسیمینۆ بووە؛ چونکە ئەمان خاوەن ئەو ژێهاتی و هەڤیازییانە نەبوون کە بۆ ڕۆیشتن بە ڕچەی سێڤێرۆدا پێویست بووگن. هەروەها شالیاری نوێ و تازە بە دەسەڵات گەیشتوو، لە پاشادیی نوێدا ناتوانێ و نابێ لاســایی کار و چالاکیەکانی مارکۆ بکاتەوە؛ ناکرێ و ناتوانێ ڕێچکەی سێڤێرۆیش بەرنەدا و لاسایی ئەم بکاتەوە؛ بەڵکوو دەبێ لە سێڤێرۆ-وە ئەو شتانە فێر ببێ کە بۆ دامەزران و قایمکردنی بناخەکانی دەوڵەت و دەسەڵاتی پێویستن، لە مارکۆیشەوە فێر ببێ کە بە شــانازی و شــکۆوە ئەو دەوڵەت و دەسەڵاتە بپارێزێ کە قورس و قایم و سەقامگرتوو ڕاوەستاوە.

## ٢٠. ئاخۆ دژ و قەڵا و زۆر شتی تر کە شالیاران ڕۆژانە سازیان دەکەن بەکەڵکن یان نا؟

١ هێندێک شالیار بۆ پاراستنی دەوڵەت و دەسەڵاتی خۆیان ژێردەستەکانیان چەک دەکەن، هێندێکی تر خاکی ژێر دەسەڵاتیانیان دابەش کردووە. هێندێک نەیاریان بۆ خۆیان دروست کردووە و گەشاندوویانەوە، هێندێک هەوڵیان داوە دڵی لایەنگران و پشتیوانانی دەوڵەتی پێش خۆیان، ئەوانەی کە لە سەرەتاوە دوژمنی ئەمان بووگن، بەدەست بێنن و بیانکەنە لایەنگری خۆیان، هێندێک دژ و قەڵا و شوورەیان ساز کردووە، هێندێک ئەمانەیان تێک داوە و کاولیان کردوون. جا ئەگەرچی ناکرێ لە سەر تێکڕای ئەمانە بڕیارێ یەکجاری و تەواو بدرێ و پێویستە دانە بە دانەیان بە شێوەی تایبەت و سەربەخۆ بدرێنە بەر باس و ڕاڤە بکرێن، بەڵام من ئەوەندە کە بوارەکە ڕێگەم بدا، هەوڵ دەدەم بە شێوەیەکی گشتی و بەربڵاو کە شیاوی ئەم باسە بێ بدوێم و تاوتوێی بکەم.

٢ دەبێ هەر لە سەرەتاوە بێژین کە قەت شالیارێکی نوێ بە دەسەڵات گەیشتوو نەبووە کە هەوڵی چەککردنی ژێردەستەکانی خۆی دابێ، بە پێچەوانەوە، هەرکات کەوتووە بە سەر ژێردەستەی بێچەکدا چەکداری کردوون: چونکە بە چەکدارکردنیان ئەوان دەبن بە هێزی چەکداری تۆ؛ ئەوانەیش کە لێت بەگومانن، بە چەکدارکردنیان دڕدۆنگییان دەڕەوێتەوە و باوەڕت پێ دێنن، ئەوانەیش کە بڕوایان پێت هەبووە بە باوەڕی زیاترەوە

ئەمەگــی خۆیان بۆ تۆ دەنوێنــن. بەم جۆرە هەموو ژێردەســتەکانت دەبن بە لایەنگری تــۆ. جا چونکە ناکرێ هەموو ژێردەســتان چەکدار بکەی، کاتێــک دەرهەق بەوانە کە چەکدارت کــردوون چاکە دەکەی و خێریان پێدەگەیەنی، دەکرێ لەوانی تر دڵنیا ببی. جیاواز هەڵسوکەوتکردنی تۆ لەگەڵ چەکداربووان و چەکدارنەبووان، دەبێتە هۆی ئەوەی چەکداربــووان خۆیان بە قــەرزداری تۆ بزانن و وەفایان بۆت ببــێ، ئەوانەیش چەکیان هەڵنەگرتووە لە هەڵســوکەوتی هەڵاواردنانەی تۆ دەبوورن. چونکە لایان وایە پێویســتە چەکدارکــراوان بایەخی زۆرتریان پێ بدرێت و خێروبێریان پێ بکرێ؛ چونکە زیاتر لە مەترسیدان و ئەرکی پتریان لە ئەستۆیە. بەڵام کاتێک چەکیان لێ دادەماڵی، ئەوە دەبێتە ســەرەتای سووکایەتیکردن بەوان لە لایەن تۆوە. بەم کارەت دەیسەلمێنی کە بڕوایان پێ ناکەی؛ئەمەش یان بە هۆی کەم بڕوایی ئەوانەوە یان بە هۆی ترسنۆکییانەوەیە. هەرکام لەم بڕوایانەش دەبنە هۆی چاندنی تۆوی تووک و نفرین دژ بە تۆ. هەروەتر چونکە تۆ ناتوانی بێ سپا و هێزی چەکدار بی، ناچاری ڕوو بکەیتە وەرگرتنی هێزی بەکرێگیراو؛ کە پێشتر [1] باسی تایبەتمەندی و چۆنایەتیی ئەم هێزم کرد و گوتم: ئەگەر تەنانەت زۆر چاکیش بێ، ناتوانێ ئەوەندە ژمــارەی زۆر بێ کە بتوانێ هەم لە بەرانبەر دوژمنی زۆرداری دەرەکیدا، هەم لە هەمبەر ژێردەســتانی ســەربزێو و نەیارەوە بتپارێزن و بەرگری لە تۆ بکەن. بەڵام، هەروەک گوتم، شالیاری نوێ و تازە بە دەسەڵات گەیشتوو، لە پادشایی نوێدا، هەمیشە ســپای ســاز و تەیاری ڕاگرتووە؛ مێژوو تەژییە لەم نموونانە. بەڵام کاتێک شــالیارێک دەوڵەتێک داگیر دەکا، چونکە پێکهاتووە لە جۆرە پادشایی کۆن و نوێ، ئەگەر گەرەکی بێ بە دەوڵەتی خۆیەوە پەیوەستی بکا، ئەوسا پێویستە و دەبێ چەک لە سپای دەوڵەتی داگیرکراو داماڵێ؛ هەڵبەت بێجگە لەوانە کە لە کاتی داگیرکردندا لایەنگر و هاریکاری بووگن؛ ئەمانە دەبێ بە تێپەڕبوونی زەمان و لە دەرفەتی گونجاودا لاواز بکرێن. بۆ ســەر و ساماندان و سەقامگیریی وڵاتی داگیرکراو و دەوڵەتی تازە دامەزراو، دەبێ تەنیا هێزی

---

١. بڕوانە بەشی١٢.

دەسەڵاتدار و فەرمانڕەوا لەوێ سپای خۆت بێ؛ یانی هەر ئەو سپایە کە لە دەوڵەتی کۆنی خۆتدا لەگەڵت بووە و لە تەک تۆدا ژیاوە.

٣ باو و باپیرانی خۆمان، ئەوانە کە ژیری و زاناییان جێی ستایش و پەسندی هەمووان بووە[1]، هەمیشــە گوتوویانە کە بۆ ڕاگرتنی پیستۆیا لە ژێر دەسەڵاتی خۆتدا دەبێ هەمیشە ئاوری دووبەرەکی و خۆخۆری بگەشــێنیتەوە؛ بۆ لە بندەست ڕاگرتنی پیساش پێویستە دژ و قەڵای تێدا ســاز بکەی و سپای تێدا مۆڵ بدەی. مەبەسەت لە خۆشکردنی ئاوری دووبەرەکــی و ئــاژاوەی نێوخۆیی لە هێندێک شــار و وڵاتدا ئەوەیە کە بە ئاســانی لە ژێردەســتی خۆتدا ڕایانگری. ســەردەمانێک کە لە ئیتالیا جۆرێک لە هاوسەنگیی هێز هەبــوو، وەها پلانێ دەبوو زۆر بە چاکــی و ڕێکوپێکی بەڕێوە ببرێ، بەڵام بە بڕوای من ئەم پلانە لە ڕۆژگاری خۆماندا بێکەڵکە: چونکە من باوەڕ ناکەم گەشــاندنەوەی ئاگری دووبەرەکایەتی و دەســتە و تاقمبازی لە بەرژەوەندیی کەســدایە. بە پێچەوانە، کاتێک دوژمن پەلاماری شــاری دابەشبوو بەسەر دوو بەرەدا دەدا، شکانی ئەم شارانە حەتمی و دستبەجێیە: چونکە هەمیشە بەرەی لاواز ئەوڕواتە پیری دوژمنەوە و دەبێتەوە چاوساخی، بەرەی دیکەش بە تەنیا خۆی لە بەر ڕاناگرێ و دەشکێ.

٤ بە بڕوای من، هەر ئەم هۆیانە کە لە ســەرەوە باس کران، وایان کرد کە ڤێنێزییەکان زۆرێک لە شارەکانی ژێر دەسەڵاتی خۆیان لە دەست بدەن. ئەوان بەردەوام ئاگری نێوان دوو لایەنی گوویلفی و گابێلینی-یان[2] لەو شــارانەدا خۆش دەکرد و دەیانگەشــاندەوە. ئەگەرچی هەرگیز کاریان نەگەیشتە شەڕی چەکدارانە و خوێنی یەکتریان نەڕشت، بەڵام سەرەڕای ئەمەش، ئەو دووبەرەکایەتی و جیاوازییانە وەها قووڵ ببوونەوە و دانیشتووانی

١. وەک ئەوەی بێژێ: گەمژەکان نە، بەڵکوو هەرە ژیرەکان. هەڵبەت زمانی تەشەراویی پێوە دیارە. ئی. ئی. ئی.

٢. گوویلفی و گابێلینی بە ئیتالیایی [guelfi و ghibelline] دوو بەرەی سیاســی، کە لە ساڵی (١١٢٥ د.ز.) پاش مەرگی ئیمپراتۆر ئێنریکۆی پێنجەم، لە ئاڵمان سەریان هەڵداوە. گوویلفییەکان لایەنگری سیاسەتێک بوون هاوتەریب و سازگار لەگەڵ سیاســەتی پاپا و کلیســای ڕۆما؛ گابێلینــیەکان، بە پێچەوانە، لایەنگری دەســەڵاتی تەواو و ڕەهای ئیمپراتۆر بوون. لایەنگری لەم دوو بۆچوونە بۆ ماوەی چەند ســەدە هەموو ئیتالیای تەنیبۆوە و دووبەرەکایەتیی خــستبووە نێوان گەلێک بنەماڵە و شاری ئیتالیا و، بووە هۆی بەربەرەکانێ (ئابووری، کۆمەڵایەتی و ئایینی) لە نێوانیاندا.

شاری لێک دابڕیبوو کە لە وەختی پەلاماری دوژمندا نەیانتوانی یەکگرتووانە بەرەنگاری بینەوە؛ هەر ئەمەش بووە سەبەبی شکانیان؛ وەک دەبینین ڤێنێزییەکان هیچ کات نەیانتوانی ئەم دۆخە بە قازانجی خۆیان بقۆزنەوە. چونکە کاتێک لە ڤایلا[1] شـکان، دەمودەسـت یەکێـک لەو لایانە کە بە هێزی خۆی پشـت ئەسـتوور بوو، هەموو ئـەو دەوڵەتەی لە چنگیان دەرهێنا. هەروەها پەنابردن بۆ ئەم شـێوازانە، هێمای لاوازیی شالیارە؛ چونکە لە پادشاییەکی بەهێزدا هەرگیز ئیجازە و بواری وەها دووبەرەکایەتییەک نادرێ. ئەمە ڕەنگە لە کاتی ئاشـتی و ئارامیدا بەهـرەی ببێ و لەم ڕێگەیەوە بتوانی بـەو جۆرە کە دەتەوێ ژێردەسـتەکانت هەڵسووڕێنی، بەڵام کە شـەڕ هاتە ئاراوە، ناکارامەیی ئەم شێوازانە هەر زۆر زوو خۆ دەنوێنێ و شکستهێنانی حەتمییە.

٥ بە دڵنیاییەوە شالیاران کاتێک مەزن دەبن کە هەموو ئەو ئاستەنگی و بەرهەڵستانەی دژیان سـەر هەڵدەدەن لەناویان ببەن و بەسەریاندا زاڵ دەبن و لێیان دەپەڕنەوە. شالیاری نوێ، کاتێک دەگاتە دەسـەڵات، پتر لە شـالیاری میراتگر پێویسـتی بە ناودەرکردن و ناوبانـگ هەیە؛ هەر بۆیە بەختیاری لەوەدایە، بە تایبەت کاتێک گەرەکیە مەزنیی خۆی بنوێنێ، کە دوژمنانی سەر هەڵدەدەن و دژی دەجەنگن. ئەمیش بیانووێ چاکی دەست دەکەوێ بۆ تێکشـکانیان و پەڕینەوە بە سەر بەرهەڵستەکانیدا؛ ئەم، بۆ ئەوەیٚ گەورەیی خۆی بسەلمێنێ دەبێ تا بەرزترین پلەی ئەو پەیژەی دوژمنانی بۆیان دانەوە سەرکەوێ. هـەر بۆیە زۆر کەس بڕوایان وایە کە شـالیاری ژیر و دانـا، کاتێک دەرفەت و هەلی بۆ دەڕەخسێ، زۆر زیرەکانە بەهرەی خۆی لە هێندی دوژمنایەتی وەردەگرێ و، بە تێکشانی دوژمن و پەڕینەوە لە بەرهەڵستانی مەزنیی پتر بۆ خۆی بە دەست دێنێ.

٦ شـالیاران، بە تایبەت نوێیەکان، لە سەرەتای بە دەسەڵات گەیشتنیانەوە لە دەوڵەتی نوێدا، ئەمەگ و قازانجی پتریان لەو کەسـانەوە پێدەگا کە لە سـەرەتاوە لێیان بەگومان

---

1. Vaila

بووگــن، تا ئەوانە کە لە ســەرەتاوە جێی متمانەیان بووگن. شــالیاری ســیێنا[١]، ڕاندۆلفۆ پیێترووچی[٢]، پتر بە پشتبەســتن بەوانە کــە لێیان بەگومان بوو دەوڵەتــی خۆی ڕاگرتبوو تــا ئەوانی تر؛ ئەگەرچی ناکرێ ئەمە بگشــتێندرێ[٣]، چونکە بەپێی بابــەت و بوارەکان دەگۆڕدرێ. لەم بوارەوە هەر ئەوەندە دەڵێم کە: ئەو خەڵکەی لە ســەرەتای پادشاییەوە دوژمنایەتی کردووە هەمیشــە بۆ پاراستنی خۆیان پێویستیان بە داڵدەدەر هەیە. کەوابوو شالیار بۆ بەدەستهێنانی دڵیان و کردنیان بە لایەنگری خۆی لەگەڵ گرفتێ ئەوتۆ ڕووبەڕوو نابێ. ئەوانیش بۆ ڕاستکردنەوە و قەرەبووکردنەوەی ئەو هەڵانە کە لە سەرەتاوە دژی ئەم نواندوویانە و ســڕینەوەیان بــە ناچار بە ئەمەگداری زیاترەوە خزمەتی دەکەن و پشــتی دەگرن. بەم جۆرە شالیار هەردەم قازانجی پتری لەمانەوە دەست دەکەوێ تا ئەوانەی کە بــە دڵنیایی زۆرەوە خزمەتیان کردووە، بەڵام زۆر جار گوێ بە بەرژەوەندییەکانی نادەن و کار و فەرمانەکانی پشتگوێ دەخەن.

٧ لە بەر ئەوەی کە تەوەری باســەکە دەخوازێ دەمەوێ وەبیر شــالیاران بێنمەوە کە کاتێک بە یارمەتی و ویســتی دانیشــتووانی وڵاتێک ئەو دەوڵەتــە داگیر دەکەن، دەبێ بــە وردی هۆیەکانی بزواندنی خەڵک بۆ یارمەتیدانــی خۆیان ڕاڤە بکەن و بزانن بۆچی خەڵکــی ئەو وڵاتە، بۆ داگیرکردنــی وڵاتی خۆیان یارمەتیی ئەمانیــان داوە. ئەگەر ئەو یارمەتیدانە بە هۆی ســۆز و هەســتێ سروشتییەوە نەبووە کە بۆ شــالیار بوویانە، بەڵکوو تەنیا لەبەر ئەوەی کە لە دەوڵەتی پێشوو ناڕازی بووگن، ئەوسا ڕاگرتنیان وەک دۆست و لایەنگر فرە ئەستەمە؛ چونکە ئیمکانی ئەوەی کە هەموویان ڕازی ڕابگیرێن نییە. ئەگەر شــالیار بە وردی سەرنجی ئەو نموونانە بدا کە دەکرێ لە مێژوو هەڵکۆڵدرێن، زۆر باش هۆکارەکانی بۆ ڕوون دەبنەوە و باش تێدەگا چۆن ئەوانەی کە لایەنگری دەوڵەتی پێشوو

---

١. Siena، ناوی شارێکە لە ناوەندی ئیتالیا هەڵکەوتووە؛ لە سەردەمی ماکیاڤێلیدا مەڵبەندێکی سەربەخۆ و خاوەن پادشای خۆی بووە.

2. Radolfo Pertrucci

٣. بگشتێندرێ، گشتاندن، گشتگیرکردن، لە بەبات هەموو حاڵەتێکەوە بەکاربردن.

بووگن و لە سەرەتاوە دوژمنایەتیی ئەمیان کردووە ئاسانتر دەبن بە لایەنگری تا ئەوانەی کــە تەنیا بە هۆی نارەزایەتی و عاســیبوون لە دەوڵەتی پێشــوو بووگن بە لایەنگری و لە ڕووخانی دەوڵەتی پێشوودا و داگیرکردنی وڵاتی خۆیاندا یارمەتیی ئەمیان داوە.

٨ شــالیاران بۆ پاراســتنی وڵاتی داگیرکراو لە بندەســتی خۆیاندا و لەدەستنەدانی، بە مەبەســتی لغاوکردن و بەرپەرچدانەوەی هەر چەشنە سەرهەڵدانێک و پاراستنی خۆیان و ســپایان لە ســەردەمی ڕاپەڕین و ســەرهەڵدانی لەنــاکاودا، بەپێــی دابونەریت دژ و قەڵای قورس و قایم ســاز دەکەن. پەیڕەوکردنی ئەم دابونەریتە بە چاک دەزانم؛ چونکە شێوازێکی لەمێژینەیە. بەڵام سەرەڕای ئەمەش هەر لە ڕۆژگاری خۆماندا مێسێر نیکولۆ ڤتێلی[1] بۆ ڕاگرتنی شاری کاستێلۆ[2] هەموو قەڵا و شوورەکانی کاول کرد؛ دووکی ئوورېینۆ، گوویدۆ ئووباڵدۆ[3]، کە چێساریێ بۆرجیا تاراندبووی و لە تاراڤگە دەژیا، کاتێک گەڕایەوە شانشــینی خۆی، بنەڕەتی هەموو دژ و قەڵاکانی ئەو مەڵبەندەی دەرهێنا و گشــتی کاول کرد. ئەوانەی بە هۆی شکســتی خۆی دەزانی و لەو بڕوایەدا بوو کە بێ ئەوانە ئەســتەمە جاری تر بشــکێ و دەوڵەتی لە دەســت بچێ. بێتیڤۆلیش[4] لە گەڕانەوە بۆ بلۆنیا، ڕێک هەمان سیاسەتی پەیڕەو کرد، هەموو قەڵا و شوورەکانی کاول کرد.

٩ کەوایــە کەڵکی دژ و قەڵاکان پێوەندیی بە ســەردەمەوە هەیە: ئەگەر بەرژەوەندی لــە ڕاگرتنیانــدا هەیە، ئەوە چاکن، ئەگەریــش زیانت پێ دەگەیەنن، ئــەوە خراپن. لەم بوارەوە دەتوانم ئاوا بێژم؛ ئەگەر شالیار پتر لە خەڵکی ژێر دەسەڵاتی دەترسێ تا لە هێزی دەرەکی، ئەوە دەبێ قەڵا ساز بکا، بەڵام ئەگەر پتر لە هێزی دەرەکی دەترسێ تا خەڵکی ژێر دەســەڵاتی خۆی، ئەوە چاک وایە واز لە ســازکردنی دژ و قەڵا و شــتی لەم چەشنە بهێنێ. ئەو قەڵایەی فرانچسکۆ سفۆرزا لە میلانۆ سازی دەکا، تا ئێستا پتر لە هەموو ئاژاوە

---

1. Niccolò Vitelli
2. Castello
3. Guido Ubaldo
4. Bentivogli

و کێشـــەکانی ئەو دەوڵەتە، شەڕی بۆ ســـاز کردووە و هی تریشی بە شوێنەوە دەبێ؛ بۆیە باشـــترین قەڵا ئەوەیە بەر تووک و نەفرەتی گەل نەکەوی. چونکە کاتێک بەر تووک و نەفرەتی گەل کەوتی، ئەوسا ئیتر قەڵا و شووورە فریات ناکەون و ڕزگارت ناکەن؛ کە گەل عاسی دەبێ و ڕادەپەڕێ، با چەکیشی پێ نەبێ، دوژمنانی تۆ دێن بە هانایەوە و یارمەتیی ئەدەن. لە ســـەردەمی خۆماندا بێجگە لە شاژنی فوورلی[1] قەڵا کەسی ڕزگار نەکردووە و کەڵک و قازانجی بۆ کەس نەبووە. شاژنیش، کاتێک ئیرۆنیمۆی هاوسەری مرد و خەڵک لێی ڕاپەڕین، قەڵای کردە حەشارگە بۆ خۆی و خۆڕاگریی کرد تاکوو هێزی پشتیوان لە میلانۆوە گەیشـــت؛ ئەو سەردەمانەش دابونەریت وا بوو کە هێزی دەرەکی نەدەڕۆیشتنە هانای خەڵکی ئاساییەوە. بەڵام دواتر کاتێک خەڵکی نەیاری ئەو لە تەک دوژمنەکەیدا، واتە چێزاریێ بۆرجیا، دەستیان تێکەڵ کرد و پەلاماریان دا، قەڵاکان نەیانتوانی ڕزگاری بکەن و هیچ کەڵکیان بۆی نەبوو. کەوابوو، هەم ئەوکات و هەم پێشتریش، بەرژەوەندی و قازانجـــی شـــاژن لەوەدا بوو بەر تـــووک و نەفرەتی خەڵک نەکەوێ، تـــا پەنا بباتە بەر خۆحەشـــاردان لە قەڵادا. ئێســـتا بە لەبەرچاوگرتنی هەموو ئەم شتانە، من ستایشی ئەوانە دەکەم کە دژ و قەڵا ســـاز دەکەن و ئەوانەش کە سازیان ناکەن، بەڵام سەرکۆنە و لۆمەی ئەوانە دەکەم کە پشتبەســـتن بە دژ و قەڵا لە پشتبەستن بە گەل بە چاکتر دەزانن و کەوتنە بەر تووک و نەفرەتی گەل بە کەم دادەنێن.

1. Furli

## ٢١. پێکهاتەی ئەو شـــتانە کە شالیار بۆ ئەوەی کە خۆشناو و جێی پەسند بێ پێویستە ئەنجامیان بدا

١ هیچ شتێک هێندەی ئەنجامدانی کاری مەزن و نواندنی نموونەی دەگمەن و تاقانە لە خۆ نابێتە هۆی ڕێز و ستایشی شالیار. لە سەردەمی خۆماندا پادشای ئێستای ئیسپانیا، فێراندۆی ئارگۆنا[1] هەیە کە دەکرێ وەک شـــالیارێکی تازە بە دەسەڵات گەیشتوو ناوی ببرێ؛ چونکە لە پادشـــایەکی لاوازەوە، بە هۆی ناوبانگ و شـــکۆ و شـــانازییەوە، بوو بە یەکەم پادشـــای ســـەرجەم مەسیحییەکان؛ ئەگەر ســـەرنجی کار و چالاکییەکانی بدرێ دەبینرێ کە هەموو کاری گەورە بووگن، هێندێکیان تەنانەت سەرســـووڕهێنەرن. ئەم لە سەرەتای دانیشتنە سەر تەختی شایی پەلاماری گرانادای[2] دا و سەرکەوتنی لەم هێرشەدا بووە بناغەی قایم بۆ دەوڵەتی. لە کاتێکی چاوەڕواننەکراو و ئارامدا، بێ ئەوەی کە گومان هەڵخرێنێ و بەر لەوەی ببێتە هۆی سەرهەڵدانی دوژمن و ملۆزم، دەستی خۆی وەشاند. فێردیناندۆ بەم کارەی سەرنجی هەموو بارۆنەکانی کاستیلیای بەرەو ئاکامی شەڕی گرانادا ڕاکێشـــابوو؛ ئەوان بە ڕامان لەو شـــەڕە پێیان وا نەبوو ئاقاری سیاسەتی لەناکاو دەگۆڕێ؛

---

١. فێردینانـــدۆی ئارگۆنا، فێردیناندۆی ناسراوە بـــە کاتولیـــک، Ferdinando il Cattolito، (١٤٥٢-١٥١٦)، بنیاندانەر و دامەزرێنەری ئیسپانیای مۆدێرن. ئـ ئی. ئی.

٢. پادشای گرانادا، Granada، لە نیمچە دوورگەی ئیبریا دوایین شوێنی ژێر دەسەڵاتی عەرەب بووە. ئـ ئی. ف.

بەڵام ئەم هەر ئەوەندەی کە ناوبانگـــی دەرکرد، بێ ئەوەی ئەمان ئاگایان لە خۆیان بێ، بووە فەرمانڕەوا و گەورەی ئەمانیش. پاشـــان بە پارەی کلیسا[1] و خەڵک سپای پێکەوە نا و، بە شەڕی بەردەوام و درێژخایەن زۆر چاک و ساز و پەروەردەی کرد؛ لە ئاکامدا هەر ئەم ســـپایەش بوو کە بووە هۆی شانازی و شـــکۆی. پتر لەمەش، بۆ ئەوەی شەڕ زۆرتر هەڵخرێنێ و کاری گەورە بە ئەنجام بگەیەنێ، هەمیشـــە کەڵکی لە ئایین وەردەگرت. بە کەڵک وەرگرتن لە بەزەیی دڵڕەقانە، هەموو مارۆنییەکانی[2] ڕاوڕووت کرد و لە پادشـــایی خۆی دەری کردن. دەکرێ ئەم کارەی ئەو وەک هەست و سۆز بزوێنترین کرداری فرە دەگمەن بێتە ئەژمار؛ فێردیناندۆ هەر بە دێوجامەی ئایینەوە هێرشـــی کردە سەر ئافریقا، لە ئیتالیا چالاکیی جەنگی ئەنجام دا و دەستی خستە نێو کاروباری نێوخۆیی ئەم وڵاتە، لە کۆتاییشـــدا پەلاماری فەرانسەی دا. هەمیشـــە بەم تەرزە کارە گەورەکان خۆی بەڕێوە دەبرد و بە ئاکامی دەگەیاندن. ئەم شێوە کارەش بووە هۆی ئەوەی بندەستەکانی هۆش و سەرنجیان ببڕنە شکۆی ئەو و بە نیگای هەڵپەسێراوەوە چاوەڕوانی دەرئەنجامی چالاکی و شەڕەکانی ببن. ئەو شەڕ و چالاکییانە کە ئەم ئەوەندە پەیتا پەیتا و پێشبینینەکراو بوون کە مەودا و دەرفەتی حەسانەوەی بە نەیارانی نەدەدا تاکوو بتوانن بە ئاسوودەیی لە دژی دەست بەکار ببن.

٢ شـــالیارێک کە بتوانێ نموونەی دەگمەن و تاقانە ســـەبارەت بە کار و فەرمانڕەوایی نێوخۆیی بدا بە دەستەوە، زۆرتر قازانجی بۆی دەبێ –وەکوو ئەوانە کە سەبارەت بە مێسێر بێرنابۆی میلانۆ دەیگێڕنەوە– کاتێک هەل و بواری ئەوە دەڕەخسێ لە ژیانی کۆمەڵگەی مەدەنیـــدا کارێکی سەرســـووڕهێنەر بە ئەنجام بگەیەنێ، جا چ چـــاک بێ یان خراو، بۆ

---

١. تەنیا ژێردەســـتەکان نەبوون کە خەرجی شەڕیان دابین دەکرد، بەڵکوو کلیساش، چونکە شەڕی خاچپەرستی بووە. ئـ نی. ف.

٢. Marrani، وشەیەک کە بە مەبەستی سووکایەتی و جنێو دژی ئەو جووانە بە کار دەبرا کە لە ترسی کاتۆلیکەکان و بۆ ڕزگارکردنی سەری خۆیان لە دەورانی سەدەی پازدەدا بە رواڵەت ببوون بە مەسیحی؛ بەڵام ڕێوڕەسمی ئایینی خۆیانیان بە دزی و دوور لە چاوی نەیاران بەڕێوە دەبرد.

خەڵاتکردن بێ یان سـزادان، دەبێ شـێوازێک پەیڕەو بکەی کە بکەوێتە سەر زاران و هەموو کەس باست بکا. لە سەرووی هەموو شتێکەوە، شالیار دەبێ هەموو بیر و هۆشی خۆی لە سـەر ئەوە چڕ بکاتەوە کە گشت کار و چالاکییەکانی وەکوو کرداری ئینسانی هێژا و خاوەن گیانی بلیمەت و بێ وێنە بناسرێن و ناوبانگ دەرکەن.

٣ هەروەها دۆسـتایەتی و دوژمنایەتیی ڕاسـتەقینە دەبنە هۆی ڕێز و ستایشی شالیار: واتـە کاتێک بێ هیچ پارێزێک و ڕاشـکاوانە لایەنی یەکێک دەگرێ و دژی یەکێکی تر هەڵوێسـت دەگرێ و دەوەستێتەوە. بڕیاری لەم چەشـنە هەمیشە لە بێلایەنی چاکتر و بەقازانجترە؛ کاتێک دوو زلهێزی هاوسـنووری تۆ دەبێتە شەڕیان و چنگ لە چنگی یەک دەئاڵێنن و لەو ئاستەدان یەکیان سەرکەوێ، تۆ دەبێ لە براوە و سەرکەوتوو بترسی یان نا؟ لە هەرکام لەم حاڵەتانەدا قازانجی تۆ لەوەدایە ڕاشـکاوانە لەو شـەڕەدا بەشداری بکـەی؛ چونکە لە حاڵەتی یەکەمدا، واتە لە ئەگەری سـەرکەوتنی یەک لە زۆرانبازاندا، ئەگەر ڕاشکاوانە پشتیوانیت لێ نەکردبێ، ئەوە هەمیشە دەکەویتە بەر پەلاماری و دەتکاتە نێچیری خۆی، ئەمەش دەبێتە مایەی ڕازیبوونی دۆڕاوەی شەڕ؛ هیچ هۆیەکیش بۆ ئەوەی کە بە هاناتەوە بێ نییە. چونکە براوەی شەڕ دۆستی دووڕوو و دڕدۆنگی ناوێ کە لە کاتی تەنگانەدا بە هانایەوە نەهاتووە؛ دۆڕاوەیش بە هاناتەوە نایەت: چونکە تۆ ئامادە نەبوویت لەو شەڕەدا شان بە شانی ئەو شەڕ بکەیت و چارەنووسی خۆت بە بەختی ئەڤەوە ببەستی.

٤ ئیتۆلییەکان بە مەبەسـتی دەرپەڕاندنی ڕۆمییەکان ئانتیۆکۆیان بانگهێشـتی یۆنان کردبـوو.[1] ئەمیـش بەو هیوایـە کە ئەو ئاکێیانـە لە ڕۆمییـەکان بتاکێنێتەوە کـە ببوونە لایەنگریان، باڵوێزێکی ناردبووە لایان و داوای لێ کردبوون خۆیان لە شەڕ نەبان بکەن و بێلایەن ڕاوەستن. لەو لایشەوە ڕۆمییەکان بڕوایان پێی هێنابوون چەکی ئەمان هەڵگرن و شان بە شانیان شەڕ بکەن. کۆڕێکی ڕاوێژ و بڕیاردانی ئاکێییەکان، پێشنیاری باڵوێزانی ئانتیۆکۆیان، بە مەبەسـتی تاوتوێکردن و بڕیاردان لە سەری لەگەڵ نوێنەرانی ڕۆمییەکان

١. بڕوانە بەشی ٣.

دابووە بەر باس و هەڵسەنگاندن؛ شاندی ڕۆمی پێی گوتبوون: «خۆدوورگرتن لە شەڕ، لە هەموو شتێ زیاتر زیانی بۆ ئێوە دەبێ و دەتانکاتە نێچیری سەرکەوتووی شەڕ، شان و شکۆتان دەشکێنێ، ڕێز و قەدرتان لای نامێنێ و سووک دەبن». ڕەوتی ڕووداوەکان ئاوایە کە ئەوەی دۆست و هاوپەیمانی تۆ نییە، هەمیشە هەوڵ دەدا بێلایەن ڕاتگرێ، دۆستانیش داوات لێ دەکەن ڕاشکاوانە شان بە شانیان لە شەڕدا بەشداری بکەی. بەڵام شالیاران کەج بڕیار و خۆبوێر، بۆ خۆدوورگرتن لە مەترسیی هەنووکەیی، زۆر جار بێلایەنی هەڵدەبژێرن و ئەمەش، زۆر جار، هۆی کاولبوونە.

٥ بەڵام کاتێک شالیار بێباکانە لە بەرژەوەندیی لایەنێکدا هەڵوێست دەگرێ و پاڵ ئەداتە پاڵیەوە، ئەگەر ئەوەی کە پێی پەیوەست دەبێ و دەبێتە هاوپەیمانی سەرکەوێ، ئەوسا ئەم لە ئاست زۆرداری ئەودا دەبێ و ئەو خۆی بە قەرزداری ئەم دەزانێ، چونکە لە نێوان ئەواندا پەیمانێ بەستراوە کە بناخەی لە سەر خۆشەویستیی دوولایەنە دامەزراوە: مرۆڤەکان هەرگیز ئەوەندە بێسفەت و قەدرنەناس نین کە بەوپەڕی ناسپاسییەوە چاکەکانت فەرامۆش بکەن و مل بە تۆ بچەمێننەوە و بتچەوسێننەوە. پتر لەمەش، سەرکەوتنەکان هەرگیز ئەوەندە تەواو و بەردەوام نین کە سەرکەوتووان، بێ گوێدانە ئەوەی بۆت کردوون، بە پەلە پشت لە هەموو شتێک بکەن و ڕێزت نەگرن و هەوڵ نەدەن بە وشیاریی تەواوەوە لەگەڵت بجووڵێنەوە. بەڵام ئەگەر ئەوەی کە تۆ پێی پەیوەست دەبی بیدۆڕێنێ، ئەوە دەبێتە دالدەدەر و پشتیوانی تۆ و ئەوەندەی بتوانێ یارمەتیت دەدا؛ هەروەها تۆ دەبیتە دۆستی کەسێک کە دەکرێ ئەستێرەی بەختی دیسانەوە بدرەوشێتەوە و سەرلەنوێ سەرکەوێتەوە.

٦ لە گریمانەی دووهەمدا، واتە کاتێک ئەو دوو لایەنە کە پێکەوە لە شەڕدان هیچیان لەو ئاستەدا نین کە تۆ لە براوەی شەڕ بترسی، لێکدانەوەی ژیرانە و دوورنوارانە ئەوەیە لەگەڵی بکەوی و ببیتە هاوپەیمانی؛ چونکە تۆ بە یارمەتیی کەسێک دەڕۆیتە شەڕی تێکشکانی لایەنێکەوە کە دەبوو بە یارمەتیی تێکشکێنەری ڕزگاری ببێ، هەڵبەت

ئەگەر ژێر ببووا. هەروەتر ئەگەر ئەو لایەنە کە تۆ بە هانایەوە ڕۆیشتووی سەرکەوێ، کە ئەمە ئەگەری زۆرە و بە یارمەتیی تۆ سەرنەکەوتنی ئەستەمە، ئەوسا جێگە و پێگەی تۆ پارێزراوە. بەڵام، هەروەک بەر لەمە گوتم، شالیار دەبێ تێبینیی ئەوە بکا کە بۆ هێرشکردنە سەر ئەوانی تر، نابێ هەرگیز لەگەڵ زۆردارتر لە خۆیدا ببێتە هاوپەیمان؛ مەگەر ئەوەی ناچار بێ؛ چونکە پاش سەرکەوتن دەبێتە دیلی دەستی ئەو؛ هەروەتر شالیار دەبێ خۆ لەوەی کە ئەوانی تر جێگە و پێگەی بۆ دیاری بکەن ببوێری. ڤێنێزییەکان، دژی دووکی میلانۆ، بوونە هاوپەیمانی شای فەڕانسە. دەیانتوانی خۆ لەو هاوپەیمانییە ببوێرن، چونکە وێرانبوون و تێکشکانی خۆیانی لێ کەوتەوە. بەڵام کاتێک نەکرێ خۆ لە وەها هاوپەیمانییەک ببوێری و ناچار بی لەگەڵ بکەوی -وەک چۆن کاتێک پاپا و ئیسپانیاییەکان بۆ پەلاماردانی لۆمباردیا سپایان مۆڵ دا فیورێنتینییەکان ناچار بوون لەگەڵ بکەون،-ئەوسا بەو هۆیانەی کە باس کران، شالیار دەبێ و ناچارە لەگەڵ بکەوێ. من بڕوا ناکام هیچ دەوڵەتێک بتوانێ لە ئاکامی هەموو بڕیارەکانی خۆی دڵنیا بێ. بە پێچەوانەوە، پێم وایە گومانی لە هەموویان هەیە؛ چونکە ئەمە لە پێکهاتە و سروشتی شتەکاندایە و قەت ناکرێ خۆ لە شوێنهاتە نەخوازراوەکان ببوێری و کارێک بکەی کە چیتر هەرگیز لە هیچ ڕووداوێ تردا لەگەڵی ڕووبەڕوو نەبیتەوە. کەوایە، ژیری، زانایی و دوورنواڕی لەوەدایە کە بتوانی چەندایەتیی زیان و شوێنهاتە نەخوازراوەکان بناسی و ئەوەندەی بکرێ لە پێناو بڕیاری چاکدا خۆ لە خراپ و پڕ کەسەرەکان ببوێری.

٧ هەروەها فرە گرینگە کە شالیار خۆی بە دۆستداری ژێهاتی و بەڕەوشتی بنوێنێ، میوانداریی مرۆڤە هێژا و دەست و داوێن پاکەکان بکا و شکۆ و شانازی بە ئەوانە ببەخشێ کە لە هونەرێکدا بلیمەتییان نواندووە. دەبێ گیانی تێکۆشان و داهێنان لە نێو شارۆمەندان و ژێردەستەکانیدا پەرە پێبدا و هێمێنییان بۆ بڕەخسێنێ، بۆ ئەوەی کە بتوانن لە بازاڕ و بازرگانی، کشتوکاڵ و وەرزێری و هەموو ئەو بوارانە کە پێوەندییان بە ژیار و ژیانی مرۆڤەوە هەیە بە ئاسوودەییەوە کار و چالاکیی خۆیان بەرەو پێشەوە ببەن. نابێ

کەس لە ترسـی دەستگرتن بە سـەر ملّک و مالّیدا، خۆی لە خۆ دەولّەمەندکردن و مالّ پێکەوەنان بپارێزێ، یان کەس لە ترسی دەسـت بەسەرداگرتن و دەستدرێژی خۆی لە بازاڕ و بازرگانی دوور بگرێ. بە پێچەوانەوە، دەبێ ئەو کەسانە کە دەتوانن لەم بوارانەوە چالاک بن، هەموو ئەو کەسـانە کە لە بیری ئەوەدان بە هەر شـێوازیەک بشێ و بکرێ هەولّی دەولّەمەندی و بەرینبوونەوەی شار و دەولّەتی خۆیان بدەن هان بدرێن و خەلاّت بکرێن. بێجگە لەمانە، شالیار دەبێ لە دەرفەتە گونجاوەکانی سالّدا بە ڕێکخستنی جەژن و گۆڤەند و شـانۆ، خەلّک سـەرگەرم بکا. چونکە هەموو شـارێک بە سەر گەڕەک و ناوچەی جیا جیادا دابەش بووە و زیاتر لەم کاتانەدا هەموو لە دەوری یەک کۆوە دەبن، بۆیە شالیار دەبێ هێندێک جار بڕواتە کۆڕ و کۆبوونەوەیانەوە و نموونەیەک لە ئینسانی بەرز و بلیمەت و دلۆڤان لە خۆی بنوێنێ و ئەوەی کە شیاوی شان و شکۆی شاهانەیە بە جوانی ئەنجام بدات؛ ئەمە هەرگیز نابێ پشتگوێ بخرێ و بە کەم دابنرێ.

## ٢٢. سەبارەت بە وەزیر و ڕاوێژڤانانی شالیار

١ هەڵبژاردن وەزیران بۆ شالیار گرینگیی تایبەتی هەیە. چاک و خراپیی ئەوان پێوەندیی بە ڕاوتەگبیر، ژیری و بەمشووریی شالیارەوە هەیە. یەکەم پێوەر بۆ هەڵسەنگاندنی ژیری و لێزانیی هەر سەرۆکێک بینینی ئەو پیاوانەیە کە لە دەوری کۆوە بووگن؛ کاتێک شیاو و لێهاتوو و ئەمەگدارن، دەکرێ وەک سەرۆکێ ژیر و زانا بینرخێنی و دادوەریی بکەی؛ چونکە زانیویە لێهاتوویی و لێزانیی پیاوانی بەردەستی بناسێ و ئەمەگدار بە خۆی ڕایانگرێ. بەڵام کاتێک ئەم تایبەتمەندییانە لە پیاوانی دەوروبەریدا بەدی ناکرێن، بەم جۆرە دادوەری ناکرێ؛ چونکە یەکەم هەڵەکانی لە هەڵبژاردنی وەزیر و ڕاوێژڤانانیدا دەردەکەون.

٢ هەموو ئەو کەسانە کە مێسیر ئانتۆنیۆ دا ڤێنافرۆ ڕاوێژڤان و وزیری شای سیێنا، ڕاندۆلفۆ پێترئووچی[١] دەناسن، لایان وایە ڕاندۆلفۆ پیاوێکی زانا و تێگەیشتووە، بۆیە ئەو کابرایەی کردووە بە وەزیری خۆی. لە کاری دەوڵەتداریدا سێ جۆر تێگەیشتوویی و لێزانیی هەیە - یەکێک بۆخۆی لە شتەکان تێدەگا، یەکێک لە ڕێگەی شیکاریی کەسی ترەوە لە کاکڵەی مەبەست تێدەگا، یەکێکی تر نە بۆخۆی تێدەگا، نە بە یارمەتیی شیکاریی کەسانی تر؛ ئەوەی یەکەم فرە بەرز و بلیمەتە، دووهەم بەرزە، سێهەم نزمە. بۆیە

---

١. ئانتۆنیۆ دا ڤێنافرۆ، Antonio da Venafro، ڕاندۆلفۆ پێترئووچی، Randolfo Petrucci.

پێویستی شـتەکان وا دەخوازێ کە ئەگەر ڕاندۆلفۆ لە پلەی یەکەمدا نەبووە، بێ گومان لە پلەی دووهەمدا بووە. بە گشـتی، کاتێک شالیار لای وایە لە چاکە و خراپەی گوتە و کرداری وەزیر تێگەیشتووە، ئەگەر بۆخۆیشی داهێنەر نەبێ، دەبێ بزانێ گوتار و کرداری چاک و خراپی وەزیری هەڵسەنگێنێ، چاکەکان بە شیاو و پەسند بزانی و بەهایان پێ بدا، هەڵەکان ڕاست بکاتەوە؛ وەزیر نابێ بۆ پاراستنی جێگە و پایەی خۆی بیر لە فریودان و بەلاڕێدابردنی شالیار بکاتەوە.

٣ گونجاوترین شـێواز بۆ ئەوەی کە شـالیارێک وەزیری پێ بناسێ، ئەم ڕێگەیە کە قەت بە هەڵەیدا نەبا: کاتێک دەبینی وەزیر زۆرتر بیر لە خۆی و بەرژەوەندییەکانی خۆی دەکاتەوە تا ئەوانەی شالیار و لە هەموو کار و چالاکییەکاندا بە شوێن دەسکەوت و سوودی خۆیەوەیە، ئەو کەسە هەرگیز ناتوانێ وەزیرێ باش بێ، ئەتۆش هەرگیز نابێ متمانەی پێ بکەی؛ چونکە کەسـێک کە کاربەدەستی دەوڵەتە، دەبێ تەنیا بیر لە بەرژەوەندییەکانی شالیاری خۆی بکاتەوە و هەرگیز لە بیری بەرژەوەندیی تاکەکەسیی خۆیدا نەبێ؛ بێجگە بیری بەرژەوەندییەکانی شالیاری، نابێ بیری تری لە سەردا بێ. لە لایەکی دیکەشەوە، بۆ چاک و پاک ڕاگرتنی وەزیر، شـالیار دەبێ هەردەم چاوی لێی بێ و فەرامۆشی نەکا کە دەبێ شکۆ و شانازیی پێ ببەخشێ، دەوڵەمەندی بکا و بە بەشداری پێکردنی لە شکۆ و شـانازی، کار و ئەرکەکاندا پابەند و ملکەچی خۆی ڕایگرێ؛ تا ئەو جێگەی کە وەزیر هەموو بوون و دارایی خۆی لە سایەی شالیارەوە بزانێ و بێ ئەم ژیانی پێ نەکرێ. دەبێ ئەوەندە دەڵەمەند و چاوتێر کرابێ کە ئیتر تامەزرۆیی و چاوچنۆکیی پتر دەوڵەمەندبوونی نەبێ؛ ئەوەندەش کار و ئەرکی پێ سپێردرابێ کە بیری گۆڕان و ئاڵوگۆڕی دەسەڵات سام بخاتە دڵیەوە. کاتێک وەزیران و شـالیاران بـەم جۆرە پێکهاتوون، دەتوانن متمانەیان بە یەکتر هەبێ؛ ئەگەر وا نەبێ لە ئاکامدا هەمیشە هەر دوو لایان دەکەن.

## ٢٣. سەبارەت بە خۆپاراستن لە زمانلووسان

١ لێرەدا دەمەوێ ئــاورێ لە بابەتێکی فرە گرینگ و هەڵەیەکی کوشــندە بدەمەوە کە ئەگەر شالیار زۆر وشیار نەبێ یان لە هەڵبژاردنەکانی خۆیدا هەڵە بکات، ئەستەم بتوانێ خــۆی لێیان بپارێــزێ. ئەم بابەت و هەڵە کوشــندەیە ئەو زمانلووســانەن کە هەردەم لە دەرباری شاکاندا ئامادەن. مرۆڤ کاتێک سەبارەت بەو شتانە کە پێوەندییان بە خۆیەوە هەیە تاریف دەکرێ و پێیدا هەڵدەڵێن بە جۆرێک خۆ فریو دەدا، کە لە خۆپاراســتن لە هەمبەر ئەم ئافەتە تووشــی گرفت دەبێ و ئەستەم بتوانێ خۆی لێ بپارێزێ؛ کاتێکیش دەیهەوێ بەرەنگاری ئەم زمانلووسانە ببێتەوە و لە خۆی دوورِیان خاتەوە ترسی ئەوەی هەیە ببێتە هۆی ڕیســوایی خۆی و لە پێش چاویان ســووک ببێ. جا بۆیە تەنیا شێوە بۆ خۆبواردن و خۆپاراســتن لە زمانلووسان ئەوەیە کە ئەوانەی دەوروبەرەت بزانن باکت لە ژنەفتنی ڕاستییەکان نییە و بە بیستنیان هەڵناچی. هەڵبەت کاتێک هەمووان بوێرن و بتوانن باســی ڕاستییەکان بۆ شــالیار بکەن قەدر و ڕێزی نامێنێ، بۆیە شالیاری ژیر و زانا، دەبێ ڕێگەی سێهەم بدۆزێتەوە؛ ئەویش ئەوەیە کە بۆ کاری دەوڵەتداری و ڕاوێژکاری دەبێ پیاوانێ ژیر و ئاقڵ هەڵبژێرێ و بۆ بیســتنی ڕاستییەکان تەنیا گوێ بۆ ئەم بژاردە ڕادێرێ؛ ئەویش تەنیا ئەو شــتانە کە شالیار لێیانی دەپرســێ و هیچی تر. بەڵام دەبێ سەبارەت بە هەموو شتێک و لە گشت بوارێکەوە پرسیاریان لێ بکا و گوێ بۆ هەموو بۆچوونەکانیان

ڕادێــرێ و دواتر بۆخۆی بە تەنیا و بە شــێوەی خۆی بڕیاریان لەســەر بدا. هەروەها لەم ڕاوێژ و ڕادەربڕینانەدا دەبێ بە جۆرێک لەگەڵ هەرکام لە ڕاوێژڤانان هەڵســوکەوت بکا کە بزانن هەرچــی بە ئازادی و بێ گرێ و گۆڵەتر بێنە ئاخافتن و بیر و بۆچوونی خۆیان دەرببــڕن، پتر گوێیان بۆ ڕادەگیردرێ و پەســند دەکرێن. هەروەتر بێجگە لەو شــتانەی بۆخۆی مەبەستیەتی نابێ گوێ بۆ هیچ شتێکی تر بگرێ؛ دواتریش دەبێ شوێن بڕیاری خۆی بکەوێ سوور بێ لە سەر ویست و بڕیاری. کێ پەیڕەوی ئەم ئامۆژگارییە ناکا و بە شێوەی تر دەجووڵێتەوە، یان بە هۆی زمانلووسانەوە بە هەڵە و ڕێگەی هەڵدێرەوە دەگلێ و دەگــەوزێ، یان بەپێی گۆڕانی بیر و بۆچوونــەکان ڕاوبۆچوونی ئەمیش دەگۆڕدرێ؛ ئاکامــی ئەمەش دەبێتە ئەوەی کە وەکوو کەســێکی ژیر و زانا ســەیری ناکرێ و جێی پەسند و ستایش نابێ.

٢ لە پێوەندی بەم باسەوە دەمەوێ ئاوڕ لە نموونەی سەردەم بدەمەوە. لووکا، نوێنەر و پیاوی ئیمپراتۆری ئێستای، ماسیمیلیانۆ، کاتێک باسی پادشای خۆی دەکرد، دەیگوت: ئەو لەگەڵ کەس ڕاوێژ ناکات و هیچکات شتەکانی بە شێوەی خۆی ئەنجام نادا. ئاکامی ئەمەش ڕێک بە پێچەوانەی هەموو ئەوانەیە کە لەسەرەوە باسمان کرد؛ چونکە ئیمپراتۆر پیاوێکە کە بە نهێنی کار دەکا و باسی پلان و بەرنامەکانی خۆی بۆ کەس ناکا، ڕاوبۆچوون و ڕاوێژیشــی نەگەرەکە. بەڵام کاتێک پلان و بەرنامەکانی ئاشکرا دەبن و دەبێ دەست بە جێبەجێکردنیان بکەن، ئەوسا ئەوانەی دەوروبەری دەکەونە دژایەتیکردنی. ئەویش، چونکە کەسێکی کۆڵدەرە[1] و لەسەر بڕیار و بۆچوونی خۆی قورس ناوەستێ، لە هەموو پلان و بەرنامەکانی پەشیمان دەبێتەوە؛ ئاکام ئەوەیە کە ئەوەی ئەمڕۆ بڕیاری لەسەر داوە بەیانی هەڵدەوەشــێتەوە، ئاخریشی دەبێ بەوەی کە هیچ کاتێک کەس نازانێ مەبەستی چییــە و چــی گەرەکە و پلان و بەرنامە چییە؛ بۆیە کەس ناتوانــێ دڵ بە بڕیار و پەیمانی خۆش بکا و متمانەی پێ بکا.

---

١. کۆڵدەر بۆ پێچەوانەی کۆڵنەدەر دانراوە.

٣ دیاره که شـالیار هەمیشـه دەبێ ڕاوێژ بـکا و گوێ بۆ ڕاوبۆچـوون ڕادێرێ، بەڵام کاتێک ئەم بۆخۆی خوازیاره نەک کاتێک ئەوانی تر دەخوازن. بە پێچەوانەوە، شـالیار دەبـێ جۆرێک لەگـەڵ ڕاوێژڤانانی هەڵسـوکەوت بکا که نەوێرن هەرکات ویسـتیان ڕاوبۆچوونی خۆیانی پێ بێژن، مەگەر ئەوەی بۆخۆی پرسیان پێ بکا و داواکاری ڕاوێژی ئـەوان بێ. بـەڵام کاتێک پرس و ڕاوێژیـان پێ دەکا، دەبێ فره بە وردی بڕواته گشـت کون و قوژبنێکەوه و چاک سـەنگ و سوژنیان بکا. سەبارەت بەو شتانەش که دەپرسێ پێویسته به پشوودرێژییەوه گوێ بۆ ڕاستییەکان ڕادێرێ، ئەگەریش کەسێک به بیانووی ڕێزلێگرتنەوه گەرەکی بێ ڕاسـتییەکانی لێ بشارێتەوه و پێی نەیژێ، بەجێ و ڕەوایه لێی تووڕه بێ و دەنگی لێ هەڵبڕێ. ئەگەر شالیارێ به هۆی دوورەنوارییەوه دەبێته جێی ڕێز و ستایشی زۆر کەس، کەچی کەسانێک لایان وایه سەرچاوەی ئەو لێهاتوویی و ژیرییه سروشتی تایبەتی خۆی نییه، بەڵکوو به هۆی ڕاوێژڤانانی چاکەوەیه که له دەوری خۆی کۆیانی کردۆتەوه، بێ گومان کڵاو له سـەر خۆ دەنێن و به هەڵەدا چووگن؛ چونکه ئەم خاڵەی خوارەوه یاسایەکی گشتی و له شکان نەهاتووه: یانی ئەوەی که ئەگەر شالیارێک بۆخـۆی ژیر و زانا نەبێ ناکرێ ڕاوێژ و پێشـنیاری ژیرانەی پێ بکرێ. مەگەر ئەوەی به هەڵکـەوت ڕاوێژڤانێ لێهاتوو و ژیر و زانای ببـێ، که هەموو کاروباری دەوڵەتی بخاته دەستی خۆی و بۆخۆی ببێته حکومڕان و هەڵسووڕێنەری کاروبار پادشایی. بەڵام ئەمە ناتوانێ درێژخایەن بێ؛ چونکه بەڕێوەبەر و حکومڕان له ماوەیەکی کەمدا هەموو دەوڵەت و دەسەڵاتی له چنگ دەردێنێ. هەروەتر شالیاری کەم زان و کەم ئاوەز، کاتێک لەگەڵ زێدەتر له ڕاوێژڤانێک ڕاوێژ دەکا و گوێی بۆ ڕا و پێشنیاری ڕادەگرێ، قەت پێی ناکرێ کاکڵەی باس به پوختی وەربگرێت و بۆخۆیشـی توانای کۆکردنەوه و لێک ئاڵاندن و ساغکردنەوەیانی نییه. ئەوسا وای پێدێ که هەرکام له ڕاوێژڤانان بیری لای بەرژەوەندیی تایبەتی خۆیەوه بێ، شالیاریش نه دەتوانێ به ئیرادەی خۆی هەڵیانسووڕێنێ، نه دەتوانێ چاک له مەبەستی ئەوان تێبگا. هەڵبەت ناکرێ لەمەش چاکتر بن، چونکه ئەگەر ناچاری

پاڵ بە مرۆڤەوە نەنێ هەرگیز خۆی لەگەڵ ویست و بەرژەوەندیی تۆدا ناگونجێنێ. کۆتایی و ئاکامی باس ئەوەیە کە: ڕاوێژ و پێشـــنیاری چاک لــە هەر لایەنێکەوە بێ، چاک وایە سـەرچاوگەکەی ژیری، زانایی و دوونواڕیی شالیار بێ، نەک ئەوەی پێشنیار و ڕاوێژی چاکی کەسانی تر ببنە سەرچاوەی ژیری، زانایی و دوونواڕیی شالیار.

## ٢٤. بۆچی شالیارانی ئیتالیایی دەوڵەتەکانی خۆیانیان دۆڕاند؟

١ ئاوڕدانەوەی ورد لەو شتانە کە بەر لەمە باسمان کردن و چاک جێبەجێکردنیان، سیمای لەمێژینە و سەقامگیر لە شالیارێکی نوێ و تازە بە دەسەڵات گەیشتوو دەدەن بە دەستەوە و هەر فرە زوو دەبنە هۆی ئەرخایەنی و دابینکردنی ئاسایشی؛ بە جۆرێک چما هەر لە کۆنەوە لەو مەڵبەندە جێگیر بووبێ. هەروەها چونکە کار و چالاکییەکانی شالیارێ نوێ زۆر بە وردی دەخرێنە ژێر چاودێرییەوە تا ئەو کەسە کە پادشایی بە میرات پێگەیشتووە، کاتێک ژێردەستەکانی ئەم بە کەسێکی شیاو و لێهاتوو دەزانن، زۆر زوو پەسندی دەکەن و پتر دەربەستی ئەم دەبن، تا ئەو کەسە کە بە هۆی خوێن و بە میرات تەختی شایی پێگەیشتووە؛ چونکە مرۆڤ پتر شوێن شتە ئێستاییەکان دەکەوێ تا ئەو شتانە کە ڕابردوون و بووگن بە دیرۆک، کاتێکیش شتە ئێستاییەکان دەبنە هۆی حەسانەوە و خۆشگوزەرانی، بۆیە ڕازی و قانیع چێژی خۆی لێیان وەردەگرێ و شوێن شتی تر ناکەوێ؛ ئەوسا ئەگەر شالیار لە شتەکانی تردا کەموکوڕی نەبێ، ئامادەن بە هەموو شێوەیەک بەرگریی لێ بکەن. بەم جۆرە شالیاری نوێ دەبێتە خاوەن دوو شانازی و شکۆ: یەکەم ئەوەی کە بنەڕەتی پادشاییەکی نوێی داناوە و بە دەستوور و قانوونی چاک ڕازاندویەتییەوە و جێگیری کردووە، سپای ساز کردووە و بە فەرمانڕەوایی نموونەیی شکۆی خۆی سەلماندووە؛ لە لایەکی ترەوە بەم کار و کردارانەی، شەرم و نەنگی ئەو

کەســەی کە شا لە دایک بووە [واتە شــازادە بووە] بەڵام بە هۆی نەزانی و بێمشورییەوە بووەتە بایس لەدەستچوونی تاج و تەختی دوو چەندان دەکاتەوە.

٢ ئەگەر ســەیری ئەو ئاغا و میرانە بکەین کە لــە ڕۆژگاری ئێمەدا لە ئیتالیا دەوڵەتی خۆیانیان دۆڕاند، بۆ نموونە شــای ناپۆلی، دووکی میلانــۆ[1] و ئەوانی تر، لە هەموویاندا نوقســانییەکی هاوبەش دەبینرێ؛ پێش لە هەموو شــتێ نەبوونی ســپای چاک و ساز و تەیــار -بەو هۆیانە کە بەر لەمە بە درێژی ڕاڤەمان کردن- هەروەها دەبینین کە هێندێک لــەوان بەر تــووک و نەفرەتی خەڵک کەوتبوون و بێزراوی گەل بوون. ئەوانەشــیان کە خۆشەویســتی خەڵک بوون نەیانزانیبوو چۆن خۆیان لە دەرەبەگەکان بپارێزن؛ چونکە بەبێ ئەم کەموکوڕییە، دەوڵەتێک کە ئەوندە ڕیشــەدار، لق و پۆدار بێ کە بتوانێ سپای ساز بباتە مەیدانی شەڕەوە لە شکان نایەت و لە دەست ناچێ. فیلیپ مەکدۆنی، مەبەست باوکی ئەســکەندەری مەکدۆنی نییە، بەڵکوو ئەوەی تیتوی پێنجەم شکاندی، کاتێک پەلاماری یۆنان و ڕۆمییەکانی دابوو، دەوڵەتەکەی گەلێک لەم دووانە بچووکتر و کەمتر بوو، بەڵام چونکە کەســێکی ســەربازی ببوو و زانیبووی چۆن گــەل لەگەڵ خۆ بخات و دۆســتی خۆی ڕاگرێ و، هاوکات زانیبووی دوژمنایەتیــی دەرەبەگەکان دژی خۆی هەڵنەخرێنێ و خۆی لێیان بپارێزێ، ساڵانێکی زۆر لە هەمبەر ئەو دوو هێزە خۆڕاگریی کرد؛ لە ئاکامیشدا، ئەگەرچی هێندێک لە شارەکانیان لە چنگ دەرهێنایەوە و دەسەڵاتی بەسەریانەوە نەما، بەڵام پادشایی خۆی پاراست و ڕزگاری کرد.

٣ جا بۆیە شالیارانی خۆمان، ئەوانە کە ساڵانێ زۆر لە پادشایی خۆیاندا فەرمانڕەواییان کــرد و دواتر دۆڕاندیانن، نابێ لۆمەی بەختی خۆیــان بکەن و بە تاوانباری بزانن؛ ئەمان چاکتر وایە دان بە نەزانی و ناوشــیاریی خۆیاندا بنێن. چونکە لە کاتە ئارامەکاندا بیریان لــەوە نەکردبۆوە کە دنیا تا ســەر ئارام نابێ و دەکرێ گۆڕان بێتــە ئاراوە -هەڵبەت ئەمە کەموکوڕیی هاوبەشی هەموو مرۆڤەکانە کە لە کاتی خۆشی و ئارامیدا بیر لە هەڵکردنی

---

١. بڕوانە بەشی ٣.

ڕەشەبای دژ و نەیار ناکەنەوە- کاتێکیش باهۆزی نەهات هەڵدەکا و دەکەونە تەنگانەوە لە جیاتی وەستان، بەرخۆدان و بەرەنگاری، دەکەونە بیری هەڵاتن و دڵی خۆیان بەوە خۆش دەکەن کە بەڵکوو خەڵک لە سووکایەتی و دەستدرێژیی سەرکەوتووان وەزاڵە بێن و ئەمان بانگ بکەنەوە و بیانبەنەوە سەر کورسیی دەسەڵات. کاتێک هیچ چارە و بوارێکی تر بەدی ناکرێ، بڕیارێکی ئاوا خراپ نییە و چاکیشە؛ بەڵام کاتێک تۆ هەموو ڕێگاچارەکانی ترت پشتگوێ خستووە، ئەمە چاکەیەکی خراپە: چونکە ئەتۆ هەرگیز نابێ بهێڵی بکەوی و دڵی خۆت بەوە خۆش بکەی کە هەر کەسێک پەیدا دەبێ هەڵتسێنێتەوە. ئەگەرچی ئەمەش ڕەنگە هەر ڕوو نەدا و کەس دەستت نەگرێ و هەڵت نەستێنێتەوە، یان گریمان دەستت بگرن و ڕاستت بکەنەوە، بەڵام دەبێ بزانی لە ئاوا حاڵەتێکدا هیچ شتێک بە حەز و مەیلی تۆ ناڕواتە پێشەوە؛ چونکە ئەوە تۆ نیت کە لە سەر ئەو شێوە بەرگری و بەرەنگارییە ترسنۆکانە بڕیار دەدەی. بەرەنگاریی لەم چەشنە تەنیا کاتێک بەخوان، چاک، درێژخایەن و دڵنیاکەرە کە بۆخۆت بڕیاری لەسەر بدەی و ژیری و ژێهاتیی خودی تۆ سەرچاوەی بێ.

## ٢٥. بەخت چەندە دەسـەڵاتی بەسـەر کاروباری مرۆڤدا هەیە و چۆن دەکرێ بەرەنگاری ببیتەوە؟

١ من لەگەڵ ئەو کەسـانە نامۆ نیم کە بڕوایان وا بووە کە کاروباری دنیا بەپێی ویستی بەخت یان یەزدان دەڕواتە پێش و مرۆڤ بە ژیری و دوورنوارِیی خۆی ناتوانێ ئاقاریان بگۆڕێ یان ئەوەی کە هیچ چارەیەک بۆ گۆڕینی ڕەوتی ڕووداوەکان نییە؛ بۆیە ڕایان وایە کە چاک وایە ئەوەندە خۆ بەم شـتانەوە ماندوو نەکەن و لێگەڕێن چارەنووس فرەمانڕەوا و سـەروەر بێ. ئەم بیر و باوەڕانە لە سـەردەمی خۆماندا بە هۆی گۆڕانی بەردەوامی شتە مەزنەکانەوە کە بە چاو خۆیان بینیویانە یان هەموو ڕۆژێ دەبینرێن کە چۆن ڕوو دەدەن و هیچ ئیرادەیەکی ئەوانی تێدا نییە، زیاتر باوەڕیان پێ دەکرێ؛ منیش کە جار بە جار بیری لێ دەکەمەوە، لە هێندێک شوێندا بەرەو بیر و بڕوای ئەوانە دەچەمێمەوە. بەڵام سەرەڕای ئەمانە، تا کاتێک ئیرادەی ئازادی ئێمە تووشی ئەو هەڵەیە نەبووە کە نکۆڵی لە ئازادیی مرۆڤ لە ئەنجامدان هەموو کار و چالاکییەکانیدا بکا، ئەمن لەسـەر ئەم بڕوایەم بەخت بە سـەر نیوەیەک لە چالاکی و کردارەکانی ئێمـەن بڕیار دەدا و لێی دەگەڕێ بۆخۆمان لە سـەر ئەو نیوەکەی تر یان تا ڕادەیەک ئەو نیوەکەی تر بڕیار بدەین. باوەڕ بەوەی کە هەموو بڕیارێک بە ویسـتی بەختە، ڕێک بە وێنەی ئـەو ڕووبارە پڕ جۆش و خرۆش و بەلرفانەیە کە کاتێک تووڕە دەبن و شاڵاو دێنن گابەرد دەتلێنن، کەڤ دێننە لەرز، هەموو

گــژ و گیا و بژێوان له بن دێنــن، دار و درەخت ڕادەماڵن و بنیاد و بیناکان وێران دەکەن، خاک و قوڕی ئەم بناره بەرز دەکەنەوە و ڕاماڵی ئەو بنارەی تری دەکەن و هەموو کەس له بەریان هەڵدێ و تەســلیمی دەبن، بێ ئەوەی کە بیریان لە هەڵبەســتنی بەرهەڵست و لەمپەر کردبێتەوە. جا چونکە سروشــتی ڕووبار و چــەم ئاوایە، ئەوە بەو مانایە نییە کە له کاتی ئارامی و ئۆقرەگرتوویيدا مرۆڤ پێشــبینیی شالاوی لافاو نەکا و بیر له هەڵبەستنی بەنداڤ و بەرهەڵست نەکاتەوە: بە جۆرێک کە کاتێک ئاوی ڕووبار هەڵدەچێ و تەوژم دێنێ بە کەنداڵی خۆیدا بڕوا و چیتر هێزی زیانگەیاندنی نەبێ. ڕێک هەر بەم شــێوەیە بەخت لــەوێ بەکارە کە دەتوانێ هێزی خۆی بنوێنێ و هیچ بەرەنگار، بەرهەڵســتێکی بوێر و کۆڵنەدەر و لەشکانەهاتوو له خۆی ڕانابینێ چنگ بخاتە چنگی و لەگەڵی شاخ بە شــاخ بێ؛ بەخت شــەپۆل و تەوژمەکانی خۆی لەوێ دەنوێنێ کــە دەزانێ لەمپەر و بەرهەڵست بۆ بەرەنگاربوونەوەی هەڵنەبەســتراوە. ئەگەر ئێوە بڕوانە ئیتالیا کە بووگە بە شــانۆی کەوتن و هەســتانەوە و هەڵکشان و داکشــان و گۆڕانی بەردەوام و ئاوڕێک لە بزوێنەرە ســەرەتاییەکانی بدەنەوە، دەبینن کە له دەشتێکی بەرینی بێ پەرژین دەچێ کە هەموو کەســێک پێی دەوێرێ. ئاشکرایە ئەگەر بە وێنەی ئاڵمان، فەڕانسە و ئیسپانیا بە ئامراز و کەرەسەی گونجاو و پێویســت پارێزرابا شالاوی شەپۆلی هێزی بێگانە گۆڕان و ناســەقامگیریی ئەوەندە مەزنی نەدەخولقاند کە ئێستا ئیتالیای تێوە گلاوە و، نائارامی و گۆڕانی بەردەوام بە ســەریدا زاڵە، یان ئەوەی کە هەر شــالاوی نەدەهێنا؛ سەبارەت بە بەرەنگاربوونەوەی بەخت بە گشتی هەر ئەوەندە بە بەس دەزانم.

٢ جا ئێستا دەمەوێ شــۆڕ ببمەوە بۆ نێو وردەکارییەکان و باسی ئەوە بکەم کە چۆن ئەمڕۆ شــالیارێک دەبینرێ کە بە خۆشــی ڕادەبوێرێ و بەیانی هەڵدەدێرێ و بە چاوی خــۆی کاولبوونــی دەبینــێ، بێ ئــەوەی ببینرێ کە سروشــت یان ئاکار و ڕەوشــت و تایبەتمەندییەکانی بگۆڕێ. ســەرچاوە و هۆیەکانی ئەمە کامەیە، پێشــتر بە وردی ڕاڤەم

کردن.[١] ئەو شالیارە کە بە تەواوی پشت بە بەخت ببەستێ، لەگەڵ هەڵگەڕانەوە و گۆڕانی بەخت، شــکان و تێداچوونی حەتمییە؛ بە بڕوای من بەخت زیاتر یاری ئەو کەسەیە کە [دەزانــێ] خۆ لەگەڵ زەمــان و ڕەوتی ڕووداوان بگونجێنێ؛ هــەر بەم جۆرەش بەخت یاری ئەو کەسە نییە کە [نازانێ] خۆ لەگەڵ زەمان و ڕەوتی ڕووداوان بگونجێنێ؛ چونکە دەبینین کە مرۆڤ بۆ گەیشتن بەو ئامانجانە کە بۆخۆی دیاری دەکا، واتە شانازی و شکۆ، دەوڵەمەندی هەرکەس بە جۆرێک بۆ بەدەســتهێنانیان پێشــڕەوی دەکا؛ یەکێک ژیرانە و بەشــێنەیی، یەکێکی تر هەڵمەتبەرانە، یەکێکی تر بە زۆرداری، ئەوی تر بە پشتبەستن بە هونەر و زیرەکی، یەکێک بە پشــوودرێژییەوە، ئــەوی تر بە پێچەوانەی ئەمەوە؛ هەر کەســێک بە یەکێک لەم ڕێگــە جیاوازانــەوە دەتوانێ بەرەو ئامانجــی خۆی هەنگاو هەڵگرێ، کەچی دواتر لە نێوان ئەو جووتە کە ژیرانە و بەشێنەیی شوێن ئامانجی خۆیان کەوتوون، یەکێک دەتوانێ بە ئامانج بگا و پلانەکەی بەدی بێنێ، ئەوی تر جێ دەمێنێ و پێی ناگا. هەر بەم شــێوەیە دەبینین دوو کەس کە بۆ گەیشــتن بــە ئامانجیان ڕێگەی جیاوازیان هەڵبژاردووە، یەکێک هەڵمەتبەرانە و ئەوی تر لەسەرخۆ و هەڵسەنگێنەرانە، کەچی هەر دوو بە ئامانجی خۆیان گەیشتوون؛ تەنیا هۆی ئەمەش ئەوەیە کە ئاخۆ کات بۆ پێشڕەویی ئەوان بەرەو ئامانج لەبار و گونجاوە یان نا. ئەمەی ئەز باسم کرد، لەوێیەوە سەرچاوە دەگرێ کە دەبینین دوو کەس بە شێوازی جیاواز پێشڕەوی دەکەن و چالاکن، کەچی هەردوو بە ئامانج دەگەن، دووی دیکەش بە هەمان شێوە ڕێگەی جیاواز دەگرنە بەر، کەچی یەک بە ئامانج دەگا و ئەوی تر ناگا. هەمدیس ئەمەش پێوەندیی بەوەوە هەیە کە ئاخۆ ڕەوتی ڕووداوەکان بە باری خێردا دەگۆڕێن یان بە باری شەڕدا؛ چونکە ئەگەر کەسێک لێزانانە و بە لەسەرخۆیی فەرمانڕەوایی دەکا و زەمان و ڕەوتی ڕووداوان بە مەیل و ئارەزووی ئەم دەڕۆنە پێشــەوە، ئەوە دەتوانێ بە خۆشی ڕابوێرێ، بەڵام ئەگەر زەمان و ڕەوتی ڕووداوەکان بگۆڕێ و ئەم خۆی لەگەڵیان نەگونجێنێ، ئەوە تێکشکانی حەتمییە.

---

١. بە تایبەت بەشی ٦.

کەس نییە ئەوەندە دوورەنوارِ و بەمەشوور بێ کە بزانێ بە تەواوی خۆ لەگەڵ ئەم گۆڕانانە بگونجێنێ؛ هەم بۆ ئەوەی کە ناکرێ لەو ڕێگە لا بدا کە سروشتی خۆی مەیلی لێ هەیە و بە هۆگرییەوە پێیدا دەڕوا؛ هەم چونکە چوونی بەردەوام و هەمیشەیی بە ڕێگەیەکدا کە خۆشگوزەرانی و تێر و تەسەلی بۆ وەبەر هێناوی، ئێستا کە کاتی بەردانی و گرتنە بەری ڕێگـەی نوێیە، دڵت ڕازی نابێ وازی لێ بێنی و ڕێگای تر بگریتە بەر. پیاوی بەپارێز و لەسەرخۆ، کە کاتی پێشڕەوی و هەڵمەتبردن دەگا، نازانێ چۆن خۆی لەگەڵ بگونجێنێ، بۆیە دەشـکێ و دەسـتاڕی زەمان دەیهاڕێ. بەڵام ئەگەر زانیبای لەگەڵ زەمان و ڕەوتی ڕووداوەکان خوو، سروشت و شێوازی خۆی بگۆڕێ ئەوسا بەخت نەئەگۆڕا.

٣ پاپا جوولیوی دووهەم هەموو کار و چالاکییەکانی خۆی هەڵمەتبەرانە بردە پێشەوە، هەمیشـە کاتی لەبار و گونجاوی بۆ جۆری پێشـڕەوییەکانی خۆی دەسـت دەخست، هەمیشـەش بەخت یاری بوو و بە ئاکامی چاک و دەڵخوازی دەگەیشت. بە سەرنجدان و ڕامان لە یەکەم پەلاماری ئەو بۆ سەر بلۆنیا، کاتێک هێشتا مێسێر جۆڤانی بێنتیڤوڵی لە ژیاندا بوو، ئەمە بە چاکی دەردەکەوێ. سەرەڕای ئەوەی ڤێنیزییەکان و پادشای ئیسپانیا لەگەڵی کۆک نەبوون، بەڵام سـەبارەت بە پلانی هێرشـەکانی بۆخۆی، سـەربەخۆیانە لەگەڵ فەڕانسـە پێکهاتبـوو و هەڵمەتبەرانە، بە هەموو هێز و توانایەوە، سـەرکردایەتیی ئەو لەشکەرکێشییانەی وەسـتۆ گرتبوو. ئەم بڕیارەی پاپا بووە هۆی ئەوەی کە ئیسپانی و ڤێنیزییەکان، دڕدۆنگ و بێ جووڵە ببنە چاودێر؛ ڤێنیزییەکان لە ترسدا و ئیسپانییەکان لە تامەزرۆیی داگیرکردنی هەموو پادشایی ناپۆلیدا. هەروەتر پاپا شای فەڕانسەشی کردە پشتیوانی خۆی، واتە هەر ئەو کەسە کە بۆ خستن و شکانی ڤێنیزییەکان بووە هاوپەیمانی، پاپاش چونکە نەیدەویسـت دڵی بڕەنجێنێ، بۆ بەشـداریکردن لەو شـەڕەدا، لەمپەری نەخستە سەر ڕێی هاتنی سپای فەڕانسە. ئاکام بووە ئەوەی کە جوولیو بەو بزاڤە هێرشبەرانە و کوتوپڕانە کارێکی بە سەرئەنجام گەیاند کە هیچ پاپایەکی تر بە گشت دوورەنواری و پارێزگارییەکی مرۆڤانەوە بە ئاکامی نەگەیاندبوو. چونکە ئەگەر لە ڕۆما چاوەڕێ مابایەوە

تا هەموو بەرنامە و پلانێکی بە وردی تاوتوێ دەکرد و هەموو ڕێکەوتنێکی مۆر دەکرد، چونکە هەموو پاپاکان وایان دەکرد، هەرگیز لە کارەکەیدا سەرکەوتوو نەدەبوو. ئەوسا شای فەڕانسە هەزاران بیانووی دەهێنایەوە و ئەوانی تریش سەدان ترس و لەرزیان وەبەر دەنا. من نامەوێ لێرەدا بپەرژێمە سەر کار و چالاکییەکانی تری، کە هەموو لە وێنەی ئەمە بوون و تێکڕاشیانی سەرکەوتووانە بە ئەنجام گەیاند و ئاکامی چاکیان بۆی هەبوو، هەڵبەت کورتیی ژیانی بەسەر کورسیی دەسەڵاتەوە، مەودای ئەوەی پێ نەدا هەست بە ناکامی و شکان بکا. چونکە ئەگەر لە کاتێکدا ژیابا کە پێویست بوو بە پارێز و لەسەرخۆیی پێشڕەوی بکا، حەتمەن شکانی خۆی بە چاوی خۆی دەدی؛ چونکە ئەو نەیدەتوانی واز لەو شێوازە بێنێ کە سروشت و مەیلی بۆ ئەویان دیاری دەکرد و خۆشی هۆگریی بۆیان هەبوو.

٤ لە کۆتاییدا دەڵێم: چونکە بەخت و سەردەم دەگۆڕێ، تا کاتێک مرۆڤ سەرسەختانە لە سەر ڕێگە و شێوازی خۆی بەردەوامە و خۆی لەگەڵ گۆڕانی کات و ڕەوتی ڕووداوەکان دەگونجێنێ شاد و بەختەوەرە. بەڵام ئەگەر لەگەڵیان ناکۆک بێ و نەتوانێ خۆی لەگەڵ ڕەوتی ڕووداوەکان بگونجێنێ، نە شادە نە بەخت یاریە. بە بڕوای من چاک وایە بەدەستوبرد و هەڵمەتبەر بی، تا بەپارێز و لەسەرخۆ؛ چونکە بەخت ژنە، کەوابوو ئەگەر گەرەکت بێ لە ژێر خۆتدا ڕایگری، پێویستە بیگەوزێنی و بیلۆکێنی؛ ئەوسا دەبینی چاکتر خۆی دەدا بە دەست گەوزێنەریەوە تا ئەوانەی کە بە خاوە خاو و ساردوسڕی دەڕۆنە پێشەوە؛ ئەگەر ژنان هەمیشە هۆگر و ئاواڵی لاوانن، ڕێک بۆ ئەوەیە کە ئەمان کەمتر ڕێزیان دەگرن و هەڵمەتبەرانەتر و بوێرانەتر دەیان ڕەتێنن و فەرمانیان پێ دەدەن.

## ٢٦. بانگـەواز بـۆ گرتنە ئەسـتۆی ڕزگاریی ئیتالیا لە چنـگ بێگانە و بەرگری لێکردنی

١ بە سەرنجدان و لێکدانەوەی هەموو ئەو شتانە کە تا ئێستا درانە بەر باس و ڕاڤە کران، بیرم لەوە دەکردەوە کە ئاخۆ لە ئیتالیای سەردەمی ئێمەدا، کات و بوار بۆ شالیارێک کە بیهەوێ ببێتە خاوەنی شانازی و شکۆ لەبارە؛ ئاخۆ مادەی ئامادە هەیە بۆ ئەوەی کە شالیارێ ژیر و زانا بە فۆرم پێدان و خاراندنی شانازی و شکۆ بۆ خۆی و خێر و خۆشگوزەرانی بۆ هەموو دانیشتووانی وڵاتی ئیتالیا دەستەبەر بکا؛ بە بڕوای من هەلی لەبارتر و گونجاوتر لەم دۆخە کە ئێستا ئیتالیای تێدایە هەرگیز هەڵناکەوێ. پێم وایە ڕێخۆشکەرەکان هەر تەواو زۆرن، دەرفەت ڕەخساوە و بوار لەبار و پشـتیوان و یارمەتیدەرەکان هەر ئێگجار فرەن. وەک پێشتر باسـم کرد، ئەگەر بۆ دەرکەفتنی هێژایی و ڕەوشتبەرزیی مووسا، پێویست بـوو گەلی ئیسرائیل کۆیلەی دەسـتی میسرییەکان بێ؛ ئەگەر بۆ دەرکەفتن و ناسـینی بلیمەتیی گیانی کورش، پێویست بوو پارسەکان لە لایەن مێدییەکان بچەوسێنەوە؛ ئەگەر بۆ دەرکەفتنی مەزنی و تاقانەیی تێسـێئۆ، پێویسـت بوو ئاتنییەکان پەرژ و بڵاو بن؛ دەی ئەوە ئێستا، ڕێک وەک ئەم نموونانە، بۆ دەرکەفتن و خۆنواندنی گیانێکی هێژا و بلیمەتی ئیتالیایی، لە ڕۆژگاری خۆماندا، پێویست بووە کە ئیتالیا هەموو ئامانەی بەسەرا هاتبێ: لە جووەکان کۆیلەتر، لە پارساکان چەوساوەتر، پەرژ و بڵاوتر لە ئاتنییەکان؛ بێ سەرکردە،

بێ سەر و سامان، بێ سەروبەرە، کاول، تێکشکاوە و چۆکی پێ دادراوە، تاڵان کراوە، لەت و پەت و داچاکاوە، لە ژێر چەکمەی هێزی بێگانەدا دەناڵێنێ: هیچ کاولکارییەک نەماوە بەسەر ئەم وڵاتەدا نەهاتبێ و هیچ نەهامەتی و چەرمەسەرییەک نەماوە نەیچێشتبێ.

٢ ئەگەرچی پێشتر هێندێک کەس بۆ ئەوەی کە خۆیان وەکوو نێردراوی خودا بۆ ڕزگاریی ئیتالیا بنوێنن تروسکێ لە هیوایان تێدا بەدی کراوە و بۆ ڕزگاری تێکۆشاون، بەڵام دواتر بینرا کە چۆن لە بەرزترین ئاستی ڕێگەی بە ئاکام گەیشتندا بەخت پشتی تێکردوون و نەگەیشتوونە ترۆپک و گلاون. ئێستا ئیتالیا چما لە ئاویلکەدا بێ و چاوەڕوانی کەسێک کە بێت برینەکانی تیمار بکا؛ کۆتایی بە تاڵانکردنی لۆمباردیا بێنێ، بەر بە تاڵانکردنی ڕێئامێ[1] و تۆسکانا بگرێ و، ئەو شەقارانە کە لە دێر زەمانەوە ناسۆریان لێ دەتکێ دەرمان بکا. بنوارن چۆن لە خوا دەپاڕێتەوە کەسێ بنێرێ بۆ ئەوەی کە لە چنگ دوژمنانی دەری بێنێ و لەم هەموو دستدرێژی، دڕەندەیی، دەلڕەقی و سووکایەتیی سپای بێگانە ڕزگاری بکا؛ بنوارن چۆن هەموو ئامادە و گیان لە سەر دەستن بۆ ئەوەی کە شوێن ئاڵای شەکاوە بکەون، هەڵبەت بە مەرجێک کەسێ هەڵکەوێ بەرزی بکاتەوە و شەکاوە ڕایگرێ. ئێستاش لێرە و لەم سەردەمەدا، ئیتالیا چاوی ئومێدی بڕیوەتە دەرگای نوورانیی ئێوە[2]. ئەو دەرگا کە خۆی خاوەن شکۆ، یاری بەخت و ژیری و زاناییە. بە تایبەت ئێستا کە یەکێک لە ئەندامانی بنەماڵەی بەڕێزتان وەکوو پاپا هەڵبژێراوە و دەسەڵاتی کلیسای پێ سپێراوە و ئێوەش خودا و کلیساتان لە پشتە، سەرکردایەتیی ڕزگاریی ئیتالیا هەر بە باڵای خۆتان بڕاوە و هەر لە ئێوە ئەوەشێتەوە. بە ڕامان و ڕاڤەکردنی چالاکی، کار و کردار و ژیانی ئەو کەسانە کە هەر ئێستا لە سەرەوە ئاماژەم پێکردن و دانانیان لە پێش چاوی

---

1. Reame

٢. ئێوە: ماکیاڤێلی ئەم بانگەوازەی ئاراستەی لورێنزۆ کوڕی پیێترو دێ مێدیچی، Lorenzo di Pietro dei Medici، (١٤٩٢ تا ١٥١٩)، کردووە، کە لە ئاگۆستی ١٥١٣دا سەرۆکایەتیی حکومەتی فیرێنزێی پێ سپێراوە؛ مامیشی، واتە جۆڤانی کوڕی لورێنزۆ دێ مێدیچی، Giovani di Lorenzo dei Medici، هەر لەو ساڵەدا بووە پاپا، پاپا لێۆنێ دەهەم. بۆیە ماکیاڤێلی هەموو بوارەکانی بە لەبار زانیوە بۆ ئەوەی کە سەرکردایەتیی یەکخستن و ڕزگاریی ئیتالیا وەستۆ بگرێ.

خۆتان[1]، ئەم ئەرکە فرە دژوار نییە. ڕاستە ئەو پیاوانە دەگمەن و سەرسووڕهێنەر بووگن، بەڵام لە بیرمان نەچێ ئەوانیش مرۆڤ بووگن و ئەم هەلەی ئێستا لە ئیتالیا ڕەخساوە گەلێک لەبارتر لەوەیە کە بۆ هەرکام لەوان ڕەخسابوو؛ چونکە ئەو کار و ئەرکەی ئەوان بە ئاکامیان گەیاندووە، نە هێندەی ئەمە ڕەوا و بەرهەق بوو، نە ئاسانتر، نە خودا پتر لە ئێوە پشتیوان و یاریدەری ئەوان بووە. هۆیەکان بۆ ڕزگاریی ئیتالیا ئێستا لە هەردەم مەزنتر و دروست و ڕەواترن: تەنیا ئەو شەڕانەش ڕەوا و دروستن کە ناچار و پێویستن. کاتێک بێجگە لە سپا،ترووسکەی هیوای لە هیچ لایەکەوە بەدی ناکرێ، ئەو سپایە پیرۆزە. ئێستا لە ئیتالیا هەل هەر زۆر زۆر لەبارە، لەو شوێنانەش کە هەل ئاوا لەبار بێ، گرفتی گەورە بەرۆکت ناگرێ؛ هەڵبەت بە مەرجێک پەیڕەویی ڕێگە و شێوازی ئەو کەسانە بکەن کە من وەک نموونە پێشنیارم کردن. هەمدیس لێرە موعجزە و دەرفەتی بێوێنە، تاقانە و زێڕین خۆ دەنوێنن، خودا بۆخۆی ڕێنوێنە: زەریا شەقی تێکەوتووە، گەواڵە هەور ڕێنوێنە، گابەرد و زنار بەر ئاو ئاوەڵا دەکەن و ئاو بەر دەبێتەوە، لێرە گەزۆ باریوە[2]؛ هەموو شتێک بە ئاقاری گەورەیی ئێوەدا دەڕوا. باقی کارەکان دەبێ ئێوە ئەنجامی بدەن: خودا بۆخۆی کارەکان بە تەواوی بە سەرئەنجام ناگەیەنێ، چونکە ناخوازێ ئیرادەی ئازاد و ئەو بەشە لە کارەکان کە ئێمە بە ئەنجامدانیان دەبینە خاوەن شانازی و شکۆ لێمانی بستێنێتەوە.

۳ ئەگەر کەس لەو ئیتالییانە کە پێشتر ناویان برا نەیانتوانی ئەوەی کە لە دەرگای بەرز و نوورانیی ئێوە چاوەڕێ دەکرێ بە سەرئەنجام بگەیەنن جێی سەرسووڕمان نییە. دەبێ بزانین کە ئەگەر ناسەقامگیری، شەڕ و ئاژاوەیەک کە بەردەوام باڵی بە سەر ئیتالیادا کێشاوە، سەرچاوەکەی ئەوەیە کە ڕەوشت و لێهاتوویی سەربازی لەم وڵاتەدا کوژاوەتەوە. دیارە هۆی ئەمەش ئەوە بووە کە دەوڵەت و دامەزراوەکانی کۆن چاک و لێوەشاوە نەبوون، کەسیش هەڵنەکەوتووە دامودەزگا و دەوڵەت بە داب و دەستووری

---

۱. واتە مووسا و کورش و تێسێئو. ـئـ.ئی.

۲. ئاماژەیە بەو پەرجوو و موعجزانەی لە تەوراتدا باسیان هاتووە. بڕوانە تەورات بەشی کۆچ.

نوێیــەوە دامەزرێنــێ. هیچ شــتێک هێندەی ئەوەی کە کەســێک داهێنــەری داب و دەســتووری نوێ بێ و دامەزراوە و سەقامگیریان بکا نابێتە هۆی شکۆ و شانازی بۆی؛ بە تایبەت ئەگەر لە هیچەوە دەســتی پێ کردبێ. ئەم شــتانە کاتێک لەسەر بناغەی پتەو دادەمەزرێن و مەزن و بەرزن: ســتایش، شانازی و شــکۆی بێوێنە بۆ دامەزرێنەر بەدی دێنــن. لە ئیتالیا مادە بۆ ئەوەی کە فۆرمی پێ بــدرێ کەم نییە. لێرە ئەندامان هەموو ئازا، بوێر و چاونەترس گیان لەسەر دەست ئامادەن، خۆزگە سەرکردەکانیش وا دەبوون. ئێوە ئاورێک لەو شــەڕ و دوێلانە بدەنەوە کە لە نێوان دەستەی بچووکی شەڕڤانانی ئیتالی و بیانیدا ڕوویان داوە، ئەوسـا دەزانن ئیتالییەکان لە خورتی، ورەبەرزی و داهێناندا چەندە لە ســەرووی ڕەقیبانیانەوە بووگن. بەڵام ســەیرە، کاتێک دەڕۆنە ڕیزی ســپای گەورەوە ئاوا بوێرانە و خورت دەرناکەون، دیارە ســەرچاوەی هەموو ئەمەش لاوازی و نەزۆکیی ســەرکردەکانی ئەوانە. ئەو ســەکردانەش کە لێزان و بەکارن کەس گوێیان پێ نادات و گشــت کەسێ وا دەنوێنێ کە بۆخۆی هەموو شــتێک دەزانێ. هەڵبەت تاکوو ئێستاش کەســێک هەڵنەکەوتووە کە هەم بە لێهاتوویی و هەم بە بەختیاری هێژایی خۆی بنوێنێ و کارێک بکا کە هەمووان شــوێنی کەون و گوێبیســتی ببن. هەر بۆیــە زۆر کات و لە زۆربەی شەڕەکانی بیست ساڵی ڕابردوودا هەرکات ئەندامانی سپا هەموو ئیتالی بووگن، لە مەیدانی شــەڕدا ئەزموونی ناخۆشیان لە خۆیان بە دەســتەوە داوە. بۆ سەلماندنی ئەم ڕاســتییە، هەر ئەوەندە بەسە ئاورێک لە شــەڕەکانی تارۆ و ئالێساندریا، کاپووا، جێنۆڤا، ڤایلا، بلۆنیان و مێستریێ بدرێتەوە.

٤ جا بۆیە ئەگەر دەرگای نوورانیی ئێوە دەیهەوێ ڕێچکەی ئەو پیاوە بلیمەتانە بگرێتە بــەر کە بوونە هۆی ڕزگاریــی خاک و گەلی خۆیان؛ وەکــوو بناخەی هەموو کارێکی مەزن دەخوازێ، پێویستە پێش لە هەموو شتێک بنەڕەتی پتەو دابنێن. بۆیە دەبێ سپای خۆماڵی ساز بکەی؛ چونکە سپا و سەربازی بەئەمەگ و ڕاستەقینەتر و چاکتر لە خۆماڵی بوونی نییە. ئەگەرچی هەرکام لە وان بۆخۆی خورت و بەبڕشت و لێهاتووە، بەڵام کاتێک

تێکڕا پێکەوە لەژێر فەرمانی شـالیاری خۆیاندا دەجەنگـن، کاتێک دەبینن کە بوونەتە جێگەی بڕوای ئەو و لە شانازی و شکۆدا بەشدارن، دەبن بە چاکترینەکان. کەوایە بەر لە هەموو شتێک پێویستە ئەم سپایە ساز بکرێ، بۆ ئەوەی کە بە گیانی ئیتالییەوە بەرپەرچی هەموو دەسـتدرێژی و پەلامارێکی هێزی بێگانە بدرێتەوە. ئەگەرچی دەگوترێ سپای پیادەی سـویس و ئیسپانیا سامناک و بەزەبرن، بەڵام هەرکامەیان کەموکوڕیی خۆیانیان هەیە، کە دەبێتە هۆی ئەوەی کە هێزی سێهەم نەتەنیا بتوانێ بەرەنگاریان بێتەوە، بەڵکوو ئەگەر بڕوای بە خۆی هەبێ دەتوانێ گەلێک لەوان چاکتر و سـەرکەوتووتر بێ. چونکە ئیسپانیاییەکان هێزی سوارە پشتیوانیان نییە و سویسییەکانیش، کاتێک لەگەڵ پیادەیەک ڕوویـەڕوو ببنەوە کە وەک خۆیان کۆڵنەدەر بێ و بوێرانە شـەڕ بکات، دەترسـن؛ بۆیە هەروەک ئەزموون نیشـانی داوە و لەمەو دوایش هەر دەبینرێ، ئیسپانییەکان لە هەمبەر سـوارەی فەڕەنسـی خۆیان بێ ڕانەگیرا، پیادەی سویسـی لە بەرابەر پیادەی ئیسـپانی بەرەنگاریی بێ نەکرا و شکا. ئەگەرچی سەبارەت بەم دوایین نموونەیە، ئەزموونێ تەواو بەدەسـتەوە نییە، بەڵام لە شەڕی ڕاڤێنا[1]، کە لە نێوان سپای ئیسپانیا و ئاڵماندا هاتە ئاراوە، نموونەی فرە باش بینرا. لەو کاتەدا کە پیادەی ئیسپانیا لەگەڵ ڕیزی بەرایی ئەڵمانییەکان تێک گیران - سـپای ئاڵمان لە دامەزران و هەڵوێسـتگرتن لە بەرەکانی شەڕدا، کتومت لاسایی سویسییەکان دەکەنەوە- زۆر گورج و گۆڵ، بە یارمەتیی هێزی خاوەن قەڵغان و لە ژێر داڵدەی نێزەدارەکاندا بەر بوونە گیانی ئاڵمانییەکان و زەبری کارییان لێ وەشاندن و ژمارەی زۆریان لێ کوشـتن، بێ ئەوەی ئەڵمانییـەکان دەرەتانی بەرپەرچدانەوەیانیان بێ. ئەگەر سوارەی ئاڵمانی نەهاتبایە هانایانەوە و پەلاماری پیادەی ئیسپانی نەدابا، ئەوە پیادەی ئاڵمانیان قڕ دەکرد. بۆیە دوای ناسینی کەموکوڕییەکانی ئەم دوو هێزە پیادە، دەبێ هێزی پیادەی نوێ ساز بکرێ کە هەم توانای بەرەنگاریی سوارەی هەبێ، هەمیش ترسی لە پیادەی ئازای وەک خۆی نەبێ. هەروەها پێویستە پێکهاتەی سپا فرەچەشن بێ و کاتی

---

1. Ravenna

دامەزران لە مەیدانی شـەڕدا، پێویستە پەیڕەوی ڕێگە و ڕەوشی جیاواز بکرێ. دیارە کە ئەم داهێنانە نوێیانە بەشـێکن لە داهێنانی دامـودەزگا نوێیەکان و دەبنە هۆی ناوبانگ و مەزنیی شالیاری نوێ.

۵ جا ئێسـتا کە پـاش ماوەیەکی دوورودرێژ کەسـێک هەڵکەوتووە بـۆ ئەوەی کە ڕزگاریی ئیتالیا بگرێتە ئەسـتۆ، بە هیچ جۆرێک نابـێ ڕێگە بدرێت ئەم بوارە لە کیس بچێ. پێویستە ئەمەش بڵێم کە من ناتوانم ئەو هەموو خۆشەویستی و ئەڤینە دەربڕم کە بەوپەڕی بڕواوە و بە چاوی پڕ لە ئەسرینەوە لەو دەڤەر و مەڵبەندانەوە پێشکەش بە ئێوە دەکرێـن کە بوونە قوربانیی دەسـتدرێژی و داگیرکاریی بێگانە و بە دەسـتیانەوە وەزاڵە هاتوون و تینووی تۆڵەسـەندنەوەن. کام دەرگا بە ڕووی ئێوەدا دادەخرێ؟ کام خەڵک نکۆڵی لە ملکەچبوون بۆ ئێوە دەکا؟ کام ئیتالیایی سـەری لـە ڕێتان دادانێ؟ بۆگەنیوی دەسـەڵاتی بێگانە دەدا ئازاری لووتی هەموو دانیشـتووانی ئەم نیشتمانە. بۆیە پێویستە دەرگای نوورانیـی ئێـوە بە هەمان گیان و ئـاوات و تامەزرۆییەوە، کە کردار و شـەڕی دروسـت و ڕەوا وە ئەسـتۆ دەگیردرێ، ئەم ئەرکە وە ئەسـتۆ بگرێ. بـەو هیوایە لە ژێر ڕێنوێنیی ئێوەدا نەجیبی و هەڤیازی بگەڕێتەوە بۆ ئەم نیشـتمانە و لە سایەی ئێوەوە ئەم گوتەی پێترارکا[1] بێتە دی کە وتوویە:

*ڕەوشتبەرزی دژی بێگانە*
*دەست دەداتە چەک زۆر بوێرانە*
*کورتخایەن دەبێ شەڕی ئەم دووانە*
*چونکە لە دڵ ڕۆڵەی ئیتالیدا*
*بەها کۆنەکان هێمان دانەمرکاوە.*

---

۱. پێترارکا، ناوی تەواوی فرانچێسـکۆ پێترارکا [Francesco Petrarca]یە (۱۳۰٤-۱۳۷٤ ز.). دوای دانتێ، گەورەترین و ناسراوترین شاعیری ئیتالیایە. یان دەکرێ بڵێین هاوشان و هاوپایەی دانتێیە.

وەرگێڕانی کتێبی شالیار-ی ماکیاڤێلی، دوای پێنج سەدە لە مەرگی نووسەرەکەی، بێجگە لە ئێستایی بوونی بیر و هزری ئەم نووسەرە، نابێ هیچ مەبەستێکی دیکەی بووبێ؛ بیر و هزرێک کە تاهەتایە زانستی سیاسی و دەوڵەتداریی تووشی گۆڕانی بنەڕەتی کردووە. دیارە وەکوو وتەی ئانتۆنیو گرامشی، ماکیاڤێلی زانستی سیاسی فێری ئەوانە ئەکات کە ئەم زانستە نازانن. گرامشی لە بەرسڤی ئەم پرسەدا کە ئەوانە کێن ئەم زانستە نازانن؟ دەبێژێ: توێژی شۆڕشگێڕی سەردەم، گەل و نەتەوەی ئیتاڵی. ئەو توێژەی لە فیرێنزێی سەردەمی ماکیاڤێلیدا پشتی سەرۆکی خۆی، واتە ساڤونارۆڵا-یان بەر دا، ئەو توێژەی کۆمارەکەی دەڕووخێنرێ، کەچی نە ئەتوانێ سەرۆکەکەی لە خنکاندن و سووتان ڕزگار بکا و نە دەشتوانێ بەرگری لە کۆمارەکەی بکا و بیپارێزێ.

9 786226 525244

وەشانخانەی مادیار